# یاقوبی چەرموو


| | |
|---|---|
| بابەت: | ڕۆمان |
| نووسینی: | بەکر ئاڵەیی |
| هەڵەچن: | خالید فاتیحی |
| تایپ: | ڕێگا ئەبوبەکر |
| لە بڵاوکراوەکانی: | ناوەندی فێربوون |
| نۆرەی چاپ: | یەکەم |
| تیراژ: | 500 دانە |
| قەبارە: | 14سم × 21 سم |
| نرخ: | 6.000 دینار |

بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،

ژمارەی سپاردنی (     )ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێ دراوە.

سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی ئەو هاوڕێ ئازیزانە دەکەم کە لەگەڵم ماندوو بوون.

مستەفا غەفوور. عومەر حاجی. هاوڕێ حازم.

# بەشی یەکەم

لە سپێدەیەکی ڕۆشندا، ژیان بەهەر شێوەیەک لێکیبدەیتەوە ئەستەم و دژوارە. تەنها ئاسمان لە شینی خۆیدا نقووم ببوو، ئەو بەدەم گۆرانی و لاوکی هەستانەوە دەدرەوشایەوە. ئەو ئەستێرانەی شەو نەڕۆیشتن و تاک و تەرا لە بڵیندایی ئاسمان مابوونەوە، چاویان لە زەحمەتییەکان و ناگزووری هەمووان بوو، بە سرووتی نزاو بانگەوازەکانیان، بە ڕیتمێکی نەرم و کۆڤانەوە، بە بێگەردی و میهرەبانییەوە، گەرووی ئاسمانیان تەڕتر دەکرد، نامەو نزاکان دەچوونە باڵاترین تەبەقەی ئاسمان، لە ڕۆخ کورسیە گەورەکە کەوتنە سەرچۆک، دەستیان بەچاوەکانیانەوە گرتبوو، پڕ بەو ئاسمانە دەپاڕانەوە و ، دەیانگوت: «خودایە تارمایی و ترسی ژیان ببەوە بۆخۆت.»

ئەستێرەو ڕوناهی مانگەشەویش، لە بیری ئەوەدابوون، دیقەتی ئەویندارییان دەخستە بەرکی دادگەری و دەبوو هەموویان لە نیگایەکی ئاراستەکراودا کۆک بن، دەست بە ئایدیاو ڕەنگێکەوە بگرن، دەبوو لە جەنگی دەستەبەرکردنی زیندەگیدا دەستەوەستان دانەنیشن. هەر بابا بوو ڕێگەیەکی بۆخۆی هەڵبژاردبوو، تێکۆشان و هەڵسوڕانی ڕێکبخات بۆ ئامانجێکی نەبڕاوە، لەو ڕێگەیەوە.

یاقوب لە ژێر کاریگەری ڕەوتێکی چەپدا هۆگری ڕێکخستن وکاری حیزبی ببوو. زۆر هۆگری پشتێندە جێماوەکەی بابی بوو، دایکی لە هەموو هەڵات هەڵات و ماڵ سووتان و دەربەدەریدا ئەو پشتێندەی پاراستبوو، بەدزی دایکیەوە، پشتێندەکەی بابی لە سەر کراس و پانتۆڵەکەی دەبەست و ورەیەکی وەردەگرت، بە بێ منەتی درووشمەکانی لە سەر دیوارو باڵاخانەکاندا دەنووسی و شێلگیرانە لە خۆپیشاندانەکاندا لە پێشەوە بوو. چەند جار هەڕەشەی گرتن و تۆقاندنیان لێدەکرد.

دایکی سەدجار بەرۆکی لەبەر دادڕیبون، تخوونی کارێک نەکەون کە زیان بە شیرازەی خێزانەکەیان بگەیەنێت.

دەیگوت: «ئێمە خێزانێکی دیندارو لە خواترسین، چ کارێکمان بەو کارانەوەیە کە لەگەڵ ئێمە نایەنەوە»

ئەیوب کوڕە گەورەکەیان، هۆگری قورئان خوێندن و مزگەوت و خوێندنەوەی کتێبەکانی نەورەسی و حەسەن بەنناو کتێبە دینییەکان بوو. دایکی لەگەڵ ئەویش ناکۆک بوو، پێیخۆش نەبوو هیچیان ئەوەندە بە توندی تێکەڵ ببن و خۆیان بەو کارانە سەغڵەت بکەن.

دەیگوت: «دەترسم ڕۆژێک بەرۆکی یەکتری بگرن و دۆ و دوشاوی تێکەڵ بکەن، ماڵ هەر لە من خراپ دەبێت، ئەوکات [illegible]ەس گوێی لێ نییە، ئێمە عەیامێکە لەو بەزم و ڕەزمە داین، [illegible]ا سەک و سەکبابیمان بۆ ماوەتەوە، ئەوەتا سەمەدی [illegible]م چەند ساڵە شوێن بزرەو تەنیا خوا دەزانێت چیلێهاتووە.

سۆراغی نییە، کێ منەتی پێیە؟! لە بیرتان نییە ماڵ و دیوەخانی سەمەدی چەرموو، چ ناوبانگێکی هەبوو، کەس لە قسەی دەر نەدەچوو، پیاوی سوڵح و سەڵاحەت بوو، دەیان جار بە ماڵی خۆی ئاگری کوژاندۆتەوە، هەر لێی گەڕێ، من هەردەبێ بۆ دەردی خۆم بگریم، دەی بزانم کەس دەڵێ کەرت بەچەندی!»

بەردەوام لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد: «نا، نا، هەرگیز کەس خەمی کەسی نییە، هەر کەسەو بۆ خۆی ئازابێت و دەستی لە هەریسەکەی گیربێ.

دەمێکە بەوە گەیشتووم، ئێمە قەت نابین بەهیچ، بۆیە بە کوڕیژگەکانم دەڵێم تخوونی سیاسەت و میاسەت مەکەون، هەمووی بۆ گیرفانیەتی، هەر تەماشای بابی خۆتان بکەن بە چ حاڵێک ڕۆیشتووە! بۆیە پێویستە عاقڵ بن, با منیش ڕۆژێک ئۆخەی ئاسوودەیی بڵێم و هەناسەیەکی خۆشی هەڵبمژم«

یاقوب هێندە خاتری دایکی لە کن بوو، دڵی نەدەهات بەرپەرچی قسەکانی بداتەوە، نەیدەهێشت نیگەران بێت، دەیگوت: «دایە گیان چی تۆ پێتباش بێت ئاوا دەکەم، تۆ دڵتەنگ مەبە، ئاخر تۆ هێندە بیر لە خراپییەکان مەکەوە، ژیان هەروایە بۆخۆی چاک نابێت، ئەوە هەوڵی هەمووانە کە دونیا گۆڕانی بەسەر دادێت و هەمووان سوودی لێدەبینن»

ئەیوب سەرەتا بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت دەستی پێکرد، ویستی حاڵیان بکات کە ئەو بەڕێگەی پەروەردگاردا دەڕوات خودا پشتیوانیەتی، گوتی: «دڵنیاتان

دەکەم نابم بەگرفت و کێشە بۆ ئێوە، دەبم بە هۆکاری خێرو چاکە.«

دایکی ڕاما، دیتی ئەوانە وا خەریکن تێکەڵ دەبن، دونیای لێوێکهات، قنیاتی نەبوو، دەیگوت: «شتێک لە مێشکمدا ماخۆلانیەتی، ئەوان چ باکیان بەوەیە ئاخۆ من دەمرم یا چ هەشیک وەسەری خۆم دەکەم، عەیامێکە لەسەر دەستی خۆم دانیشتووم و دەستم بۆ کەس پان نەکردۆتەوە، ویستوومە ڕووسووربم و سەری ئێوە نەوی نەکەم، بەڵام ئێوە دەتانەوێ بمخەنە گێژاوێکەوە نازانم بەرەو کوێم دەبات.

ئێوارەیەکی سارد، تفت هەڵدابا دەیبەست، یاقوبی چەرموو، تەنیا بەتوێی کراسێکەوە ئەو زستانەی بەڕێکرد، دایکی لە خەمی دابوو، بۆچی ئەو ئێوارەیە بەو ساردو سۆڵە خۆی گنخاندووە؟!

لەو بیرکردنەوەیەدابوو، بەژوورکەوت، هەموو گیانی تەڕ تەڕ ببوو، شوێنی وشکی ددان بوون، گوێی لێنەبوو کە ئەو سەرمایە چ کاریگەرییەکی هەیە، دەروونی گەرم بوو لە ناخەوە دەکوڵا. باشە سەر بەقووڕ، ئەوە سەرمات نییە؟ خاولییەکەی دایە دەستی و دەرگەکەی پێوەدایەوە. ئەیوب هیچ خۆی سەغڵەت نەکردو پرسیاریشی لێینەکرد، وەرە دانیشە نانەکەت بخۆ با سارد نەبێتەوە خۆت دەزانی دەرەوە چەند ساردە. دایکی زۆر هەستیارانە دەیڕوانییە، ناخی منداڵەکانی، دەیزانی چۆن دەڕواننە ڕووداوەکان، کەس وەک دایک لە نییەتی منداڵەکانی ناگات، دەیزانی ئەیوب وەک برا گەورەیەک هەڵسوکەوت دەکات. یاقوب دەستی درێژکرد

نانەکە لەت بکات، ئەیوب چاوێکی لێکردوو گوتی کاکە بیسمیللای بکە، بێ بیسمیللایی هەر شتێک دەستی بۆ ببەی حەرام دەبێت، ڕسقت سوار دەبێت، خوا نانێکی حەلالی داوە با نەیشارێتەوە!

یاقوب گوتی: «کاکە نیگەران مەبە ماندوو بووم، زۆر بەخیرایی دەهاتم، بمبوورە کە بیسمیللایم لە یاد کردبوو.»

ئەیوب دەستێکی لە پشتی داو گوتی: «کێشە نییە پەروەردگار بەزەیی زۆرە خوا ئاگای لێتان بێت.»

دایکیان چەندی پێخۆش بوو، کە تەباو ڕەبان، چەند شیرین و نەرم قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن، لەبەر خۆیەوە نزاکانی دەگوتن و فووی پێدادەکردن.

یاقوبی چەرموو نەیویست ئەوەی دەیخوێنێتەوە، ئەوەی لە کۆبوونەوە فێری بووە، بە ڕوویان داداتەوە، ژیرانە مامەڵەی دەکرد، خێزان و هێمنی ماڵەکەی بەلاوە گرنگبوو، خۆشەویستی نێوانیانی لا باشتربوو لەوەی بۆیان باسی دیالکتیک و پەرەسندنی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بکات، دەیگوت: «ئەوە هیچی لێ شین نابێتەوە، جگە لە دڵئێشان و لێکترازان!» زەردەخەنەیەکی کردوو گوتی: «کاکی خۆم تۆ لە جێگەی بابمی چۆن دەفەرمووی وادەکەم.»

یاقوب و چەند هاوڕێیەکی دیکە بۆ ماوەی دە ڕۆژ لە دەورەیەکدا کە ڕێکخستنی گروپەکایان ڕێکخستبوو، دەیتوانی وەلامی دروست و لۆژیکیانەی ئەیوب بداتەوە. ماتریالیزمی دیالکتیک و دەرسەکانی مارکسیزمی دەخوێند. دەیگوت: «ئاوا

چاکتر دەتوانم کاریگەری لەسەر دەوروبەرم دابنێم نەک هەڵەشەو هەندێک قسەی نامۆ کە کۆمەڵگەی ئێمە ڕەنگە نەتوانێ قبووڵی بێ، دایک هەمیشە بە تەبایی و گونجانی منداڵەکانی دڵخۆش دەبێ!»

خانەوادەی چەرموو، ساڵانێکی دوورودرێژە لەو ناوچەیە گیرساونەوە، لە سەردەمی قەڵەمڕەوی دەستەڵاتێکی تۆقێنەردا لە گەرمەسێرەوە کۆچیان کردووە لێرە ماڵ و حاڵیان پێکهێناوەتەوە، دوو برا لەو خێزانە کەوتبوونە ئەو ناوچەیە، بە شوانکارەیی و کاری ڕۆژانەی خۆیان ژیانی خۆیان بەڕێدەکرد. قەهاری چەرموو برا گەورەی سیامەندی چەرموو، شەوێکیان دەکەوێتە بۆسەی چەتەکان و چی پێی دەبێت لێیدەستێنن، ڕووت و قووتی دەکەنەوە، شل و کووتی دەکەن، ئازای بەندنی ڕەش و شین دەکەن، بە گوریس و پشتێنەکەی خۆی دەست و لاقی و چاوی دەبەستنەوە، لەو دۆڵ و شیوە جێیدەهێڵن، هەموو شتەکانی دەبەن و جلکەکانیشی دەسووتێنن، شەو لەسەرمان و لەژێر زوخمی بەفرو باران دا گیانی دەردەچێت.

ڕووداوەکە دەنگی دایەوە، ترس و دڵەڕاوکێی خستە دڵی خەڵکەکەو تا دەورانێکی زۆر ئەو شوێنەی قەهاری چەرمووی لێ مرد سامدار سامی لێدەکرد. خەڵک لە هەیبەتان و پەرۆشی بۆ پیاوە غەریبەکە تاسابوون و تووشی شۆک ببوون. بە دۆڵی چەرموو ناوی دەرکردوو، زۆر جار وەک هەڕەشە و ترساندن بەکاردەهات، یەک بەیەکی دەیگوت: «دادەدەنیشی دانیشە، دەنا دەتبەمە دۆڵی چەرموو.» ئیدی بەهەزاران چیرۆکیان لێ

دەهۆنییەوە. یاقوبی چەرموو، لە سەرووی خۆیەوە نامەیەکی دەستنووسی بۆ هاتبوو، زۆر دڵی بەونامەیە خۆش بوو.

سڵاو بەڕێز یاقوبی چەرموو، کارو چالاکییەکانت لەبەرچاو دەگرین، وێڕای دەستخۆشی و لەبەرچاوگرتنی ڕەوشی تایبەتی تۆ، ئێمە ئەو حەرەکەت و ماندووبوونەت گران هەڵدەسەنگێنن.

هاوڕێتان بۆرە.

١٩٩٣/٨/٣١

یاقوبی چەرموو شۆرەت و ناوەکەی خۆی بینی لە نامەکەیدا قوشقی بوو، دڵی کەوتە خوورپەو حەجمینی نەبوو، دەیگوت: (چەند خۆشە ناو و ناوبانگ کە لە کارێک باشدا دەنگ دەداتەوە) یەکەم جاری بوو بەو ناوە ناوی خۆی ببیستێت.

یاقووبی چەرموو زۆر جار ورد، گوێی بۆ دایکی شل دەکردوو دەیگۆ: دایە دەی مامم چۆن کوژراو بابم چۆن بێ سەروو شوێن بووە. دەیویست مێژوو و, سەرگوزەشتەی خێزانەکەی بزانێت. دایکی ئەوەی دەیزانی بۆی دەگێڕایەوە تا شەجەری باوکی بردەوە سەر حاجی سادقی وەهاب ئەمینی چەرموو. کە عەیامێکە لەو ناوچەیە گیرساونەوە، کەس و کار و عەشیرەت و بنەچەکەتان لەگەرمەسێرن، بەڵام دوای کوژرانی مامە قەهارت و بەتەنیا مانەوەی بابت, ئێمە دابڕاین و هێندە نەتوانراوە ئەو تێکەڵاویە دروست بکەینەوە، بەڵام بابت هیچ کات خێزان و منداڵەکانی مامە قەهارتی فەرامۆش نەکردوون،

برایەتی و خۆشەویستی بابت و مامت سنووری نەبوو، کە مامت بەو حاڵەڕۆیشت ژیان بۆ بابت مانایەکی نەما، بەڵام هەر ددانی بەخۆی داگرت و بەردەوامبوو لە ماڵ و ماڵداری.

دایکی دەیگوت: « ڕۆڵە وابکەن ناوو ناوبانگی چەرموو بپارێزن...»

شەوێکی ئەنگووستەچاو، سەردەمێکی تاریک و نا بەرامبەر بەرۆکی وڵاتی گرتبوو، دەستەڵاتی ئەو ناوچەیە کەسی نەدەکردە برای کەس.

حاجی سادقی وەهابی کە مەرجەعی دیاری ئەو ناوچەیەبوو، دەستەڵاتی ناوچەکە ئەوشەوەی لێکردن بەدۆزەخ، خەڵکی بەدەر لەوەی لەژێر دەستەڵاتی ناوچەکەدا بوون و بەیعەتیان بەو دەستەڵاتە دابوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ناوچەکە بە بە بەرپرسایەتیەوە دەیانڕوانییە بنەماڵەی سادقی وەهاب ئەمینی، شێت و هارییان لە ماڵی دەهاویشتن و وەک پیاو چاک و فریادڕەسێک سەیردەکران. دەستیان لە دەستەڵات ستاندبوو، تەکیەو ماڵ و میوانداری حاجی وەهاب لە گەرمێن و کوێستانەوە ڕوویان تێدەکرد، لەو ناوچەیە جوولەکە و ئێزیدی و موسڵمان, جێگەی هەموو دین و کەسایەتیەکانی تێدا دەبۆوە، ئەوە قبووڵ نەدەکرا، ڕاپێچی زیندان کران و ڕاونران. دوورخرانەوەو حاجی سادقی وەهاب شوێن بزرکرا. بەشێک لەو خێزانە ئاوارەی ڕۆژهەڵات بوون و بەشێکیان ئاوارەی ڕۆژ ئاوا بوون و بەشەکانی دیکەش ئاوارەی هەندەران بوون. لە ناو خەڵکدا، بە ڕیش سپی و پیاو ماقووڵ و خاوەن وەجاخ تەماشا دەکران، ناو و شۆرەتی چەرموویان بەسەردابڕا.

ئەو کاتە دەستەڵاتی ناوچەکە سڵی نەدەکردەوە لە سڕینەوەو نابوود کردنی کولتوورو نەریتی نەتەوە و مەزهەبەکان، ئەوەندەی خەڵک وابەستەی خانەوادەی حاجی سادقی بوون، هێندە گوێبیستی کاربەدەستانی دەوڵەت نەبوون. پیاوەکانی دەستەڵات دەیانویست هەرچۆنێک بێت ئەو نەریت و کولتوورە بسڕنەوە، کە میللەتێک دەورانێکە پەیڕەوی دەکەن.

حاجی سەید حسامەدینی چەرموو بابی قەهارو سیامەندی چەرموو، لە مزگەوت و کۆڕوکۆمەڵدا دەیگێڕایەوە کەچ کارەساتێک بەسەر خێزانەکەیاندا هاتووە، چیرۆک و بەسەرهاتەکانی چەرموو، هێندە زۆرن ملی هەر ڕێگەیەک بگری لە قەراخ ڕێگەکەدا خوێنی چەرمووی لێڕژاوە. هەر شاخ و دەشت و شیوێکی ئەو گەرمیانە بگری هەناسەساردی چەرموویەکانی لێ بە جێماوە. وەختێک باب و بابیری ئێمە دەربەدەر کران، ئەوانەی کە لە سێبەری ئەو بنەماڵەیە ئاسوودەبوون لە خۆشی و ناخۆشیەکان بەیەکەوەبوون، بەرۆکی خۆیان دادڕی، شەڕی دەستەو یەخەیان کرد، بە دەیان گەنج و لاو لەسەر جۆگەو کانی شیوودۆڵەکاندا گیانیان دەرچوو بوو، دەیان کەسیان دەکلکی ئەسپەکانیان خستن و بەڕاکێشان و شەللاق لێدانەوە گیانیان سپارد! شەڕی ماڵەماڵ لەگەڵ دروێش و مووریدەکانی تەریقەتی چەرموودا دەکرا ناوو ناوبانگی چەرموویان لە سەر زەوی سڕیەوە. کە حیسامەدینی چەرموو دەکەوتە گێڕانەوەی ئەو دەردەسەریانەی تووشی خێزانەکەیان هاتبوو، بەگشتی ئەو

خەڵکانەی لەوێبوون فرمێسک بەچاویاندا دەهاتە خوارو تف و نەفرەتیان لە دەستەڵات و پیاوەکانی ئەو سەردەمە دەکرد.

## بەشی دووەم

ئەیوب، سەری خستبووە سەر قورئانەکەو بە دەنگێکی نزم، ئاوێتەی وشەکان ببوو، لە خەڵوەتێکی ڕوحی دا وێردەکانی دەور دەکردەوە.

کەشێکی بێدەنگ و نەرمی خووڵقاندبوو، لەو بەیانییەدا چرپەو هەناسەی زیندەوەرێکیش نەدەهات. ڕۆژانە بەدوای کتێبە دینییەکانەوەبوو، زۆرجار لەسەر چۆنیەتی نوێژکردن و دەستنوێژ هەڵگرتن، دەکەوتە گفتوگۆی نەرم لەگەڵ ئەو گەنج و لاوانەی هاتووچۆی مزگەوتیان دەکرد. ئەو زیاتر ڕۆچووبوە ناو ئایەتەکان، هیچ کتێبێک کە لەسەر دین و شەریعەت و مەسەلە فیقهیەکان هەباو دەستی پێڕاگەیشتبا دەیخوێندنەوە. خەجەی دایکی لەوە دەترسا، ئەیوب تووشی کارەساتێکی ڕوحی بێت، زۆر جار دەیگوت: ڕۆڵە هێندە سەرت مەخەرە سەرکتێبان، دە تۆزێک لە گەڵمان دابنیشە و دوو قسەمان لەگەڵ بکە. دەیگوت: دایەگیان نامەوێت کات بەفیڕۆ بدەم، خولەکێک بۆمن زۆرە، خوا پشتیوان بێت، درێغی ناکەم لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، هەر بابەتێکیش لەسەر پیاوچاکان و سەحابە بەڕێزەکان هەبێت هەوڵدەدەم بیانخوێنمەوە، پێویستیمان بە زانست و زانیاری هەیە، پەروەردگار زۆر شتی پێبەخشیوین پێویستە وەک بەهایەکی مەزن بڕوانینە میهرەبانی خودا!

دایەگیان ڕۆژانە ڕوو بەڕووی شتگەلێکی زۆر دەبمەوە، زۆر شت دەرک پێدەکەم، پرسیاری زۆرم بۆ دێنە پێش، هاوڕێکانم هەمیشە بەدوای پرسیاری گوماناویدا دەگەڕێن. دەمەوێت پشتیان بەرنەدەم کە لە ئاستی وەڵامەکانیاندابم و وەڵامیان بدەمەوە. بۆ من واپێویست دەکات تەنیابم و شۆڕببمەوە بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی دەقەکانی قورئانی پیرۆز!

دایکی لەو وشانە حاڵی نەدەبوو، سەری بۆ دەلەقاند، خەریکبوو بەوە دەگەیشت، کە تازە کارلەکار ترازاوە، ئەیوب زۆر شارەزاتر لە مەلاکان دێتە ناو شەریعەت و دینەوە، ئاخر ئەو منداڵەی من، زۆر نەرم و لە سەرەخۆ هەڵسوکەوت دەکات، بە دەنگی بەرز قسەناکات، لەگەڵ یاقووب ڕێکن و گوێ لە یەکتر دەگرن، کوڕە شیرینەکانم خوای گەورە دەست بە باڵتانەوە بگرێت.

دایکی هەموو سبەینەیەک زوو هەڵدەستا چای وەسەردەناو سفرەی ڕادەخست و بانگی دەکردن: ڕۆڵە وەرن نانەکەتان بخۆن. ئەیوب بەدڵ حەزی دەکرد، سەر لەسەر قورئانەکە هەڵنەگرێت، بەڵام لەبەر ماندوو بوون و خۆشحاڵبوونی دایکی گوتی: وا هاتم توخوا زۆر خۆت ماندوو مەکە لەگەڵ ئێمە، تۆزێک پشوو بدەو ئاگات لە حاڵی خۆت بێت. یاقووب خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو، کە گوێی لە دایکی بوو، کتێبەکەی لەسەر ڕەفەکەداناو گوتی: واهاتم دایەگیان. هێشتا یاقووب هەر لە ژێر کولتوورو نەریتی خێزانی دەرنەچوو بوو، تاک و تەرا نوێژیشی دەکردن، بەڵام زۆرجار دەچووە گومانی قووڵ و بە دوای وەڵامەکانیاندا دەگەڕا، بەڵام هێشتا سەرەتابوو، ئەو

بەيانييە بە گەرم و گوورِی تێپەڕاندوو نان و چاييان خواردوو دەستخۆشيان بە دايكيان گوت...

کاتژمێر دەی سەر لە بەيانی، گەرمەی هاتووچۆی خەڵکی بوو بۆ سەر کارەکانيان. خەڵک لە ئۆردوگاکان بەدەست بێکاری و دەستەنگييەوە دەيان گوزەراند. ئەو کارو خۆخەريککردنەی خەڵک لە مەيدانی چەکفرۆشتن و هەندێک کاريديکەبوو، زەحمەت کارێک گير دەکەوت، بەڵام خەڵک لە ناچاريدا کونجی قەناعەتيان گرتبوو. ياقووبی چەرموو، جارجارە دوای تەواکردنی دەرسەکانی و دوای دەوامی قوتابخانە، لەگەڵ خاڵی کەچە تفەنگێکی سينی دەکڕی و لە مەيدانی چەکفرۆشان بەشتێک خێر دەيفرۆشت و ڕاينەدەگرت. خاڵی، مەلاعوسمانی حاجی ئەسکەندەر، هاوکارو پشتيوانی ياقووبی دەکرد، بە پارەی خۆی چەکی بۆ دەکڕی و دەستی دەگرت. دوای نيوەڕۆيان دەچوو بۆ قوتابخانە، دۆستێکی تفەنگێکی لادانابوو بۆی بفرۆشێ، لە مەيدان کڕيارێکی بۆ پەيدابوو، ڕێککەوتن و پارەکەی لە تەکی گيرفانی ناو هەر لەوێ خەبەری بۆ دۆستەکەی نارد کە تفەنگەکەی بۆ فرۆشتووە. دوای دوو ڕۆژ وەڵامی بۆ هاتەوە گوتبووی: پازدە دينار بۆ خۆت بگێڕەوە. بۆ ياقوب دەستکەوتێکی باشبو، ئەو پارەيە زۆر زۆر بوو، هەر زوو مزگێنی دايە دايکی تا ئاسوودە بێت. دايکی هەزارجار خۆی بە قوربانی کرد. ئەو دۆستەی دەمانچەيەکی تۆپليشی (سميس) بۆ ناردبوو، بۆی نووسيبوو بەو نرخە بيفرۆشە، کە فرۆشا، حيسابی تۆش دەکەم، بەڵام دەبێ زۆر ئاگاداری خۆت

بیت، یاری پێ نەکەی، یاری کردن بە چەک ناکرێت، بەتایبەتیش ئەو چەکە.

یاقوبی چەرموو کیفێکی چەرمی خەنەیی بۆ دەمانچەکە پەیداکردوو لە قەدی خۆی بەست، قەدوبالآیەکی شووشەیی و زراڤ، قژێکی لوول و چاوشین، جلکێکی خاکی و کەتافی سەر شانیشی جێگەی دوو قەڵەمی هەبوو، لەبەر دڵان بوو، خوشکی خۆی حەیرانی دەبوو، کە دەهاتە دەرەوە دایکی هەزار ئایەتلکورسی بەسەردا دەخوێند چاوی هەمیشە لەدووی بوو.

یاقوب لە خوێندن دوودڵ بوو، بەڵام هەمیشە دەیگوت: «دوارۆژ گەر خاوەنی بڕوانامە نەبیت هیچ حسابێکی بۆناکرێ!»

ئەو لە چەقی ململانێی ژیان و خوێندن و عیشقدابوو، دەیویست بپرژێتە سەر کاری ڕێکخراوەیش، هۆگری گرووپێکی چەپ بوو.

زۆر خۆی ماندوو دەکرد، بیرکردنەوەی ئەو بۆ هەموو بابەتەکان گەرم و گوڕبوو. لە ئەرکەکانی دوا نەدەکەوت، وەک کەسێکی کامڵ و بە ئەزموون هەڵسوکەوتی دەکرد.

ئەو ڕۆژە دەستفرۆشانی مەیدان، چاویان زۆر لە سەر یاقووب بوو، بە دەمانچەوە، کەیفەی دەکردو زۆریش کەیفی بە چەک و تەقەمەنی نەدەهات، بەڵام دەیگوت: «بەناچارییەوە دەبێ قبووڵم بێت مادام لە مەیدانی چەکفرۆشان چەک دەکڕم و دەفرۆشم، نابێ ئەوەشم پێ نەنگی بێت، نابێت خۆمی لە بەر بشارمەوە.»

دەیگوت: «دەزانم چەک چەند بەدبەختییە، چ جیاوازیەکی لەگەڵ دەرمانی بێهۆشکەر نییە، هەردووکیان بۆ لەناوبردنی مرۆڤن.»

بەڵام دایکم دەگێڕێتەوە، دەیگوت: «بابی ڕەحمەتیتان هەروایدەگوت، کە نان لە قوڕگی شێر دایە، ئەوەی دێتە پێش بەخواستی خۆمان نییە، بەڵام ئەوە چارەنووسی ئێمەیە، ئەوە ژیان و بەڕێکردنی حاڵمانە، دەبێ ئاقڵانە شانی بدەینە بەر»

یەکێک لە هاوڕێکانی یاقوبی بە دەمانچەوە بینی، گوتی: «هاوڕێ لێت جوانە، زۆر شیکی، وەختبوو نەتناسمەوە! بەڵام قەت تەمەننا ناکەم خوو بە چەکەوە بگری، خۆت دەزانی تێکۆشانی ئێمە بۆ بنەبڕکردنی چەک و دونیایەکی باشترە، تا خەڵکی بەشمەینەت و بێ دەرەتان لەسایەی ئەو تێکۆشانەدا پشوو بدات.

خەجێ چووە ناو یادەوەرییەکانیەوە کە لە ڕۆژێکی سارد ، دەنگی چۆلەکەو حیلەی ئەسپەشێی ماڵی مەلا عوسمانی خاڵی یاقووب، وەک سەدایەکی نەرم، بەسەر تەم و پرووشەی بەفردا دەخزا. ئەو ڕۆژە دایکی یاقووب لە تۆغیان دابوو، بە بانیژەی ماڵەکەیانەوە، کەوتە سەرنیگای کوڕە غەوارەیەکی ڕوح سپی، شیرین و مەشرەف خۆش، لەوەتەی ماڵباتی سەمەدی چەرموو هاتبوونە ئەو ناوچەیە، جگە لە دڵخاوێنی و کردەوەی باش، شتێدیکەیان لێ ڕەچاو نەدەکرا, لە هەرەوەزو کاری بەیەکەوەیی درێغیان نەدەکرد. لەسەر بانیژەکە کەوتە خوارەوە، کەس بەدەرەوە نەبوو، وەک کوڕە لاوێکی جوان و شێلگیر، خۆی پێنەوەستا، دڵی بە ئازار کەوت، ڕاکردنێک

ڕایکرد تا بتوانێ هاوکاری خەجەی جوان و جحێڵ بێ، نزیکبۆوە لێی گوتی:

« هیچ شوێنێکت زامدار نەبووە؟»

گوتی: «نا، نا، ئەو بانیژەیە پلیکانەیەکی شلبۆتەوە، تەنها کەمێک ئازار بەدەستم گەیشتووە«

«بێنە دەستت تەماشابکەم.»

بەنیگایەک فڕی بۆ ناو چاوی، دەستی گەیاندە دەستی، گەرمییەک وەک دڵی ئەوین هاتە ناو دەستەکانی، دەمێکی چاک سرووتی ئەو گۆرانیانەی هاتەوە یاد، کە سپێدەکانی تەنیایی و حەزینی دەڕژان، چ مەحشەرێکی ئاگرین و هاتنەدی خەونێکی شیرینبوو، ساتێکبوو لە خەنیبوونی دوودڵ.»

«هەستەوە هیچ نییە کەمێک ڕووشاوە.»

ساتێکبوو، ژیانێکی تازەی هێنا، ڕۆژ دوای ڕۆژ، قووڵبوونەوەی ئەوین، لە خەجەو سەمەد بەتینتر دەبوو. ئەوڕۆژە خەونێکی ڕەنگاڵەیی بوو، بەڵام سەمای بەفر و مەوسیمی خواستەکانی، خولْقاندوو دوو کۆتری خستە لای یەک و گمەو شالوورەکانی دڵیان بازیدایە سەر هەستیان و لە هۆگربوونەدا عیشق گۆرانیەکانی لە سەما هەڵدەکێشا.

## بەشی سێیەم

لە نیوەڕۆیەکی پایزیدا، وەرینی گەڵای تووی بەردەرگاکە، سرووتێکی حەزینی وێناکردبوو. هەنگەشەلەی منداڵەکانی کۆڵان و خۆشارکێنێی کچەکانی گەڕەک، ڕیتمی مۆسیقایەکی نەرمیان دروستکردبوو، لە ژەنینی سەمای ئاوازو ڕوناهی ئەو تیشکانەی لە خۆر جێمابوون، پەلک پەلک، لە ڕوومەتی یاقوبی چەرموودا دەدرەوشانەوە.

دایکی دەیگوت: (کەس بە چاوی من تەماشات نەکات، ئەو ڕۆژەی دەستم دانە سەمەد، ئەو یاقووبێکی عاشق بوو.) لە تۆغیانی ئەودا تۆپەڵێک غەمی ڕەنگاڵەیی داناو گوناهێکی لە خەتای ئەو زەمەنە ڕەنگکردبوو، وەک هەمیشە سەر گۆناکانی خەجەی ماڵی کرد.

(دەڵێی سەری سەمەدیان هەڵقەندووەو لەسەری یاقووبیان داناوە، کتوومت خۆیەتی، لە یەزدان دەپاڕێمەوە چارەنووست بەچارەنووسی بابت نەچێت!)

یاقووب ئەو نیوەڕۆیە، بەدەم نانخواردنەوە لە بەر خۆیەوە قسەی دەبزڕکاند، کەوتبووە ناو قووڵی باوەڕێک کە پێیوابوو، ئەو باوەڕە زۆر لە هەست و ڕوانینەکانی نزیکە، دەیگوت: (ئا، ئا، بەدووروو درێژی ئەو بەرەڵلایەی ئێستا لە چەند دێڕێکدا دایدەڕێژم و لە کۆبوونەوە قسەیان لەسەر دەکەم.)

» دەی ڕۆڵە هەست بە دڵەڕاوکێیەک دەکەم, لەبەر خۆتەوە مینگەمینگێک دەکەیت؟!»

» ڕاستە دایە بیر لە زۆر شت دەکەمەوە، دەی ئەوە نابن بە گرفت, گرنگ سەلامەتی تەبایی ماڵەوەمانە، دڵنیاتان دەکەمەوە کارێک ناکەم ئێوە نیگەران بن. ئەو ڕۆژەی تفەنگە سینییەکەم فرۆشت، دوو بەشی هۆی فرۆشتنی خاڵم بوو، بە شیعر بانگی مووشتەرییەکانی دەکرد.

خەڵک دەورەی دابووین, دوا جار تفەنگەکەم فرۆشت، خاڵم پیاوێکی سەنگین و خۆشەویستی خەڵکە، ئەو پارەیەشی نییە بەڵام زۆر خاترو خوایشی خاڵمیان دەویست، منیش بە هۆی ئەو متمانەو سەلیقەی مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی چەکم پەیدا کردووە. دایکم گوتی:

» ڕۆڵە خاڵت نەخشی بەرچاوی هەبوو لە بەیەک گەیشتنی من و بابت، هەمیشە بیرکردنەوەی جیابوو لەگەڵ خزم و کەسی ئێمە، خاڵت نەبرای هەبوو نەکەس، ئێمە بە منداڵی لێمان قەوما، دایک و بابمان بە نەخۆشی مردن، ماوەی مردنەکەیان هێندەی بەین نەبوو، ئیدی خوا بۆخۆی دەزانێت چۆن ژیاوین و چۆن خۆمان پێگەیاندووە.»

وابڕیار بوو ڕۆژی هەینی گەشتێکی هاوڕێیانە بکەین، بۆ دەشت و دەر. بەڵام لەسەر بڕیاری هاوڕێیان شوێنی دانیشتنەکەیان گۆڕی بۆ ماڵی ریحان.

یاقووبی چەرموو، لە گێژەنی ڕامانێکی قووڵ دابوو. دەبوو سەعات دە بەشدار بێت. شەش لاپەڕەی لە گرفت و کێشەو ئاریشەکانی ناوچەکە نووسی. یەکەم جاری نەبوو ڕاپۆرت و دەردەشەی کێشەکانی کۆمەڵگە بنووسێت، ئەزموونێکی

پەیداکردبوو. هاوڕێکانی لە بەرامبەر تواناو سەلیقەی یاقووبدا سەرسام بوون. هەر لە بیرکردنەوەی کاروکاسبی و خۆ ژیاندنیشدا بوو لەگەڵ کارو کاسپی و دەمی لە سیاسەتیش وەردەدا، ئیدی بۆ یاقووب گرانبوو. بەڵام چێژی لەو هەموو بزۆزی و چەلەنگیەی خۆی دەبینی. دەستخۆشی برادەرەکانی بست بەبست باڵای پێدەکرد، خەنی دەبوو وەختێک لە کۆبوونەوە دەگەڕایەوەو سەرکەوتنەکانی خۆی دەدی. بەرپرسی شانەی یاقووب، کوڕێکی ڕەش تاڵەی لە دڵاشیرین بوو، زۆر پشتیوان و دەستگیرۆی یاقووب بوو. دەیگوت: (دڵنیام سیاسییەکی کارامەو سەرکردەیەکی ئازای لێدەردەچێت.)

یاقووب بەو دەست لە پشتدان و ڕێنماییانە هێندەی دیکە باڵای دەکردوو خەو و خەیاڵی هەر لای هاوڕێکانی بوو.

ئەو ڕۆژە سەعات دوانزەو نیو لە کۆبوونەوە تەواو بوو. ریحان وەک هاوڕێیەکی نزیکی یاقووب، ماڵەکەی خۆی تەرخان کردبوو بۆ کۆڕوکۆبوونەوە، لەگەڵ ریحان کەین و بەینێکیان هەبوو، زۆر جار دوای کۆبوونەوە کەمێک خۆی دوا دەخست, تا بڕێک لای ریحان بمێنێتەوە. ریحان و دایکی و برایەکی بە یەکەوە دەژیان، یاقووب وەک کوڕی ماڵەکە ئازاد بوو، خۆیان ڕێگەیان بۆ ئەو پەیوەندیە خۆش کردبوو، چوونکە ئەوانە هاوڕێی یەکتری بوون و لە ڕێکخراوێکدا کاریان دەکرد, بەڵام نهێنی بوو لای هاوڕێیانی دیکەی ڕێکخراو. ئەو ڕۆژە تەنها ریحان لە ماڵ بوو، هێندە ئۆخژنی و خۆشی لێهات کە یاقووب تۆزێک لای دەمێنێتەوە، ئاگر لە نیگای یاقووب دەباری

و هێندە تینووی دوو لەحزەی ئەوینداری بوو، چەنگی لە هەوران دەدا گوتی:

«دەزانی چەند جوان ڕاپۆرتەکەت حازر کردبوو، ئیرەیت پێ دەبەم »

یاقووب گوتی: «ئاخر ڕەنگە هۆکار گەلێک هەبێت کە توانیومە ئەوە بکەم.» ریحان گوتی:«چ هۆکارێکە هێندە وردوو بە سەلیقەوە چوویتە ناو کێشەو گرفتەکانی کۆمەڵگە؟»

«مرۆڤ گەر خۆشەویستی بۆ کارێک نەبێت تێیدا سەرکەوت و نابێت.» ریحان چاوەڕوانی وشەیەکی دەکرد, ئەو لەو بارەیەوە نەیویست قسە بکات، بەڵکو گرێیدابوو بە تێکۆشان و هەڵسووڕان، ریحان دەیویست باس لە ئەوین و هۆگربوونی بکات، لێ یاقووب پێیوابوو نابێت کاری ڕێکخراوەیی و سیاسەت تێکەڵی ئەوین و ئەوینداری بکات. سەری دەخورا بۆ گفتووگۆی لەو شێوەیە, بەڵام بیرووباوەڕی هێندە بە پیرۆز دەزانی، پێی نەنگی بوو خاڵی لاوازی بداتە دەست. لە سەرو حەدی جێهێشتنی ریحاندا، دەستی ماڵئاوایی درێژ کردوو پێیگوت: «دڵی یاقووب دەڕۆم با دوا نەکەوم دوای نیوەڕۆ دەبێ لەمەیدانی چەکفرۆشان بم.»

چەند شیرین زبان بوو ئەو وشەیە، ریحان لە عیشقی یاقووبدا ئاگر لە هەناسەکانی هەڵدەستا، لە نیەتەکانیدا دونیایەکی باشترو ئاسوودەتری دەخوێندەوە، خەون و خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگی دەبینی، بۆ ریحان ئەو ساتە پڕخرۆشە، بوو بە کەرەسەی پەخشانێکی نازدار...

نوێژی شێوان، دوای جەماعەت و سوونەت، کۆمەڵێک لاو سەریان خستبووە سەر ئەیوبی چەرموو. ئەو وایدەزانی کە لە پێگەیەکی بەرزدایەو دەبێت یەک یەک وەڵامی پرسیاری ئەو گەنجانە بداتەوە. یەکێک لەو گەنجانە، چووە بەردەمی ئەیوب و پێیگوت: «دەتوانم پرسیارێکت عەرز بکەم؟»

ئەیوب زۆر نەرم و لە سەر خۆ چاوەکانی داخستن و گوتی: «براکەم خزمەتکارم، کە بتوانم لە ئاستی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەت دابم فەخر و ستایش بۆ ڕەبولعالەمینە.»

کوڕە گەنجەکە گوتی: «بە پێی ئەو کتێبانەی خوێندوومنەوە، پرسیارێک بۆم گەڵاڵە بووە، ئایا دۆستایەتی کردن لەگەڵ غەیرە موسڵمان، دروستە؟» ئەیوبی چەرموو لە سەرەخۆ گوتی: «بەناوی پەروەردگار، گەر وەک خۆم وەڵامت بدەمەوە، پێموایە مرۆڤ کەوتۆتە سەرخۆی، چەندە بتوانێت دۆستی خەڵک بێت باشترە، بەڵام خۆت کاریگەریت هەبێت لەسەر بەرامبەرەکەت بۆ کاری باش، ئەوجار ئەوە لای ڕەبولعالەمینە کێ ئەهلی خێرەو کێ ئەهلی شەڕ.»

کوڕە گەنجەکە ئەوەی پێشتر بیستبووی وردی کردبۆوە، بەو جۆرە نەبوو، گومانی خستە سەر قسەکانی ئەیوب و تێیڕاما، گوتی: «خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.»

زۆربەی ئەوانەی لە دەورو بەری ئەیوب بوون، دەیان پرسیارو قسەیان هەبوو، بەڵام ئەیوب خۆی گنخاندوو نەیویست بە هەڵە بچێتە ناو بابەتەکان. بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە، لە ڕێگە لەگەڵ خۆی دەدوا، ئەو ژیانە پڕ لە پرسیارە، ڕەنگە

دەرەقەتی ئەو پرسیارانە نەیەم، نزا دەکەم پەروەردگار هاوکارم بێت، تا لە ئاستی وەڵامی پرسیارەکاندابم. خودایە داوای هاوکاریت لێدەکەم. دایکی لەبەر دەرگا وەستابوو، لە چاوەڕوانی ئەیوب دابوو، ئەوەندەش نەبوو یاقووب گەیشتبۆوە، ئەو ئێوارانەی کە منداڵەکان لە ماڵ بوون شایی و لۆغان بوو بۆ دایکیان، دەیگوت: «ئەوە کەلەکەم کەوتنە عەرزێ، ئاخر بێ ئێوە کوا دەتوانم ئاسوودەبم و بحەسێمەوە.»

ئەیوب سڵاوی کردوو گوتی: «دایەگیان بۆچی ئەوەندە دەردەسەری بۆ خۆت دروست دەکەیت؟ ئێمە خودا هێناوینە ئەو دونیایە هەر خوداش دەمانپارێزێت«

دایکی گوتی: «ڕاستە ئەوەی خوا بیکات هەر ئەوە، بەڵام دڵی من زۆر شتێدیکە دەڵێت، تا هەردووکتان لە ژوورەوە نەبن حەجمینم لێهەڵدەگرێت و هەدا نادەم.»

کۆتایی پایز بوو، تووەکەی بەر دەرگا، تاک و تەرا گەڵای پێوە مابوو، چۆلەکەکان دارەوداریان دەکردوو سروەی هاتنی سەرماو ساڵێکی شوومیان هەست پێکردبوو، جریوەو باڵەفرێی چۆلەکەکان سەمفۆنیایەکی حەزین و نامۆی دروستکردبوو. خەجێی دایکیان گوتی: «دەبێت خەمی نەوتمان لەبەر بێت، زستانەکەی سارد دەبێت، ئەوەتا خەڵکی لێوەلەرزەیان گەیشتۆتێ، لەوە دەترسن ئەمساڵ نە نەوتیان دەست بکەوێت نەداری لێرەواریش پەیدا بێت.» یاقوب، گوێی شلکردبوو، دەیڕوانییە گفتوو لفتی دایکی و بە حەزێکی قووڵەوە چووبووە ناو خەمخۆرییەکانی. گوتی: «ئێوە هیچ

خەمتان نەبێت، بەشی چەند بەرمیل نەوت پارەم پەیدا کردووە، ناهێڵم پەکمان بکەوێت، ناهێڵم سۆبەکە بکوژێتەوە، چۆن دەهێڵم ئێوە سەرماتان بێت، ئەوە خەمی من بێت.»

ئەیوب بێدەنگ بوو، لە چاوانی وا دەخوێندرایەوە، کە هیچ شتێک بێ ئیرادەی خوا مەحاڵە، تەنها یەک قسەی کردوو هیچی دی، گوتی: «خوا لە سوولتان مەحموودی گەورەترە، خوا کڵاوی بۆ بەڕووش دروستکردووە.»

یاقووب تیلەچاوێکی دایە ئەیوب و کەنوویەکی شاراوەی بۆ دایکی کردوو گوتی: «ئەوەی کاکم دیڵێت ڕاستە، بەڵام ناکرێت هەروا دەستە وستان دابنیشین.» دایکیان، هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە، منداڵەکانی دمبەدەمە نەکەن لەیەک هەڵنەبەزنەوە. سیلەی چاوی دایە یاقووب و گوتی: «کوڕی خۆم ئەوەی لەسەر سەبرانە لەسەر خێرانە دڵنیام هەموو شتێک بەدڵی هەموومان دەبێت، گرنگ ئەوەیە ئێوە سەلامەت بن» ئەو دەمانەی کوڕەکان سەریان دەخستە سەرکتێبەکانیان، دایکیان لە بەر خۆیەوە نزای پارێزی بۆ منداڵەکانی دەخوێندو لەسەر بەرماڵەکەی زۆر جار خەو دەیبردەوە، زۆر جار لە تەقەی دەرگا خەبەری دەبۆوە. شەوانە هاوڕێکانی یاقووب سەردانی یەکتریان دەکردوو جەفەنگ و گۆرانی و کۆڕی شیعر خوێندنەوەیان جمەی دەهات. هەرشەوە و ماڵێکیان دەست نیشان دەکرد، زۆر خۆشیان لە ماڵی یاقووب دەهات، دایکی زۆر خۆشخووڵق ومیهرەبان بوو، ئەیوبیش هیچ کات نەدەبووە کێشە بۆ هاوڕێکانی یاقووب، یاقووبیش هەروا، سۆزێکی نەرم و

پڕهەست لەو ماڵەدا هەبوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان کەس گوێی لە دەنگی بڵندی هیچ یەکێک لە کوڕەکانی سەمەدی چەرموو نەبوو، بە کاکە بانگی یەکتریان دەکردوو، ئەو ماڵە لەمیهرەبانی دا نقووم ببوو.

## بەشی چوار

سپێدەی ئەمڕۆ کەمێک سارد بوو، خۆر لە دەمی هەوورەکاندا خەوتبوو، ئەو بەیانییە دەستی بارانێکی پایزی، لە سەر ڕوومەتی دەرو شیپانەکاندا جێمابوو، وێدەچوو، شەو ئاسمان پەیامی دابێتە دڵە شەیداکان و پێیگوتبن تەڕ تەڕتان دەکەم، دە ئامێزی باراندا بخەون، لە دەمی مژێکی نووستوودا ژوان ببەستن. لە فکری ئەوە دابوو جلکێکی گەرم بۆ یاقووب و ئەیوب ئامادە بکات، بە حەوسەلەیەکی نەرم و دایکانە گوتی:«ئەمڕۆ باران دەبارێت پێویست دەکات جلکێکی گەرم و بلووزێکیشی لەسەر لەبەر بکەن.»

بە جووتە سەریان هەڵبڕی و سەیرێکی داکیان کرد، خەمی دایک وەک هیچ خەمێکی دیکە نییە، کەسێک بە دیار خەمەکانی دایکییەوە نەیەتە سەر چۆک، گومان لە ڕەسەنایەتی دەکرێت. ئەیوب بەدەنگێکی نەرم و تۆنێکی سەرنج ڕاکێش گوتی:

«دایە ئێمە گەورە بووین و ئەوەی تۆش دەیڵێیت سەرسەرو سەرچاو.» وەختێک ئەیوب دەدوا, یاقوب بێدەنگ دەبوو، بە ڕێزەوە لە بەرامبەر دوان و ئاخاوتنی ئەیوب ڕادەوەستا، بە ئاماژەیەک حاڵی کردن، وەک گوێڕایەڵ و لە ژێر فەرمانەکانی ئێوەدام. یاقووب لە بیری ئەوە دابوو، لەسەر کراس و پانتۆڵە کوردییەکەی بلوزێکی شین لەبەر بکا، زۆر جار گوێی لە ریحان دەگرت، ریحان حەزی لە ڕەنگی شین بوو، دیقەتی

دەدایە قردێلەی سەری و جۆری پۆشینی جلکەکانی و ڕێکخستنی ژوورو سەرچەف و خواستەکانی هەمووی شین بوون، ماڵی ریحان لە ئاسمانێکی ساماڵ دەچوو، لە کانییەکی مەنگ و دەریایەکی شین دەچوو، تەسریحەکەی سەری، لە کۆژیلەی ئەو ساوایە دەچوو وەک نەریتێک دایکان لەسەر کۆچک و لاشانی منداڵەکانیان هەڵدەواسن. هێشتا ئەو دەمانچەی نەفرشتبوو، کە هاوڕێیەکی بۆی ناردبوو، لە ژێر بلوزە شینەکە لە قەدی خۆی بەست و چەترێکی بچکۆلەشی هەبوو هەڵیگرت بەرەو مەیدانی چەکفرۆشان ڕۆیشت. ئەو دواینیوەڕۆیان دەچێت بۆ قوتابخانە، سەر لە بەیانییەکە هەرچەند باران و کەمێک ساردیش بوو بەڵام سەرما و بارانی پایزان ئەو فشارە نەبوو، تا نەتوانێت نەچێتە مەیدانی چەکفرۆشان، بەحەزێکی زۆرەوە بەرەو بازاڕەکە چوو، مەیدانەکە جمەی دەهات، چ جۆرە چەکێکت پێویستبا دەستت دەکەوت، سەری ئارو مارووی لێبوو، دەتگوت ڕۆژی حەشرە.

ئەو ڕۆژە کەس مووشتەری دەمانچەکە نەبوو، یاقووب دەمانچەکەی دەهێناو دەبرد، کەس کڕیار نەبوو، خاڵی لێینزیکبۆوە و گوێی لە هات و هاواری یاقووب بوو، بانگەشەی بۆ دەمانچەکە دەکردوو وەک پیاوێکی بە ئەزموونی دەهاتە بەرچاو، لەدڵی خۆیدا گوتی خوایە لێتبەزیاد بێت بۆیە دەڵێن کاریلە هەر لە بن سەوێ دانابێ, ئێستا ئەو خەمەشم نەما، پێموابوو منداڵەکانی خوشکم خۆیان پێ ناژیت، پێموابوو دەست و پێ سپین، ئەوەتا نەڕە نەڕی یاقووب مەیدانەکەی جۆش داوە دەک لە خاڵت کەوێ، دەی هاوار بکە هاوار، با

ئاپۆرای کڕیارەکان ڕوو لێرە بکات، بەڵکو لە سایەی گوڵەگەنمێک گوڵە جۆیەکیش ئاو بخواتەوە.

***

کۆتایی پایزبوو، سەمەدی چەرموو خەریکی تیک داکوتانەوەی سەربانی خانوەکەیان بوو. بارانێکی بەخۆڕ دەباری، هەموو گیانی شەلاڵ کردبوو. چێژێکی خۆش لەو باران بارینەدا هەبوو بۆ سەمەدی چەرموو، هاوکات لەگەڵ خەڵکی ئاوایی لە خەمی ئەوەدابوون ئەمساڵ وشکەساڵی بێت. چەند ڕۆژ لەوەو پێش، خەڵکی ئاوایی بە گشتی نوێژە بارانەیان کرد، بەڵکۆ بەزەیی پەروەردگار بۆ بنیادەم، بۆ ژیانەوەی گژووگیاو تەڕکردنی ڕوحی زەوی ببارێت. مەترسی ئەوە هەبوو ئەمساڵیش وەک ساڵی بووری پەڵەی نەدا. سەمەدی چەرموو بەدەم گۆرانیەوە ڕاکەڕاکی بوو، درزو تیکەکانی سەربانی داپۆشین و خەمی زستانیشی خواردبوو، قەلاشکەری و دارێکی زۆری دا کردبوو، خەمی ئەوەی نەبوو زستانەکە سەختیش بێت. سەمەدی چەرموو هەموو ساڵێک پێش باران بارین خەمی داروبارو گەرمبوونەوەی دەخوارد. بێخەم نەبوو دروست یاقووب، هاوکات لەگەڵ ئەو یادەوەریە دایکی بۆی گێڕاوەتەوە، غەرقی تەڕبوون و باران بارین ببوو، ئەو لە مەیدانی چەکفرۆشەکان هێندە نەڕاندبووی کاریگەری لە سەر ژێکانی قوورگیشی دانابوو، ئەوەشی لە یادکردبوو چەترەکەی هەڵبدات، هێندە شێلگیرانە بە تەنگ پەیداکردنی بڕە نانێکی شەرەفمەندانەوە بوو، حەزی لەوەبوو دەست لەبەر کەس پان نەکاتەوە، دەیگوت: دەستی ماندوو لەسەر سکی تێر.

چێژی لە کارێکی خاوێن دەکرد، لێ بێدەستەڵات بوو کە تێکەڵی چەکفرۆشتن و مەیدانی چەکفرۆشان ببوو، جگە لەوکارە چ کارێکیدی داهاتی نەبوو، خوێندن و کاری ڕێکخراوەیی و کارکردن وەک کاری ڕۆژانەی ئەو ئازایانە لەبەریان ڕاچووبوو. نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ ماڵ، دایکی قووشقی بوو، سەری سووڕما، بینی یاقووب چ گیانی نەمابوو وەک مریشکی ئاوەڕوتکراوی لێهاتبوو. تێیڕاماو گوتی: «ڕۆڵە ئەی بۆچی چەترت هەڵنەدابوو؟»

یاقووب بە زەردەخەنەیەکی پڕ ئومێدەوە تیلەچاوێکی دایە دایکی و گوتی: «چ لە گۆڕێ نییە، گرنگ ئەوەیە بەدەستی بەتاڵ نەگەڕاومەوە.»

ئەمڕۆ یاقووب بێ دەستکەوت نەبوو، ئەو خەمەی کە دوێنێ لە بیرکردنەوەی دابوو کە چۆن نەوتی ئەم زستانە دابین بکەن بەزیادەوە دابین کرا. هەرچەند دڵنیاشی کردبوون، کە بە زیادەوە پارەی ئەمساڵی دابینکردووە بۆ نەوتی زستان. هەر لە بێلاکە بلوزەکەی داکەندوو پانتۆڵەکەشی بە عەلاقەی بێلا داکرد و خۆی گیر نەکرد، بەدەرپێ کوورتەکەو فانیلەکەیەوە خۆی خستە حەمامەکە، ئاوەکە شلەتێن بوو، خۆی پاککردەوە، دایکی عەلادینەکەی داگیرساندوو ژوورەکەی گەرم کرد، یەکەم ڕۆژ بوو ئاگر پێبکەن، بەڵام دایکی کە یاقووبی ئاوا بینی، چاوی چوونە پشتی سەری، زۆر پەرۆشی یاقووبی بوو نەخۆش بکەوێت، بۆیە ژوورەکەی گەرم داهێناو دڵی ئاسوودە بوو.

ڕەوشی ناوچەکە ناجوور بوو، هەر تایفەو خێڵێک **قەڵەمڕەوی** شارێکی پاوان دەکرد، عەشیرەت و بنەماڵە جێگەی دەستەڵات و یاسای گرتبۆوە.

ئەوەی بێ پشت و بێ کەس با، نەیدەتوانی وەک پێویست بە کارەکانی خۆیەوە سەرقاڵ بێت، لەو یەکەو ئیدارەو شوێنە دەستڕۆیشتووەکان هیچ جێگەو مەکانێکی نەبوو، وەڵات بە یاسای جەنگەڵ و عەقڵی خێڵ بەڕێوە دەچووە. دەنگی تەقەو هاتوو هاوار حەوت گەڕەکی دەبڕی، دایکی بە پرتاو بەژوورکەوت گوتی: «خوا پەنامان بدات، لە مەیدانی چەکفرۆشان تەقەیە، خۆتان پەنابدەن نەچنە دەرەوە، دەچم بزانم خاڵتان لە ماڵە.»

هەردووکیان دەرپەڕین و تووشی شۆک بوون، دەبێ کێ بەرکەوتبێت؟

یاقووب گوتی: «هەر من دەزانم ئەو خەڵکە چۆن و بەچ دەردە سەرییەک ژیان دەکەن، لەو وەڵاتە هیچ یاسایەک نییە، هیچ بەر پرسیاریەتێک نییە، ئاخر ئەو هەموو بێدەنگییە بۆچی؟»

ئەیوب وەک پیشەی هەمیشەیی لە سەرەخۆ گوتی: «کاکە گیان خودا غەزەبی لەو میللەتە گرتووە، ئەو خەڵکە خووی داوەتە بێ باوەڕی، ئەوەندەی بەدوای ڕێگەی شەیتان دەکەون هێندە خودایان لە بیر نییە، دڵنیابە قەهری خودا هیچ هێزو گەلێک خۆی بۆ ناگرێت، سەیرکە خودا چی لە قەومی لووت کرد، ببینە چۆن سەدامی شەیتانی ڕیسواکرد، ببینە چۆن تەخت و تاراجی شای ئێرانی وێرانکرد، ئەوەی لە خوای غافڵە

کافرە.» یاقووب بەو وتەیی ئەیوب دەماری گیرا، خەریکبوو بەڕوویدا بتەقێتەوە، زۆری لە خۆی کردوو تەنها یەک وشەی درکاند: «دایکی من چ تاوانێکی هەیە؟»

ڕامانی ئەیوب ئاماژەیەک بوو بۆ یاقووب، لەوە حاڵی بوو، یەکەم جاریەتی بەو شێوەیە جوابدەنگی هەبێت و نەزەری خۆی دەربېڕێت.

لە بەر خۆیەوە دەدوا، ژیان خەریکە لەدەست ئەولیاو پیاوچاکان دێتەدەر، دەچێتە دەستی بێ باوەڕان و خەڵکانی بێ دین، لە خۆوە نییە یاقووب بەو شێوەیە دێتەگۆ، دایکی ئێمە چ گوناهێکی هەیە! ئەوە پێچەوانەی فەرموودەو دەستەڵاتەکانی پەروەردگارە، ڕازی نەبوونە بە بەشی خوا، تێگەیشتنی یاقووب ڕەنگدانەوەی ئەو هێزگەلەیە ڕەخنە لە هەموو شتێک دەگرن. ئەیوب هەر لە گومان دابوو، کە یاقووبی برای لەگەڵ گرووپێکدایە، بەڵام دڵنیا نەبوو، هەر بەلای ئەیوبەوە ئاسایی بوو بەڵام حەزی نەدەکرد براکەی تێکەڵی سیاسەت و کاری حیزبی بێت، دەیان جار گوێی لە دایکی بووە، کە باوکیان بەچ دەردێک ڕۆیشتووەو گۆڕیشی دیارنییە، پێیوابوو نابێ تخوونی هیچ شتێک بکەوین کە جارێکی تر دایکمان نیگەران بکەین.

لە بیرکردنەوە ڕاچووبوون، چۆن ئەو دونیایە شەن و کەو بکەن، چۆن لەو گومان و دڵە راوکێیە دەر بچن، یاقووب جگە لە ڕۆمان و بابەتی ئەدەبی، سەرو کارێکیشی هەبوو لەگەڵ بابەتی فکری و سیاسی، ئەو کتێبانەی لە هاوڕێکانی وەردەگرت، تایبەتبوون بە هزری چەپ و تێکۆشان، لە نێو

کتێبەکاندا، گومان و هەستکردنێکی نامۆ بە ئایدیاو کولتوورو تێکشکاندنی نەریتی کۆنەخوازی دۆزیبۆوە، مکوڕ بوو لەسەر بەرجەستەکردن و دروستکردنی بڕوایەکی پتەو بۆ گەورە بوونی کارەکانی، هەڵوێستەی لەسەر ئەو گومان و ئەندێشانە دەکرد، بەڵام هیچکات نەیدەویست لەگەڵ ئەیوب ئەو بابەتانە باس بکات، دایکی لەماڵی خاڵی گەڕایەوە، دڵخۆشبوو برایەکەی سەلامەتە، بەڵام هەواڵی ئەوەی لابوو گەنجێک لە بازاڕ بەو تەقەیە کوژراوە، گوایە بەهۆی کێشەیەکی کۆنی کۆمەڵایەتی چەند ساڵ پێش ئێستا، ئەو گەنجە بووەتە قوربانی. یاقووب بێجگە لەوەی بەو هەواڵە زۆر نیگەرانبوو، مەترسی ئەوەشی بۆ دروست ببوو، هەرچی زووترە مەیدانی چەکفرۆشان جێبهێڵێ، بیر لە کارێکیدیکە بکاتەوە، کارێک لەگەڵ سەلیقەو ڕوانین و پێگەی ئەو بگونجێ، چەند سەری خۆی هێناوبرد، دەریچەیەک بدۆزێتەوە بۆ دەرچوون و دوورکەوتنەوە لەو بازاڕە، یاقووب گوتی: «بیرێک لەو بازاڕە بکەینەوە، بیرێک لە حاڵی خۆمان بکەینەوە، ئەو کارە لەگەڵ خواست و بۆچوونەکانی من نایەتەوە، دەبێ کارێک بکەین بۆ دەربازبوونم.»

ئەیوب لەبەرامبەر قسەکانی یاقووبدا شەرمەزاربوو! برا بچووکەکەم لە هەوڵی ژیان و کار و کاسپی و ژیانی ئێمەدابێ، منیش لە ماڵەوە دابنیشم و کارێکم لە دەست نەیە، خوا قەبووڵی ناکا، دەبێ دەستباری لەگەڵ بگرم، بەیەکەوە بیر لەکارێک بکەینەوە، کە شۆرەت و کەسایەتیمان بپارێزێ. ئەیوب گوتی: «کاکەگیان بەپشتیوانی خوا، هاوکارت دەبم،

حەزناکەم چیدیکە بچیتە ئەو بازاڕە، ئەو شوێنە هەم جێگەی مەترسیە و تێیدا گوناهباریش دەبین، ئاسۆیەک لەو جێگەیەدا نابینم.»

زەحمەتیەکانی یاقووبی لە بەرچاوبوو، بەڵام لە دەربڕین و هاندان و پێزانینیدا کەمتەرخەمبوو. گوتی: «دەبوو پێشتریش لەگەڵت بام، ماندوێتیت دەبینم، دەزانم چەند بە پەرۆشی بۆ دابینکردنی ژیانێکی شەرەف مەندانە، ددان بە کەمتەرخەمیەکانم دادەنێم، ڕۆژێک دەستخۆشیم پێنەگوتووی.»

یاقووب لەو قسانەی پێشتر لەگەڵ ئەیوب کردبوونی پەشیمانبوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: دەبێ هەستی بریندار نەبووبێ؟ دەبێ وایهەست نەکردبێ, چونکە کار دەکەم منەتی بەسەر دابکەم؟ نا مەرج نییە وابێ، ئەو باش من دەناسێ قەت بیرکردنەوەی وای نییە بەرامبەر بەمن.

یاقووب بە دڵێکی گەش و ئومێدەوە گوتی: «زۆر سپاس کاکە، هەردووکمان هەوڵدەدەین، کارێکی شیاو خاوێن پەیدا بکەین، درەنگە دەبێ بچم بۆ مەکتەب، شەو دادەنیشین و قسەی لەسەر دەکەین.»

## بەشی پێنجەم

کاتی وەرزی حاسڵات بوو، سەمەدی چەرموو، لە نیوەڕۆیەکی هاوینیدا، وەختی حاسڵات و چنینەوەی بەربوومی جوتیاران بوو، هێزێکی چەکداری دەمامکدراو، تۆقێنەر و بێویژدان بەسەر کەپرەکەی سەمەدیان داداو گوتیان: «بە بڕیاری شۆڕش و بە مۆری سەرکردایەتی ئێوە داوا کراون.»

بە بەرچاوی ژنەکەی و منداڵەکەی چاویان بەستن و هەردووک قۆڵی سەمەدیان لە پشتەوە گرێدا. خەجەی ژنی سەمەد تووشی شۆک بوو، منداڵیشی لەسکی دابوو، لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، قەت شتیوای نەبینیبوو، پڕ بەو دەشت و دەرە هاواری کرد، کەس فریایان نەکەوت، بوو بە گریان و لە خۆدان و شین و شەپۆڕ، ئیدی ئەو ناوە وەک گۆڕەستان بوو، وەک سەراب و بیابانێکی دیمەکار، وەک گۆڕەپانی جەنگێکی دۆڕاو دەچوو، گریان فوغانی ئەیوب و خەجێی دایکی چەشنی کەڕەنای شەڕێکی خوێناوی، وێنەی کارەساتێکی سرووشتی و بێ پەنا دەچوو. دەنگی گریانی ئەیوب وەک سکاڵایەک و هاناچوونێک، بەرەو قاپی خودا ڕۆیشت و چاوەڕوانی ئەو دڵانەی خەریک بوون لەسەرابدا بخنکێن، بۆ خودابوو، لە ئایەتێکدا جێی بکاتەوە، پەیامبەرێک ڕاسپێرێ تا زەوی لە بێدادی پاک بکاتەوە.

هەموو تاوانی سەمەد، لە یەکێتییەکی هەرەوەزی جوتیاری دابوو، وەک مرۆڤێکی ژیرو بە باوەڕ دەیویست داکۆکی کاری ماف و ئەرکەکانی خۆی بەجێبگەیەنێ. بەڵام ئەو دەزگاو گرووپانەی بە ناوی شۆڕش و کوردایەتی بوونیان هەبوو، ئەوان لەوە حاڵی نەبوون کە دەبێ هێزگەلێک هەبێ بۆ داکۆکی لە جوتیاران و زەحمەتکێشان. ئەوان بە دەسیسەی دەرەبەگ و بیری دواکەوتووی شۆڤینی هەڵیاندەکوتایە سەر کاسبکاران و باج و خەراج و سەرانەیان وەردەگرت، لەگەڵ ئەقڵیەت و تێگەیشتنی جوتیاران و بیری پێشکەوتووخوازی ناکۆک بوون. لەو ڕۆژەوە سەمەدو کۆمەڵێک جوتیاری دیکە بێ سەرو شوێن و بێ گۆڕن.

یاقووب پاش باب بوو، هێشتا نازانێ بۆنی باوک چییە، نازانێت دەستەکانی باوکی چۆنن و قەڵش و وێنەی چرچ و لۆچی ناوچەوانی باوک چۆنە. تامی باوکی نەکردوو دووربوو لە سۆزو پشتیوانییەکانی باوکی. دایکیان شێر ئاسا لەبەر ئاستەنگەکانی ژیان ڕاچوو بوو.

یاقووب ئەو چیرۆکانەی هەزار جار لە زاری دایکییەوە گوێ لێبووە، وەک ئەڵقە لە گوێی کردوون و شانازی بە مێژووی باوکیەوە دەکات، دەورو پشتیشی بە میراتگرو خوێن ئەستێنی بابی دەزانن، بۆیە هەمیشە هەوڵدەدەن لە پشتی یاقووب بن و چ هاوکارییەکی پێویستە بۆی ئەنجام بدەن.

تا دەهات هۆگربوونی بۆ خەباتی چینایەتی تۆختر دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێندە بە پەرۆشەوە بوو بۆ نیشتیمانەکەی، بۆ سەربەخۆیی کوردستان.

زۆرجار دەبوو بە جێگەی ڕەخنە لە دیدی هاوڕێکانیەوە، دەی ئاخر زۆر جار لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەردەشەی نەتەوەو ناسیۆنالیزم و بیری شۆڤینی و نەتەوە پەرستی کراوە، ئەو بەو دیدەوە نەیدەڕوانییە نەتەوەکەی خۆی، بۆ مەگەر پێکهاتەی خەڵکی کوردستان پێکنەهاتووە لە کۆمەڵێک نەتەوەو تیرەو تایفە؟ دەی مرۆڤی کورد لە ژێر باری چەوساندنەوەدایە، لە ڕەوشێکی نالەبارو پڕ مەترسیدایە، گەر وەک مرۆڤی کورد باس لە مافە چینایەتی و نەتەوەیم بکەم، کارێکی نادروست نییە. زۆر کەڕەت ڕووبەڕووی ئەوە دەبۆوە، پێیان دەگوت: نەتەوە پەرستی شەرمەزاریە بۆ بەشەریەت، درووست ئەویش هاوڕابوو بەڵام یاقووب وەک مەزڵوومیەتی گەلەکەی پێیوابوو ئەو ئەرکێکی کۆمۆنیستانە ئەنجام دەدا، دەیگوت: هیچ کات شوورەیی نییە من داکۆکی کارێکی دڵسۆزبم بۆ نەتەوەکەم، مەرج ئەوەیە شۆڤینیانە بیر نەکەمەوە، خاوەنی بیرو باوەڕێکی مرۆیی بم.

یاقووب وەک بەرپرسیاریەتی بەوە نیگەران بوو ئەوە حاڵی گەلێکی بەشمەینەتە، شەڕو تۆڵەی خێڵ و عەشیرەت ناهێڵێت ئەو گەلە بە ئامانجەکانی خۆی بگات، دوای چەندان ساڵ کێشەی خێڵ و عەشیرەت گەنجێک دەبێ باجەکەی بدا، ئەو بێسەرەو بەریە چۆن دەتوانێت میللەتێک بهێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاست، ڕێگای هاتنەدەستی ماف و ئەرکەکان؟ قەیران و ئاڵۆزییەکان ژیانیان تەنگ کردووە، وڵاتێکی لە قەفەز کردووە، لەجیات ئەوەی خوێندن و زانیاری، ئێمەی فڕێداوەتە مەیدانی چەکفرۆشان، مردنی خۆم پێخۆشترە نەک مامەڵە کردن بە

چەک، ئاخر چەک جگە بۆ کوشتنی خەڵک هیچ ئامانجێکی پیرۆزی نییە، ڕاستە چەک لە سەردەمی بەرەنگاری و شۆڕشدا دەورێکی کاریگەری هەبوو، چەک دەمکووتی دووژمنانی کردووە، بەڵام بۆ من ئەو بەهایەی نییە، بەڵکوو وەک نەفرەتییەک سەیری چەک دەکەم. گەلی ئێمە پێویستی بە شۆڕشی ڕۆشنبیرییە. ئەو ڕۆژەی چەک بوو بە ئامرازی خۆ پارستن و داکۆکیکردن لە نەتەوە، زلهێزەکان و سەردەستەکان بچووکەکانیان خوارد، حەز دەکەم وەک چەپێکی شێلگیر خۆم پەروەردە بکەم، بەزمانی زانست و زانیاری خزمەتی نەتەوەو کۆمەڵگەکەم و پێگە چینایەتییەکەم بکەم. ڕاست و دروستیش وایە کرێکاران نیشتیمانیان نییە، کرێکاران لە مەیدانی کاردا، دەیانەوێت دونیایەکی باشتر دەستەبەر بکەن. وەک تاکێکی کۆمەڵگە دەمەوێت بەسەر ئازارو مەینەتییەکانی نەتەوەکمدا باز نەدەم، کاری من وەک کوردێک خۆ چەکدارکردنە بە دیدی تێکۆشان، لەو ڕێگەیەوە دەتوانم دارێک لە سەر بەردێک دابنێم و خزمەتێکی چکۆلە بەگەلە بەشمەینەتەکەم بکەم. یاقووب بەو تەنزو دیدەوە بەشداری کۆبوونەوەکان دەبوو، یاقووب ڕاستە بە جۆش و خرۆش بوو بۆ وەرگرتنی زانیاری و چەپێکی شێلگیرو خوورت بوو، بەڵام هاوڕێکانی دەیانگوت: یاقووب چەپێکی کوردستانییە، واتا ئەو تەرح و نەزەرانەی جێگەی گومان بوون.

یاقووب دەیگوت: مەیدانی چەکفرۆشان جێدەهێڵم و بەدوای کارێکیدی دادەگەڕێم، سەری دونیا بە پووش نەگیراوە، کارێک

هەر پەیدا دەکەم. دەیگوت: زۆر بڵاوم، پەرشم، هاڵوزم، دەبی خۆ کۆبکەمەوە.

چی دەکەی وەختێک ئاسمان کونێکی تێدا نەبێ هەموو دەرگاکان دادەخرێن، کەس ئاوڕ لە کەس ناداتەوە، وەختێک ژیان هێندە تەنگ دەبێ ناتوانی هەناسە بدەی، ئەو وڵاتەی ئێمە وەک دەگێڕنەوە هیچ کات خۆشی و ئاسوودەیی بەخۆیەوە نەبینیوە، ڕۆژێک کۆمەڵگەی عێراقی نەکەوتۆتە خۆشگوزەرانی ئاسوودەیی، دایکم دەگێڕێتەوە چەندجار ماڵمان دروستکردووەو لێیان ڕوخاندووینەوە، لەوەتی هەین هەر لە ئەشکەوت و کونە تەیارەو ڕاکە ڕاک دابووین، ئاخر ژیان بۆچی دەبێ هێندە گران و بەزەحمەت بێت؟

مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێران و لە ناوچوون دەڕوات، دەبوو ژیان بۆ هەموومان وەک یەک بێ، ئاخر ئەوە هەر ئادەمییەکانن ژینگەو سروشت و ژیانیان بەیەکەوە وێران کردووە، باشە پەیامێکی ئیلاهی هەیە ئاوا بێ بەرپرسیاریەتی وێناکردبێت؟ هیچ خودایەک هەیە دروستکراوەکانی تووشی نیگەرانی و دڵە ڕاوکێ بکا؟ شەوێکیان، لە گەڵ ئەیوب و هاوڕێیەکی بە نەرمی لەسەر ژیان و بوون و نەبوون قسەی زۆرمان کرد، ناکۆکییەک لە قسەکانمان دا نەبوو، هەموومان هەروا دەڵێین، هەر چەندە بیرکردنەوەمان بۆ دونیا زۆر جیاوازە، دەی کەواتە گرفتێک یان کێشەیەک لە کردارو کردەوەکانمان دا هەیە. ئەوەتا دایکێک پرچی سپی هۆنیوەتەوە، ژیانی خۆی لە سەر ئێمە داناوە، چی زەحمەتە کێشاویەتی و تا ئێرەش وەک قەڵایەک بە پشتمانەوەیە، ماندوو

نابێ و هەدا نادا، دەیەوێ نەهێڵێت بمرین و دەستی ڕاخستووە تا ئێمە بەسەری دابڕۆین، هەناسەی لەگەڵ هەناسەمانە، لە پێناوی ئێمەدا ڕوحی دادەنێ. کەچی ئەوەتا نەبوونی کار، نەبوونی ئاسایش و مەترسییەکانی ژیان، بەرۆکی گرتووین و دەبێ بجەنگین و چۆک دا نەدەین، ئاخر خۆ شەر لەگەڵ موستەحیل ناکرێ، کورد دەڵێ: (وەختێک زۆری هات قەواڵە بەتاڵە.) ناچارم چ ڕێگەیەک چەندە مەترسیداریش بێ تاقی بکەمەوە بۆ دەستکەوتنی ژیان، بۆ نە مردن و ئاسوودەیی. دایکم دەیگوت: (قەت نانی سەرشۆڕیم نەخواردووە، کە بابیشتان نەماوە نەمهێشتووە بێ بابیتان پێوە دیار بێ، نەمهێشتووە کەس بە چاوی سووک سەیرتان بکا، دەبێ ئاگاتان لە کەسایەتیی و ناو و ناوبانگی بنەماڵە بێ، هەزار جار لە دایەو بکەوێ نانی سەرشۆڕی و حەرامم بۆ مەهێننەوە، دەژین هەرچۆنێک بێ ناهێڵم بکەون.)

گوتم: «دایە تا ئێرە تۆ بە بەر ژیان و بەخێوکردنی ئێمەدا ڕاچووی و دەردەسەریت زۆر بینیوە، بەڵام تا هەبم و لاقم عەرزێ بگرێ لێناگەڕێم تۆ خەم بخۆی، لێناگەڕێم تۆ چیدی هیلاک بی ئەوجار نۆرەی ئێمەیە شەڕی ژیان و ئاسوودەیی بکەین»

دایک دڵی هەر لای منداڵەکانییەتی، لە خەمیان دابوو، پێیوابوو کەمتەرخەمە، گەر ڕێنمایی و ڕێگایان نیشان نەدا، دڵی دایک ئەوە ناڵێ کە منداڵەکان لە خەمی خۆیاندابن، دایک پێیوایە دەبێ بۆ قوتابخانەش لە تەنیشتی منداڵەکانی دابنیشێ، دەبێ نەهێڵێ تینووبن، لەگەڵ هەناسەی منداڵەکەیەتی، ڕویی لە یاقووب

کرد گوتی: «ئەمڕۆ دەبی جلکێکی کوردی بەدروون بدەی، تەنها یەک دەستە جلکێکت هەیە، هەر لە کۆتایی پایز ڕا دیارە کە زستانەکە تووش دەبێ. یەک دەستە جلکیش کەمە.«

یاقوب تیلەی چاوێکی دایە دایکی و پێیگوت: «هەروادەکەم دەچم دەستە جلکێکی جوان بەدروون دەدەم، لە بیرتە دایە تازە خەتی سمێڵم دابوو، زۆر شایم بەخۆ بوو، برادەرێکی بەرگدرووم هەبوو لە ئۆردوگا، چەند شیرین و دڵگیر بوو، بۆ هیچ کات لە یادم ناچێتەوە، خەبەرم هەیە چۆتەوە نەغەدە، گەر بۆم بکرێت دوای تەوابوونی قوتابخانە هەرچۆنێک بێت سەرێکی دەدەم.

هابیرتە چەند قاتێکی جوانی بۆ درووبووم، ئەوساڵ هەردەچم. ئەو کاتیش پێیانگوتم جلکی کوردیت لێجوانە، ئێستا بیرم دێتەوە.»

بەقسەم کردوو ئەو ڕۆژە یەکسەر چووم, جلکەکەم بەدروون بدەم. داوام لە دایکم کرد هەندێک پارەم بداتێ.

ڕۆیشتم بەرەو بازاڕ، بەرگدروویەکی برادەرم خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، دوکانەکەی بە دووکانەکەی منەوە بوو، زۆرم خۆشدەویست و دۆستایەتیمان بە هێزبوو. سڵاوم کردوو وەک پێشەی هەمیشەیی لەسەر مەکینەی خەیاتییەکەی هەستا, باوەشی پێداکردم. هەستی ئەو هاوڕێیەم هێندە جوان بوو، کاریگەری لەسەر منیش دانابوو، وەک کوردانی ڕۆژهەڵات قسەم دەکردوو زۆر هۆگری ئاخاوتن و هەڵسوکەوتیان بووم، هەر لەوانیش ئەدەبیاتی ڕاهی کارگەر و

کۆمەڵەو دیموکراتم وەردەگرت و دەمخوێندەوە. گوتم وەستا عەلی هاتووم جلکێکی کوردی بەدروون بدەم و پشتێنێکی ڕەشی جورجیاتیشم بۆ هەڵبدروو. گوتی: بەچاوان ئەو پارچەیە دراوە بە پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لای من هەیە بۆت دەدرووم. زۆرم کەیف پێهات و دڵم ئۆخژنی هاتێ، لەدڵی خۆمدا دەمگوت: دەبم بەکۆمەڵە ئەوان چەند شیک و لەبارو هۆشمەندن، ئەی دیموکرات بۆ ناڵێی دەڵێی کادرویشین، هەرشیرینە تەماشایان بکەی! چەند دۆستێکی ڕاهی کارگەرم هەبوون، پووخت و خاوێن و لەبەردڵان بوون، زیرەک و وریا، هەمیشە کتێب و نامیلکەی کۆمۆنیستیان پێبوو، شیرین بوون، یەکێکیان قۆڵێکی نەبوو لێیببوو بە نەخش، سمێڵێکی سوور و قەڵەمێکی خستبووە سەر گیرفانی شانە بێ قۆڵەکەی، چاویلکەیەکی لە چاو بوو، سیگاری بەهمەنی دەکێشا زۆر نەرم قسەی دەکردوو شێوازی ئاخاوتنەکانی ڕێک بەڕوحت وە دەنووساو هۆگری دووکەڵ و سیگارەکەی دەبووی! وەستا عەلی گوتی: ئەو جلکەت لەسەر حیسابی خۆم بۆ دەدرووم. گوتم: شتی وا نابێت پارەم لە ماڵێ وەرگرتووە، خۆم چی پارەی لە دووکان دەستم دەکەوت دەمدا بە ماڵەوە و لەگەڵ پارەی ماڵێ تێکەڵ دەکرا.

هەرچۆنێک بێت، لەگەڵ وەستا عەلی ڕێککەوتین و ئەندازەی گرتم و گوتی: سبەی بۆ نیوەڕۆ بۆت تەواو دەکەم، زۆر دڵم خۆش بوو، دەمگوت: دەچم دڵی ئەو خاتوونە خۆش دەکەم، جارێکیان ژنێک پێیگوتم جلکی کوردیت لێ جوانە کە ببینم پێیدەڵێم ها بە قسەم کردی! بەڵام هێندەش شەرمم دەکرد،

لەبەر خۆمەوە دەمگوت: دەبێ پیێرانەبواردبم و **گالتەی** پێنەکردبم؟! دڵی خۆم بەوە خۆش دەکرد کە دایکم دەیناسی و دەیگوت: هێندە کچێکی بە ڕێزە ئەو کچە لەوانە نیە غەڵەت لە بابەتەکە مەگە.

## بەشی شەشەم

خەڵک و حیزبەکان، خواخوایانبوو چەکیان دەستبکەوێ و لە ئامادەباشیدابن، بۆ ئەوەی پاشماوەکانی حیزبی بەعس لە نیشتیمان وەدەرنێن، بە بانگەوازی بەرەی کوردستانی خەبەرم بۆوە، هاواری دەکردوو دەینەڕاند، زۆر بە (حەماسەوە) دەیگوت: (ڕۆژی مەردانە ڕۆژی ئەوانەیە کە بۆ نیشتیمانەکەیان دەمرن.)

تووشی دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەی بێ سەرەو بەرە بووم، شتێک قەوماوە، ئاوا کتووپڕ، ئەو بڵیندگۆیە کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕێ، داوا دەکات کێ تفەنگی هەیە، کێ دەمانچە و چەکی هەیە، بێت و ناوی خۆی بنووسێ شەڕێکی یەکلاکەرەوەمان لە پێشە.

دەبێ نەهێڵین جەردەو جەلادەکانی بەعس، ترسۆنەکەکانی ڕژێم، لە نیشتیمانی کوردان بمێنن، ڕۆژی یەکلاکردنەوەیە ، تۆزێک ڕاوەستام و لە بەر خۆمەوە گوتم: بۆ ئەو شەڕە دەچم، هەرچەند هاوڕێیانی ئێمە کۆک نین لەگەڵ بەرەی کوردستانی، کارو کردەوەکانی بەرەی کوردستانی پێچەوانەی خواست و داواکارییەکانی خەڵکن، بەڵام ئەو شەڕە شەڕێکی پیرۆزە. چووم بۆ لای هاوڕێکانم و دانیشتنێکی فراوانمانکردوو بەشێکی زۆر لە هاوڕێیان ئامادەبوونیان هەبوو، ئەوەی گرفت بوو چەک و تفاقی شەڕکردنمان نەبوو، چەند تفەنگێکی شڕە

سینی و ئاربێجیەک و یەک بیکەیسی هەندێک ڤیشەکی ژەنگاوی.

ئۆتۆمبێلێکمان هەبوو دەستکەوتی ڕاپەڕین بوو، گەر ڕێژەی هاوڕێیانمان زۆر با دەبوو خەمی ئۆتۆمبێلێکی دیکەمان خواردبا.

دە هاوڕێ ئامادە بوون، گوتم: چەکم هەیە بەڵام تەنها یەک مەخزەنم هەیە.

بەلای هاوڕێیانەوە زۆر خۆشبوو، دەستخۆشیان پێگوتم، وەک بۆ گەشت و سەیران بچن، بەگۆرانی و هەڵپەڕکێ سەرکەوتین، لەڕێگا بەدەم گۆرانی و شایی و لۆغانەوە، هاوڕێیان لێکیان وەردەگرتەوە، ڕۆژێکی فرە خۆش و پڕ یادەوەرییە، نزیکی مۆڵگەکانی ڕژێم بووین و هەواڵێک هات گوتیان بگەڕێنەوە، ڕژێم و بەرەی کوردستانی(هدنە) دانیشتنیان هەیە، ڕژێمی عێراق لەرزی گرتبوو. دایکم کە بینیمی بە تاقم و تفەنگەوە، بە پاڵتۆیەکی سەربازیەوە، جەمەدانییەک لە مل و پۆزێکی زۆرەوە، ئاخر تەمەنم ٢٣ ساڵ بوو، بەڵام قەت دایکم خواستی ئەوەی نەبوو چەک هەڵبگرم و بەدوای هیچ حیزب و گرووپێک بکەوم، دایکم داغان داغان ببوو. گوتم: (گەڕامەوە،) دیتم دایکم ڕەنگی پێنەمابوو، دەتگوت لە گۆڕت هێناوەتەدەر، هەستت بە ترپەکانی دڵی دەکرد، مات و مەلوول، هەزاران بیری خراپی لە خەیاڵ دابوو، لەلای ئەو وا وێنەکرابوو بۆ ئەبەد نامبینێتەو، واقی وڕما گوتی: «چۆنبوو گەڕایەوە؟ خۆ نەهاتبایەوە دڵم دەتەقی و شێت و هار دەبووم.»

«دایەگیان بەرەی کوردستانی و ڕژێم دانیشتنیان هەیەو ئێمە نەگەیشتینە شوێنی دیاریکراو، هەواڵیان پێداین بگەڕێنەوە، چەند هێزێکی کەم لەو شوێنە دەبن و ئێمەیان ئیزندایەوە تا وەختی پێویست.»

دایکم گوتی: «لەسەرسەرت گەڕێم، پێویستی چی و ئەو شتانە نازانم نابێ بە هیچ شێوەیەک تخوونی ئەو کارانە بکەویت.» دایکی لە گەرمەی قسەکردندابوو، ئەیوب لە مزگەوت گەڕایەوە بینی یاقووب خۆی بەستووە، بەڵام نیگەران بوو پێیوابوو نابێ ئەوان لە چەک و شەڕو شۆڕ نزیکبکەونەوە، سڵاوی کردوو گوتی:«شکور بەسەلامەتی گەڕایتەوە، کاکە پێمخۆشە خۆت لەو کارانە هەڵنەقوورتێنی، چونکە ئێمە دوو براین و بابمان گۆڕیشی نییە، ڕەنگە بەرگەی ئەو حاڵە نەگرین، هەرچەند ئەو ڕژێمە نگریس و تاغووتە شەڕکردن وەک غەزا وایە، بەڵام خەڵکی دیکە زۆرن تۆ خۆتی تێوەمەگلێنە.

ئەو ساتانە چەند پڕ بەها و دڵگیرن یار نایەوێ دووربیت و لە خەیاڵی دەرنەچی. بۆ یاقووب کاتەکان گونجاو نەبوون، هەموویان پێیانوابوو نابێ دایکی جێبهێڵێ و بە دیار کاری خۆیەوە سەرقاڵ بێ، خوێنیان لەو پێناوە داوە. لە گێڕانەوەکانی ناو دەفتەرەکەی، یاقووب دەڵێ:

(ریحان هەواڵی منی دەزانی پێیوابوو نابێ بچم بۆ ئەو شوێنانەی مەترسیدارن). جارێکیان بەخۆمی گوت: (ئەوەندە خۆت مەبە پێش تۆ دایکێکی قوڕبەسەرت هەیە، ئەیوبی برات کەمتر خۆی تێکەڵاوی ئەو بابەتانە دەبێت، کوڕێکی هێمن و لەسەرخۆ هەقم بە دینداریيەکەی نییە دەڵێن زۆر پەیوەستە بە

دین و کتێبەکانی خودا، ئێوە هەردووکتان بەیەکەوە دەژین هەوڵبدە تەبایی ماڵ تێکنەچێت، حەز دەکەم تۆ بۆ هەموومان بمێنیت، ڕەنگە هێندەی دایکت بەشم پێوە هەبی.) بەوەی زانیبوو لەگەڵ هاوڕێیان ڕۆیشتووم بۆ بەرەکانی شەڕ، دایکم دەیگوت: «ریحان بەیانی زوو هات و هەواڵی منی پرسی و پێیگوتووم نیگەرانم یاقووب بۆ وا دەکات، ئەو هێشتا شەڕی نەدیتووە، ڕاستە کوڕێکی گورج و گۆڵە بەڵام تفەنگی نەتەقاندووە، دایە خەجێ بۆچی هێشتت بچێت؟»

ئیدی منیش لە وڵامی خۆمدا جارێکیان بەریحانم گوت: (ڕاستە زۆر خۆم دەبەمە پێش، بەڵام ئەوەش بزانە دوو بەشی هەستی تۆیە هۆگری ئەو جووڵانەوەی کردووم، تۆم لە ناو ئەو ڕێکخراوەدا باشتر ناسیوە، زەحمەت دەتوانم دەستبەرداری بم، کەساییەتییەکانم زۆر خۆشدەوێن و وەک و برای خۆم سەیریان دەکەم. هۆگربوونی تۆ ئەو خواستەی زیاتر لاشیرین کردووم، ڕۆژانە جگە لە وەی کە دەبێ خەمی ژیان و گوزەرانی خۆم و ماڵەوە بخۆم، خەم لەوەش دەخۆم لەگەڵ تۆ ماڵێکی جوانمان هەبێت.) ریحان گوتی: (ئەوە دەزانم هەستم بە هەنگاوەکانت کردووە، لێت تێدەگەم دەتەوێ چیبکەی، ئەوەی تۆ دەیکەی خواستی منیشە، بەڵام تۆ بۆ من زۆر پێویستی.). دایکم گوتی: (خۆزگە ریحان ئاوای دەبینی کە تفەنگ و ڕەخت و جەمەدانیت لە مل ئاڵاندووە، یان باش لێت توورە دەبوو یا تێر تێر لە ئامێزی دەگرتی.)

ئەو قسەی دایکم بەلامەوە سەیر بوو، چونکە ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی پەیوەندی خۆم و ریحانم نەکردووە، چۆن

زانیوییەتی؟ ریحان کە بیستوویەتی لەگەڵ هاوڕێکانم ڕۆیشتووم بۆ بەرەکانی شەڕ، خۆی وەخۆ نەگرتووە، قنیاتی نەبووە، خۆی گەیاندۆتە لای دایکم. دایکم هەستی پێکردووە کە پەیوەندییەک هەیە لە مابەینی من و ریحاندا، ئەو پەیوەندییە وەک پەیوەندییەکی ئاسایی نییە. لەوە تێگەیشتم، دایکم لەو ڕوانگەیەوە زانیویەتی. گوتم: دایە برایەکەی ریحانیشمان لەگەڵ بوو، ئەو بەرپرسمان بوو، ئەی ریحان باسی نەکرد لای تۆ؟

گوتی: (ئەرێ باسی کرد، دڵی لای هەردووکتان بوو، هەستم دەکرد زۆر هۆگری تۆ بووە، وای لێحاڵی بووم تۆی خۆش دەوێ، بۆیە لە هەر قسەیەکیدا ناوی تۆی زۆر بەشیرینی دەهێنا و دەتگوت گۆرانی دەڵێ، ئاخر ڕۆڵە خۆ کچ هەردیارە کە کەسێکی خۆش بوێت، کچ وەک کوڕ خۆ ڕاگر نییە. گوتم: (دایە گیان ڕەنگە بەهەڵەدا چووبی ئێمە تەنیا هاوڕێی یەکدین و لە ڕێکخراوێکدا کار دەکەین. دایکی ریحان زۆرجار باسی بابم بۆ دەکا، کە چەند غەدریان لە بابت کردووە، ئەوان زۆر خۆیان بە نزیکی ئێمە دەزانن.)

دایکم گوتی: (ڕاستە بابتان لەگەڵ بابی ریحان برادەربوون، بابی ریحانیش بەر ئەو داپلۆسینە کەوت و وەختێک لەزیندان گەڕایەوە، تەنها چەند ساڵێک ژیا بەرگەی ئەو هەموو سووکایەتییەی نەگرت، زۆر بە تەنگ کەرامەتی خۆیەوەبوو، چاوی بەرینایی نەدەدا دوای هاوڕێکانی بژی. دەگێڕنەوە دەیانگوت: بابی ریحان گوتوویەتی ڕەنگە خانەوادەی سەمەدی چەرموو وا هەست بکەن من هۆکاری

شوێنبزرکردنی سەمەد بم، ڕەنگە وابزانن من تەسلیمی ئەو دەستەیە بووبم و بۆیە بەربووم، بەڵام ئێمە هیچ کات غایلەی وامان بەدڵدا نەهاتووە، ئەو پیاوێکی مەندو هێمن بوو دیقەتم دایە ریحان هەر لە بابی دەچوو، گەرم و چووست و چالاک لە قسەکانیدا، زۆر جار لە ماڵی ئێمە کۆدەبوونەوە, بابی ریحان قسەی بۆ دەکردن و ئەوانیش هەموو لەشیان دەبوو بەگوێ، هێندە ئاردەوێژی خۆش بوو، ئەوەی جێگەی داخە برادەرەکانی بابت هیچیان نەماون تەنیا خاڵت نەبێت، سوپاس بۆخوا خاڵت تا ئێستاش هەر لەسەر خۆیەتی و چالاکە و لەسەر پێی خۆی وەستاوە. ریحانم کەتۆتە بەر دڵی، خۆشم دەوێ خوای کردبا وابا ماڵی تۆ و ریحانم بینیبا، ئەوجار مردباشم خەمی خۆم نەدەبوو.).

دایکم بەردەوامبوو درێژەی پێدا، وایدەزانی حەوت مێشی لە دارێکدا دیوەتەوە، زۆر بەوردی ڕۆچووبووە ناو هەستەکانی ریحان، دەتگوت ریحانە قسانم بۆ دەکات. لەوە حاڵی بوو کە زۆری قسەکرد, گوتی: (ڕۆڵەگیان هیوادارم ساغ و سەلامەت بن و ژیانێکی ئاسوودەیتان هەبێ.)

گوتم: (دایە گیان هێشتا زوویە جارێ با تۆزێک چەرمەسەری ژیان ببینین و بزانین ژیان چیمان فێردەکا، چۆن مامەڵە لەگەڵ ژیاندا دەکەین، ئەوە ئاسانە, بیر لە بابەتگەلێکی ئەوتۆش دەکەینەوە، هێشتا من بێ کارم، ئەو ئیشەی ئێستام ڕەنگە بەشی ماڵ و خێزانداری نەکات، نابێت کارێکم هەبێت، ئەوجار ئەیوبی برام گەورەترە لە من، تا ئەو ژن نەهێنێ من ڕەنگە

نەتوانم ئەو کارە بکەم). دایکم بە هەستیاریەوە سەیری کردم و گوتی: بۆ ئەیوبیش خوا گەورەیە.

سامالّ بوو، شنەبایەک دەیدا لە ڕوومەتی ریحان، گوێی پێ نەدەدا، دڵی بەوە خۆش بوو، شەڕ نابێت, نە برایەکەی نە یاقووب ناچن بۆ شەڕ. پرچی بەر دابۆوە، با، بسکەکانی دەجووڵاندوو تابلۆیەکی جوانی دروستکردبوو، تیشکی زێڕینی خۆر لە چاوانی ریحانی دابوو. ئەو بەیانیان، بێ دەم و چاوشووشتن وەک سووراوی کردبێ وابوو، کۆڵمەکانی بە تیشکی خۆر و کزەبا ساردەکە هێندەی دیکە سوور هەڵگەڕابوون.

ڕێکەوت وابوو یاقووب لەو وەختەدا دەچۆ بۆ سەر ئیش، لە بەر دەستکورتی وازی لە خوێندن هێنا, پێیوابوو نابێ حەوجێی کەس بێ، لای برادەرەکانی گوتبووی زۆر نیگەرانم وازم لە خوێندن هێناوە بەلاّم ناچاربووم، گەر حاڵی دارایم باشبوو دەست بە خوێندن دەکەمەوە.

ریحان لچکێکی شینی لە ملی کردبوو، هێندەی دیکە شیرین ببوو، ئاخر دەیزانی یاقووب زوو لە خەو هەڵدەستێت و دەچێتە سەر کارەکەی، یاقووب کارێکی دیکەی پەیدا کردبوو، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی کتێبخانەیەکیان دانابوو، دەیگوت: (لەوەتی ئەو کتێبخانەیەمان داناوە زۆر دڵخۆشم, چونکە لە مەیدانی چەکفرۆشان و گرفتی ئەو مەیدانە نەجاتم بوو.)

نیگایەکی لای ریحان بوو بەیانی باشێکی لێکرد، هەر ئەوەندەبوو بچێتە ناو پرچەکانی و خەنی بوونی خۆی نمایش بکات.

ریحان گوتی: «زوو نییە بۆسەر ئیشەکەت دەچیت؟»

گوتم: «گیانەکەم زوویە بەڵام حەزم دەکرد چاوێکم بەتۆ بکەوێ. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئێستا ئەو کاتانە ریحان لەدەرەوەیە، تا دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە کاتێکی زۆری دەوێ ڕەنگە ئەو وەختە تۆ لەدەرەوە نەبی.»

ریحان گوتی: «دەزانی چەند ئاسوودەم، کە شەڕوشۆڕ نەماوە، ئاخر کێ لە شەڕ قازانجی کردووە؟ بە هەزاران کوڕی گەنج بە ختو خۆڕایی تێداچوون، ماڵی زۆر کەس خەراپ بووە، دەی با لە ئیشەکەت دوا نەکەوی، هیوادارم ساغ و سەلامەت بی، زۆریشم پێخۆشە ئیشەکەت گۆڕیوە بەڵام بەداخم کە وازت لە خوێندن هێناوە.»

یاقووب دڵگران بوو بەدوورکەوتنەوەی لە هاوپۆلەکانی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ڕۆژێک هەر دەبێ دەست بەخوێندن بکەمەوە.

لە ریحان ڕاماو گوتی: «تۆم هەبێ بەسمە، گەر پشتیوانم بی ئەو گرفتەش چارەسەر دەکەم. دەزانی دایکم هەستی بە شتێک کردووە، هێندە بە دڵنیایەوە قسەی بۆ دەکردم، پیمگوت دایە هێشتا هیچ ڕووی نەداوە بۆچی بەو شێوەیە قسە دەکەی؟ گوتی لەچاوی ریحاندا ئەو حاڵەتە دەبینم، هەستدەکەم پەیوەندییەکی خاوێن لە نێوان تۆ و ریحاندا هەیە، زۆریش

دڵخۆشم. بەڵێ ریحان گیانەکەم، منیش وازهێنانم لە خوێندن بە باش نازانم، بەڵام ژیان و بەڕێوەبردنی خێزان لە ڕۆژێکی وەک ئەمرۆ گەلێک سەخت و دژوارە، هیوادارم بتوانم قەرەبووی ئەوشتانە بکەمەوە.»

پێش ئەوەی بگەمە کتێبخانەکە، بیرم بۆ ئەو دەمانچە تۆپلیە چوو، خستبوومە ژێر نوێنەکان، دەمگوت: خۆ ئەو دەمانچەیە هەر لەخۆوە سوارە، ئەدی ئەگەر دایکم دەستکاری کرد، یان ئەیوبی برام؟ تووشی حاڵەتێکی خراپ ببووم، دڕدۆنگ بووم، هەر زوو بە ڕێگەی خۆمدا گەڕامەوە، بە ریحان ڕانەگەیشتم گوتم, فرسەتە هەر چاوێکی ئەو تێرم دەکات و دەتوانم لە خەیاڵەکانی خۆمدا بیهێنم و بیبەم، مخابن کەمێک درەنگتر گەیشتم، گەیشتمەوە ماڵ بە پەلە پەل چوومە ژوورەوە، دایکم خەریکی ڕێکخستنی نوێنەکان بوو، بە ئیشی ئێمە ڕازی نەبوو، بەڵام هیچ کات وای نەدەگوت کە ئیشەکانتانم بە دڵی نییە.

منی بینی حەپەسا گوتی: «بیسمیلا بۆ وا زوو گەڕایتەوە؟»

نائاگایانە دەستی خستبووە سەر دەمانچەکە، بە خێرایی دەستیم گرت و دوورم خستەوە، دایکم تووشی شۆک بوو، «چییە کورم؟»

گوتم: «دایە شتێک نییە ئەو چەکە تۆزێک مەترسیدارە، تکایە بۆیە هەر زوو گەڕامەوە، دەیدەم بە خاڵم بەڵکو لە مەیدان بیفرۆشێت و لە کۆڵم بێتەوە, هەر زۆر ئاسان دەتەقێ بۆیە ترسی ئەوەم هەبوو ئێوە تووشی شتێک بکات.»

دەمانچەکەی خستە ژێر کەمەری و چوو بۆ بازاڕ، گەیشتە بەردەم دوکانەکەی و گوێی لە دەنگی تەقە بوو، هیچ خۆی شلوێ نەکرد، سووک و ئاسان دوکانەکەی کردەوە، بینی نامەیەک لە سەر مێزەکە دانراوە، نامەکەی خوێندەوە هی هاوڕێیەکەی بوو، ئەو هاوڕێی کە بە یەکەوە کتێبخانەکەیان دانابوو. هاوڕێم سڵاو هیوادارم شاد و ئارام بن.

ڕۆیشتم بەکارێکی حیزبی، هەر داوای منیان کردووە، کە گەڕامەوە بۆت باس دەکەم، هەندێک پارە لە ناو چەکمەجەکەیە.

کاتێکی خۆش. هاوڕێت دارا.

دڵنیابووم بابەتەکە پەیوەندی بەو لیژنەیەوەبوو کە دارا سەرپەرشتی دەکرد، زۆر بیرم لێنەکردەوە، دوێنێ لای هاوڕێیان بووم باسیان لە مەسەلەیەکی ئاوها کرد، هاوڕێ دارا ئاگادار بکرێ، کە ئەندامانی لیژنەکە کۆ بکاتەوە، چەند قسەو باسێکمان دەبێ، لە سەر ڕەوشی ناوچەکە و باردۆخی حیزب تێیکەوتووە. دوو گەنج خۆیان بە دوکانەکە داکردوو تەماشای کتێبخانەکەیان کرد، دڵخۆشی خۆیان ڕاگەیاند و دەستخۆشیان پێگوتم. زۆر دڵم خۆشبوو، سوپاسم کردن و هانمدان کتێب بەهادارە، خۆشحاڵم کە دەتانەوێ بخوێننەوە، زۆر قسەو باسمان کرد، دواجار دوو کتێبیان کڕی، جۆری کتێبەکان مێژوویی بوون، پێشتر ئەو دوو گەنجەم بەرچاو کەوتبوون بەڵام نەمدەزانی لەکوێ ئەوانم بینیوە، گوتم: دەزانم دێنەوە بۆ دووکان مادام خوێنەربن ئێرە دەبێتە مەنزڵی ئەوانەی عاشقی کتێبن.

تەوقەیەکی گەرممان کردوو ڕۆیشتن. باشە بۆ نەمپرسی ئەو تەقەیە چی بوو؟ دەی ڕەنگە ئەوان ڕاهاتبن بەو حاڵە، گەر شتێکی نەخوازراو با ئێستا دەنگی دەدایەوە، هیوادارم ئەو خەڵکە سەلامەت بێت. نەمتوانی بچم بۆ لای خاڵم، دەمانچەکەی بۆببەم، چونکە هەر خۆم لە دووکان بووم ، لە دڵی خۆمدا گوتم: دەبێ خاڵم قبووڵی بکات، چونکە ئەو چەکە هی خۆم نییە!؟ گوتم: نا، نا، ئاخر ئەو ڕۆژی مەیدانی چەکفرۆشان، دەزانی چەندم چەک و شتی خاڵم فرۆشت، ئەو دەستم بە بەر دەست نانێ، حەتمەن بیفرۆشێت چی قانزانج بکات لەگەڵ خاڵم بەشی دەکەین، خاوەنی دەمانچەکە چی دامێ، نیوە بۆ خاڵم، نیوەش بۆ خۆم.

لەو بیر کردنەوەیە دابووم خاڵم سڵاوی کردوو گوتی: «یاخوا پیرۆزت بێت، بابم ئێرە بۆ تۆ باشە چ کارێکت بەو شێتخانەیە، هەر ئێستا یەکیان ڕاو نا بە تفەنگان، خوا ڕوحمی کرد بەر نەکەوت، خۆی لە ماڵان هاویشت.»

گوتم: «خاڵە یاخوا بەخێر بێی، بڕوات بێت لە دڵمدا بوو بێم بۆ لات. ئەو دەمانچەی ئەو هاوڕێیەم هەر لامەو نەفرۆشراوە، دەتوانی بیبەی لەگەڵ خۆت ئەو هاوڕێیەم چی داینێ بەشی دەکەین«

خاڵم گوتی: «بە سەر هەردووک چاوان، بێخەمبە بەڵام حەز دەکەم لە سەر کاری ئێستا بەردەوام بی، نەچی وازی لێبهێنی.»

## بەشی حەوتەم

چۆن کتێب و خوێندنەوە هاتە ناو ژیانی یاقووب، ئاوا لە دەفتەری یادەوەریەکانید نووسرابوو: پورزایەکی دایکمماڵیان لە شار بوو، ماڵەوەیان ئەهلی کتێب و خوێندنەوە بوون. زۆریش پابەندبوون بەدین، سەر ڕەفەی کتێبەکانیان پڕ بوو لە کتێبی ئاینی. گوتم: خاڵە دەتوانم کتێب بخوێنمەوە؟ گوتی: هەی لە خاڵت کەوێ، ئەرێوەڵڵا  بە ئارەزووی خۆت ئەوە کتێبەکانن، بەڵام  گەر قورئانەکە دەخوێنی دەبێ بچی دەستنوێژ هەڵبگری.

گوتم: ناتوانم قورئان بخوێنم، کوردی دەتوانم بخوێنمەوە. خۆم نزیک خستەوە لە کتێبەکان و کتێبێکی قەبارە بچووکم هەڵگرت، دەستم کرد بەخوێندنەوە، چیرۆکی هابیل و قابیل بوو، تا تەواوم نەکرد وازم لێینەهێنا. یەکەم ساتی خوێندنەوەی کتێبم بوو، لەوێوە خۆم خزاندە ناو کتێبان و ڕۆژ بە ڕۆژ کتێبم لێنزیکتر دەبوو خووم پێوەگرت و نەیهێشت داببڕێم، لەو کتێبەدا شەڕی براکانم پێناخۆش بوو، باڵندەکە بکوژەکەی فێر کرد تەرمەکە بخاتە ژێرگڵ.

دەچووم بۆ هەر شوێنێک کتێبێکم لەگەڵ خۆم دەبرد، هەر ئەو هۆگر بوونەشم بۆ کتێب زیاتر هانیدام، ماڵمان بێ کتێب نەبێ، کردنەوەی کتێبخانەش وەک پیشەیەک و چێژوەرگرتن بەردەوامی پێ بدەم. ئەیوبی برام بەردەوام سەری لەسەر

کتێبە ئاینییەکانە، تەفسیرەکان چی دەستی بکەوێ دەیخوێنێتەوە، چەند جاریش قورئانی خەتم کردووە، بەڵام بۆ ساتێکیش دڵی ئێمەی عاجز نەکردووە، زۆر هێمن و لەسەرەخۆیە، زۆرجار لە چاوەکانی ڕا دەمخوێندەوە کە پێیخۆشە لەگەڵ کتێب سەروکارم هەیە، جارێک پێیگوتم: گەر حەز بە کتێبەکانی من دەکەی دەتوانی بیانخوێنیتەوە، بەڵکو زۆریشم پێخۆشە کە خوێندنەوە لە خۆتدا چڕ بکەیتەوە، هەر کتێبێک نووسرابێ، بێ حیکمەت نییە، نووسەرەکەی لەخوداوە نزیکەو سروشی بۆ هاتووە واتا خوێندنەوەی هەر کتێبێک بەشی خۆی زانست و زانیاری تێدایە. ڕێگەی بۆخۆشکردم کە چەند قسەیەکی پەنگخواردووی ناو هەستم بکەم و لێم پرسی گوتم: کاکە هەمان بۆچوونم هەیە، وایدەبینم نووسەری کتێب پەیامبەرە، ئەو پەیام و ئەلگۆیانەی ناوکتێب بە دیوێکدا قسەی خودان، ئەوانەی کتێب دەنووسن خودا سروشیان بۆ دەنێرێ، پێتوانییە کارڵ مارکس پێغەمبەرێک نییە؟ چاوی لەسەر دەم و ئاردەوێژی قسەکانم دانابوو، دەستی خستبووە بن چەناگەی و ڕامابوو گوتی: (بۆچوونێکی جوانە بەڵام ناکرێ بڵێی پێغەمبەرە چونکە محەمەد موستەفا پێغمبەری ئاخیرە، ئەوانەی کتێب دەنووسن ڕاستە دەبێ حیکمەت و میهرەبانی خودایان تێدا بێ، بەڵام ناکرێ بڵێین پێغمبەرە.) گوتم: (ئاخر ئەو کتێبانەی کارڵ مارکس باس لە یەکسانی و دادپەروەری دەکەن، دەی خوداش هەر ئەوەی ناوێ؟) گوتی: (ڕەنگە نەتوانم ئەوفتوایە بدەم، بەڵام لێتی ناشارمەوە هەموو ئەوانی قسە لەسەرجوانکردنی کۆمەڵگە دەکەن و بەرنامە بۆ باشترکردن و بەیەکەوە ژیان دادەنێن گومانی تێدا نییە کەلامی

خودایان پێیە، ئیدی هەرکەسێک بێ.) یاقووب ئەو دیالۆکەی لەگەڵ ئەیوب پێخۆشبوو، چونکە زۆر جار تەقییەی دەکرد کەکتێبێکی غەیرە دینی لەدەست دابوو، پێیوابوو ئەیوب وەک براگەورەیەک حەزی لەو کتێبانە نییە، بەلام لەوە حاڵی بوو، خوێندنەوە بۆ ئەیوب گرنگە جا هەر کتێبێک بێ.

ڕۆژ دوای ڕۆژ دڵم بە کتێبخانەکەم خۆشتربوو، سەردان و کڕینی کتێب لە کتێبخانە هەر بەرەو زیادیٚ دەچوو، دایکم دەیگوت: (یاقووب بەڕەی خۆی لە ئاویٚ دەرهێناوە، دەتوانیٚ ژیانی خۆی بەڕێوە ببا، زۆر بەدڵخۆشییەوە دەچێتە کتێبخانەکەی و هەست دەکەم زۆر ئاسوودەیە.) ئەو قسانەی دایکم دەمبیستنەوە هۆگربوونی دووکانەکەم زیاتر بوو.

دڵم بەو کتێبخانەیەی ماڵەوە دەکرایەوە، دوای جارێکی ڕاگواستن و جێگیر بوونمان لە شوێنێکی دیکە گوازەگوازمان بە کتێبەکان دەکردو پاراستمانن لە دڕاندایەتی ڕژێم و هۆگربوونی زۆرمان بۆ کتێب، دانانەوەی کتێبخانە خەونێک بوو.

ڕۆژانێک کتێبخانەیەکی جوانمان هەبوو، پڕی کتێبی ئەدەبی بوو. لەناو کتێبەکاندا دەیان هیوا و خۆزگەمان هەڵچنیبوو. ئاخر لە قابیل و هابیلەوە تێگەیشتم کوشتن چەند قێزەونە، چەند شەرمەزارییە، ناو کتێبەکان دەنگی هەڵوەرینی گەڵاکانم گویٚ لێدەبوو، بەخۆم نەبوو لەگەڵ چکە چکیٚ ئاوی کانی و هاژەی ڕووبارەکانی ناوکتێب دەبووم بە سۆفی، سەدان شەو لە خەڵوەتی کتێبدا سرووتی شیرینم دەبینی. ئێمە لە دەمی قات و قڕی و نەبوونییەدا، لە کاتیٚ کە خەریکبوو سەرمای زستان

ڕەقمان بکاتەوە، دایکم لە بێ دەرمانی وەختبوو گورچیلەکانی لەدەستبدا، جگە لە خەرمانی ئەو کتێبانەی کە بە سواڵ و سەدەقە لەماڵی ئێمەدابوون، دینارێک و ئومێدێکمان نەبوو، لەگەڵ ئەیوب ڕێککەوتین کە کتێبەکانمان ببەینە سەرجادە، بیانبەین بۆ شارەگەورەکان. لە ڕێگەی دۆستێکی خاڵم گەلابەیەکی هەبوو، کتێبەکانمان خستنە ناو گونییە و کارتۆن، خۆم لەگەڵی چووم، چەند کتێبخانەیەکم کرد بەشێک لە کتێبەکانم ساغکردنەوە، ئەو کتێبانە زۆربەیان ڕۆمان و چیرۆک بوون، بەشێک گۆڤاری حیزبە چەپەکانی تێدا بوو، چەند کتێبێکی وەرگێڕدراوی تێدا بوون دەگمەن بوون. چەند ڕۆژ لە سەرجادە لە چاوەڕوانی فرۆشتنی ئەو کتێبەکاندابووم و تەواوم کردن، ئەو کاتیش کتێبی زۆر باش نەبا پارەی نەدەکرد، هێشتا هەندێک کتێبم لە یادن کە خاوەنی کتێبخانەکە هەر لەخۆشیان قووشقی ببوو هێندەی پێخۆش بوو، هەر زوو کردنی بەماڵی خۆی. بەشێکی زۆرم هەر زایەکردن دەمدا بە ئەوانەی کە چەند کتێبێکیان دەکڕی. کتێبی دایک، نینا، شکست، هەرەس و سەگوەڕوو ژانی گەل و گوڵی ڕەش و شاری حوسێن عارف کە یەکێک بوون لە کتێبە هەرە جوانەکان. هەڵکشانی عەبدەڵڵا سەڕاج و چی کتێبی کە بەقاچاغ کۆم کردبوونەوە، بەناچاری فرۆشتمن و تا توانیم پێداویستیەکانی ماڵێی پێ دابین بکەم و دایکیشم ببەم بۆ لای پزیشک. زیاتر خووم دابووە کتێبەکانی شێرزاد حەسەن، چیرۆکی میم بەشێکبوو لە فەلسەفەی مارکس، لەو کتێبەکەدا ملکداریەتی تایبەتی ڕەت دەکردەوە، زۆر جار کە لەگەڵ ئەیوب قسەم دەکرد، ئەو هەستی لە قسەکانم ڕادەگرت و دەیگوت: (خەریکە

جوان دەتەوێ گەشە بە بیرو باوەڕەکەت بدەی، لە سێبەری قسەکانتدا ئەو وێنانە دەبینم، کە دەتەوێ خۆت بەولایەدا ساغ بکەیتەوە.) یاقووب بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست لە بەرامبەر ئەیوبدا دمبەدمە بکا و بە زەردەخەنەوە دەیگوت: (چاوم لە براگەورەکەمە کە هەمیشە وەک کەسێکی عیرفانی عاشقی کتێب بووە.) ئەیوب گرفتی ئەوەی نەبوو چۆن دەخوێنییەوە، ئەو هێندە بەو دونیایە خۆی ماندوو نەدەکرد، بەڵام بەلایەوە گرنگبوو زیاتر لەتوانای خۆی بخوێنێتەوە، یاقووب گوتی: کاتی خۆی کە کتێبەکانمان هەڕاجکردن ئەیوب حەزی دەکرد کتێبەکانی خودا هەر بمێنن لە ماڵەکەماندا.)

گوتم: (ها کاکە ئەوە ملکدارییەتی تایبەتە، خۆ من دەزانم قورئان لەدیدی موسڵمانان مامەڵەی پێناکرێ کڕین و فرۆشتنی لەسەر نییە، بەڵام دەکرێ تەفسیرەکان و کتێبەکانی دی ببەینە سەرشەقام و لەگەڵ باقی کتێبەکانیدی بیانفرۆشین، چونکە تا بڵێی حاڵمان خراپە، ئەوە دایەش خەریکە دەکەوێ.)

ئەیوب ڕازی بوو تەنها قورئانەکان لێگەڕێ ئەوانی دی دەکەین بە پارە. هەرچەند جار کتێبم بۆ کتێبخانەکە دەهێنا، لە هەر کتێبێک دانەیەکم هەڵدەگرت و بناغەی کتێبخانەیەکی تازەم پێدامەزراند، دارای شەریکیشم هەروایدەکرد، وردە وردە توانیمان بڕەک کتێبخانەی ماڵەوە درووست بکەینەوە.

ئەیوبی برام پێش ڕاپەڕین لە ئۆردووگا کتێبخانەیەکی باشی هەبوو، بە بار کتێبی لە ئێرانەوە بۆ دەهات. ئاگام لێبوو کە کتێبەکانی بۆ دەهاتن، لە فاکتۆرێکی ئێرانیدا ژمارەو ناوی کتێبەکانی تێدا تۆمار کرابوو، کتێبەکان دەخرانە ناو کارتۆنی

گەورەو دواتر لە ناو تەلیسیان دەهاویشتن بە وڵاخ باردەکران و دەگەیشتە دەستمان. لە بیرمە هەندێک کتێبی قاچاغ و نەیار بەڕژێمی بەعسی تێدابوون، دەبوو تۆزێک بە ترسەوە ئەو کتێبانە ببات بۆ کتێبخانەکەی، خەڵکی خوێنەر لە شارە گەورەکان دەهاتن بۆ کتێبخانەکەی ئەیوب، ئەوکات ژیان مەترسیدار بوو هەمووی هەر بەدرِدۆنگی ژیانی بەسەر دەبرد. لە بیرمە ڕۆژێکیان هەواڵێک هات گوتیان حکومەت خەریکی خۆ ئامادەکردنە بۆ کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئۆردووگا، چاڵێکی گەورەی بەدەوری ئۆردوگادا لێدا، بۆ ئەوەی ئۆتۆمۆبێل نەتوانێ بە هیچ شوێنێکدا بێتە ناو ئۆردووگا جگە لەو زاڵگەیە کە لە هاتنە ژوورەی ئۆردووگا دا هەیبوو. لەبیرمە بیرێکی ئاوێمان هەبوو، چی کتێبی قاچاغ و جێگەی مەترسی بوون بە گوریس و کەژوو شۆڕمان کردنەوە ناو بیرەکە، ئەیوبی برام زۆر لێزانانە لە چەند تەلیسێکی بەستن و کارەکەی ئەنجامدا، ئیدی دایکم و ئەیوب زۆر خاترجەمبوون..

***

شاگردیم دەکرد لەکاتی دەست بەتاڵیمدا، زۆری پێخۆشبوو، چاوم بە کتێبەکان دادەخشاند، تۆمارگەیەکیش هاوسێی کتێبخانەکە بوو، ئەو سروودانەیان دەخستە سەر زۆر هەستیار بوون، ئەو کات نەجمەدینی غولامی و ناسری ڕەزازی و شڤان پەروەر و جەمالی موفتی، حەمە جەزا، سمبوولی شۆڕش بوون. کەسێکی دیکە هەبوو بەناوی فەتاحی خووڕاسانی دەنگێکی چیایی و کێوی هەبوو، بە شێوەیەکی نادیار تێدا چوو. ئەو دەنگانە هەوێنی گەرمبوونی هەستی

بەرەنگاریمان بوون. ئەیوب لەگەڵ ڕەوتی خوێندنەوەو شۆڕبوونەوەی فکری بوو، هێندە هۆگری شۆڕش و دەنگی ناڕازی نەبوو.

بەڵام زۆرجاڕ دەیگوت: ئەو ئیشەی ئێمە بۆخۆی شۆڕشێکە، کتێب فرۆشتن مەترسیشی تێدایە. دەیگوت: کتێبخانە جگە لەوەی لەڕووی دەرامەتەوە سوودی هەیە، بۆ خۆپێگەیاندن و وەرگرتنی زانیاریش کەڵکی هەیە. ئەیوبی برام چی کتێبێ تازە دەرچووبا دانەیەکی بۆ کتێبخانەکەی ماڵێ دەبردەوە، ئەو کتێبانەی دەست منیش دەکەوتن، بۆ کتێبخانەی ماڵێم دەبردنەوە. ڕەوتی خوێندنەوەی من جیاواز بوو لەگەڵ خوێندنەوەی ئەیوبی برام، ڕەوتی دینی و بیرکردنەوەی ئەیوب زۆر نەرمبوو، ئیرەییم پێیدەبرد، کە زۆر ژیرانە لە بەرامبەر دیدە جیاوازەکاندا دەدوا، لەپەنای خوێندنەوەدا سوودم لە هەڵسوکەوتی ئەیوب وەردەگرت.

بەشێک لە چەپەکان سەردانی کتێبخانەیان دەکرد، جەدەل و گۆڕینەوەی دیدی پێچەوانەیان هەبوو، هەمیشە بە نیگایەکی خەندەئامێز بەرسڤی دەدانەوە، هەموویان خۆشیان لێدەهات و حەزیان بە هاوڕێیەتی ئەیوب دەکرد، بەڵام ئەو لەسەر کارەکەی گفتوگۆی خۆشبوو حەزی نەدەکرد تێکەڵی کەس بێ، حاڵی ئەو جۆرێکبوو لە فەنابوون، جاروبار گوێم لە دۆستەکانی بووە دەیانگوت: (تێڕامانی ئەیوب جیاوازە لە هەموو ئەوانەی بەدوای دین و خودا کەوتوون.)

من و ئەیوب چەند ساڵ ئەو کتێبخانەیەمان هێنا، تا ڕۆژی بەو ڕۆژە گەیشت. هۆگربوونی ئێمە بۆ کتێبەکان لە ڕۆحەوە

بوو، دوای ڕۆیشتنی کتێبەکان، وامدەزانی کێوێک ڕوخا، هیوای چەند ساڵەی ئێمەیان خنکاند، لە دڵەوە گریام، بێ ئومێدی خەریکبوو بمخنکێنێ، بەڵام دایکیشم حاڵی باش نەبوو باشترین بژاردە بوو بۆ دەرچوونمان لەو قەیرانە.

دوای ساڵانێک بەڕێوەبردنی کتێبخانە، ئەیوبی برام بەهۆی چوونە ناودونیای عیرفانی خۆی و شۆڕبوونەوەی بۆ دەقە دینیەکان، پشتی لە دووکانەکە کرد. ئەوم وەک خودا ناسێکی گەورە بینی، لە بەرامبەری ئەودا شەرمم دەکرد، سەرڕوومەتەکانی دەبریسکانەوە سمێڵەکانی کورتدەکردنەوە، پێچەوانەی موجاهێدە سەر لێشێواوەکان ڕیشی دا نەدەنا، خووی بە پاک و خاوێنی و جوان ڕاگرتنی هەمیشە چاوی لەسەر رۆیشتی خۆیشی بوو، نەیدەهێشت پێڵاوەکانیشی پیس بن. دەیگوت: کەسێک خزمەتی خۆی پێنەکرێ ناتوانێ بۆ خوداش هیچ بکا.

هەر ئەو سارد بوونەوەیە بوو، کتێبخانەکە بەسەر مندا بەجێ ما. کاتی منیش ئەوەندە زۆر نەبوو، دانێک لە خوێندن بووم و وەختێکیش لە سەر کتێبخانەکە بووم، فرسەتم وەردەگرت بۆ چاوخشاندن بەو کتێبانەی لەگەڵ زەوق و سەلیقەی خۆم دەهاتنەوە، جار و باریش هەندێک کتێبی ئیسلامیم دەخوێندنەوە. کتێبێکم بۆ هات ئیسلامی بوو، نووسەرەکەی دکتۆر عەلی شەریعەتی بوو، بەناوی دایە باوە کێ خراوە، خوێندمەوە، وابزانم مامۆستا هەژار کردوویەتی بەکوردی. بەهەرحاڵ هەندێک هۆگری بوم بەڵام نەچوومە ژێر کاریگەری ئەو کتێبە. کتێبێکم دەست کەوت، ژیان و کوورتەو

کردەوەکانی لینین لای من بابەتێکی تازە بوو، بە وردی خوێندمەوە، نەمهێشت داببڕێم. دوای ئەو کتێبانە کەوتم کە بەو دیدە نووسراون، بەدوای ڕۆمانەکاندا دەگەڕام کە لە دیدی کۆمۆنیستییەوە نووسراون، ڕۆمانی دایک وەک تاکە ڕۆمانێکی دیار لەو ڕۆژەدا بەرجەستە بوو، دەمویست پاڤێل ئاسا لەو ناڕەزایەتیانەدا دەورو نەخشم هەبێ. لەو ڕۆمانەدا دایکم دەبینی چۆن دژی نادادیەکان تێدەکۆشێ. لەمەکتەبیش مامۆستایەکی بەڕێز و لە خوا ترسمان هەبوو، بە دیدی ئیسلامی کتێبی دەنووسی، نەرم و لە سەرەخۆ بوو، لەسەر دیدو ڕوانینی میانڕەوانە دەینووسی، تا قسەی دەکرد، هەستمدەکرد لەگەڵ ئەیوبی برام دانیشتووم.

لەبیرمە کتێبێکی دامێ بە ناوی خوشکم حیجاب خۆش بەختییە، دەیویست بەو نەرمییەی خۆی کاریگەری لە سەر قوتابییەکان دابنێ، تا ئەندازەیەک ئەو کاریگەریەی دانابوو. ئەو شوێنە واتا دووکانەکەم دوای دەوامی خوێندنگە دەبوو بە شوێنی ڕاگۆڕینەوەو کۆبوونەوەی هاوپۆلەکانم. بەداخەوە ئەوەندە نەمتوانی درێژە بەو کارەبدەم و دوای پشتێکردنی ئەیوب لە دووکانەکە، بۆ منیش گونجاو نەبوو. دووکانەکەم بە دۆستێکی خۆم فرۆشت.

## بەشی هەشتەم

تاو و ساو بوو، هەڵمی دوای باران بارین تابلۆیەکی جوانی دروووستکردبوو. سەر زەوی وەک ئاپۆرای تەونی جاڵجاڵووکە نەخشابوو، باران کردبوویەوە تەپۆلکە و کەژ و کێو لە وێنەی ئەسپێکی کەحێل دەچوون، کە دەتڕوانییە شاخەکان ئاهێکت بەدڵدا دەهات. هەر لە خۆتەوە، هەستت بە دڵخۆشی و دڵنیایی دەکرد. ئەو ساتانە چەند شیرینن بیرت بۆ کارێکی نەخوازراو و, ناخۆش ناچێ. لەبەر خۆتەوە گۆرانی دەڵێی، خەنی بوون لە هەستەکانت دایە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەمڕۆ ئەو شادی و خۆشیەم لێ تێک نەچێ. دایکم بۆی گێڕاومەوە دەیگوت: (هەر کاتێ دڵم خۆشبووبێ شتێکی خراپ و ناخۆش ڕوویداوە.)

دەیگوت: (ئەو ڕۆژەی باوکتیان بردوو ڕفاندیان، چەتەئاسا سێبەری ئێمەیان دزی، پێشتر چەند دڵخۆش و خۆشحاڵ بوو، لە شار گەڕابۆوە، چی پێویست بوو لەگەڵ خۆی هێنابووی گوتی: دەمەوێ هاوڕێکانم بانگ بکەم دەبێ خواردنێکی زەریف و شاهانەمان بۆ دروست بکەی، هەرچەند خواردنەکانی تۆ هیچ کات ناخۆش نەبوون, بەڵام دەبێ ئەو بانگهێشتنە تایبەت بێ، کۆبوونەوە لێرە دەکەین، شوێنێکی بێدەنگ و شاراوەیە کەس گومانمان ناخاتە سەر.

ئیدی ناشکوری نەبێ بەوە ڕانەگەیشت باوکتیان بردوو بۆ هەتا هەتایە نەگەڕایەوە. ئەو چیرۆکە هەر لەگەڵ هەستەکانمدا گەورە دەبێ، کە هەست بە دڵخۆشیم دەکەم ساتەکانی ئەو ڕووداوەم دێتەوە بیر و دەشکێم و سەرم نەوی دەکەم و دەڵێم: ئیدی ئەوەیە ژیانی ئێمە، ئەوەیە بیرکردنەوەی حەشیمەتێک کە بێ ئاگان لە وێرانبوونی خۆیان و ملکەچکردن بۆ باوەڕێک کە نامۆیە پێت.)

بە ڕێکخستنی کتێبەکان و تەکاندنی تۆز لەسەر ئەو کتێبانەی سەر مێزەکەوە خەریکبووم، گوێم لە دەنگی تەقەیەک بوو، ڕاچڵەکیم و لە دووکانەکە چوومە دەر، دیتم گۆڕەپانی چەکفرۆشان شڵەژاوەو ڕووی ڕاکردنەکەیان بەرەو ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بوو. خەمی خاڵم بوو، ئەو هێشتا وازی لە گۆڕەپانی چەکفرۆشان نەهێنابوو، هێشتا لەو بازاڕەدا بژێوی ژیانی خۆی پەیدا دەکرد، زۆر جار بە منی دەگوت: کەسی خاڵی نانی حەلاڵ نیعمەتی خوایە، هەردەبێ لێرە خەریکی ئەو ئیشەبم، ڕاستییەکەی بەدڵم نییە، بەلام هیچ ئیشێکی دیم پێ شک نایە دەنا وازم لێیدەهێنا، لە خاڵت کەوێ تۆ مەگەڕێوە بۆ گۆڕەپانی چەکفرۆشان، ئیشی تۆ هیچ نەبێ خاوێنەو پێت شەرم نییە، بەڵکو خزمەتێکی زۆر باشیشە بە وەلاتەکەمان، خاڵم هۆکارو پشتیوانییەکی زۆر چاکبوو. دەمانچە تۆپلییەکەش هەر لایبوو، نەفرۆشابوو، ئەو دۆستەشم هەر چاوەڕوانی فرۆشتنی بوو، کەی بفرۆشێ زوو پارەکەی بۆ بگێڕمەوە، خاڵم لەو ڕۆژانەدا گوتی: یاقووب کەسی خاڵی کەم کەس دەوێرێ خۆ لەو دەمانچەیە بدا، ئەو چەکە وەک

شەیتان وایە، هەر زۆر وریا نەبی دەتەقێ، بۆیە تا ئێستا هەر ماوەتەوە. لەو تەقەیە کەوتمە خەیاڵی خاڵم و دڵم ئۆقرەی نەگرت، وەک پێمبڵێن یەکسەر بە ڕاکردن خۆم گەیاندە گۆڕەپانی چەکفرۆشان، دیتم یەکێک بەدەست خەڵکەکەوەیە، خوێنی لێدەچۆڕێ، جەمەدانییەکەیان لە لاقی ئالاندبوو، تەپڵە سەریم دی دڵم خوورپەی کرد، خاڵم کەچەڵ بوو مووی بەسەریەوە نەمابوو پێشەسەری تەواو ڕووتابۆوە، گوتم: ئای ئەوە خاڵم بەدەست خەڵکەوەیە، خۆم گەیاندێ چوومە پێش، بانگم کرد، گوتم: خاڵە گیان قوربانت بم ئەوە چیت بەسەرهاتووە؟

چاوی هەڵێناو گوتی: «باشم لێت دەپاڕێمەوە خەتای کەس نەبوو، ئەو پیاوە هیچ قسەی پێمەڵێن و زوو بمگەیەننە نەخۆشخانە خوێنێکی زۆرم لێڕۆیشتووە.»

ئەو پیاوی فیشەکەکەی لەدەست دەرچوو بوو هەردووک دەستی خاڵمی گرتبوو دەستەکانی خۆشی شەلاڵی خوێن ببوون لە حیرس و پەرۆشی و شەرمەزاریدا وەسەرخۆی نەهێنا دەستی خۆی پێکاوە، گوتی: «کاکە من بووم بۆ هەمووشتێک بخوازن حازرم، ملم کەچە.»

بەتووڕەیەوە گوتم: «ئاخر بۆچی وات لە خاڵم کرد؟»

هەڵدەلەرزی و ڕەنگی پێنەمابوو، بە خەمباریەوە گوتی: «دەزانم تاوانبارم بەلام ئەو دەمانچەیە خۆی هەر سوارە، منیش ئەو شارەزاییەم نەبوو دەستم پێیداهێناو ڕانی ئەو پیاوە بێچارەیەم پێکا، ئێستاش ملم کەچەو چی دەڵێن وادەکەم، بۆ

هیچ شوێنێک ناچم، لەگەڵ ئێوە دەبم و چیم لێدەکەن ئامادەم.»
خاڵم گوتی: «کوڕی خۆم کەسی خاڵی ئازادی بکە، بشمرم نابێ هیچ قسەیەکی ناخۆش بەو پیاوە بڵێن، ئەو موشتەری دەمانچەکەبوو، ئەوە قەدەرەو ڕووی تێکردووین و دەبێ ددان بەخۆتاندا بگرن، گەر لە خەمی منن ئەو پیاوە با بڕوات و هیچ حەقێکتان لەسەری نییە فیشەکەکە بەر دەستی خۆشی کەوتووە.»

بە هەواڵی بریندار بوونی خاڵم، دایکم هێندە نیگەران بوو لە پێکەوت و قەڵەمی دەست و پێیانی شکا، نەیتوانی دوو هەنگاو بڕوات، ئەو ژنانەی هاوسێمان فریای کەوتن و ڕاستیان کردبۆوە. ئەو ڕۆژە بۆ من کارەسات بوو، دەمگوت: بۆچی ئەو دەمانچەیەم دا بە خاڵم؟! نەدەبوو کاری وام کردبا، بەهەرحاڵ دەستتەنگی و ڕەوشی نالەباری خێزانەکەمان وایدەخواست دەست لە هەموو کوونێک ڕۆکەم، تا سەربەرزانە، ژیان بەڕێ بکەین دەست لەکەس پان نەکەینەوە. کاتێ گوللەکە لە دەستی ئەو پیاوە دەرچوو، بەر دەستی خۆشی کەوت و لاقی ڕاستی خاڵیشم برینداربوو، کاتی برینداربوونی خاڵم، تفەنگێکی سینی و دەمانچەکەشی دزران، خەڵکەکە لەبەر پەلەپەل و مەشغوڵی بریندارەکان، ئاگایان لە وشتانە نەبوو کە بەدەست خاڵم وە بوون، خاڵم زۆرجار لە گۆڕەپانی چەکفرۆشان چەند چەکێکی بەشانیدادەکرد بۆ فرۆشتن، خووڵق و خۆی خۆشبوو لەگەڵ مووشتەرییەکان، زۆر خۆشەویستی خەڵک بوو. ئەو پیاوەی فیشەکی لە دەست دەرچوو، نەمانهێشت لەگەڵمان بێ بۆ هەولێر، هەر لە

نەخۆشخانەی ئۆردووگا ئەویان چارەسەر کرد. ئەو مەترسی لەسەر نەبوو، بەڵام خاڵم مەترسی مردنی لەسەر بوو، لەناوئۆتۆمبێلەکە بوورایەوە، تا گەیەنرایە نەخۆشخانەی ڕزگاری خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیی، هەرزوو نەخۆشخانە لێیان وەرگرتین و بردیان بۆ ژووری نەشتەرگەری، مقۆ مقۆی دکتۆرەکان ئێمەی زۆر نیگەران کرد، ئێمە چەند کەسێک بووین دەگریاین و پەرۆشی و نیگەرانی ئێمە کاریگەری لەسەر دکتۆرەکان دانا، یەکێک لە دکتۆرەکان هات بۆلامان و گوتی: «سوپاس بۆخوا نەخۆشەکەتان لە مردن ڕزگاری بوو، بەڵام بەداخەوە دەبێ لاقی ببڕێتەوە، بەڵام هەوڵی خۆمان دەدەین تا بۆمان بکرێ نەیبڕینەوە، بە ئومێدی خوا سەرکەوت و دەبین.»

دوای چەند کاژمێرێک، دکتۆر هاتەدەر لە سالۆنی نەشتەرگەرییەکە بە دڵخۆشییەوە نزیکبۆوە لێمان و گوتی: «سوپاس بۆخوا سەرکەوتو بووین، لاقی نەخۆشەکەمان نەبڕییەوە، تا چەند ڕۆژی دیکە ئەنجامەکەی دەر دەکەوێ، هیوای باشبوونی بۆ دەخوازم.»

هەموومان لە خۆشیان نەماندەزانی چی بکەین! پەلاماری دەستەکانی دکتۆرم دا تا دەستەکانی ماچ بکەم، خۆی نووشتاندەوە نەیهێشت, دەستی بەسەر سەرم داهێنا، گوتی: «تەنیا ئەرکی پیشەیی خۆم جێبەجێ کردووە، ئێمە لەگەڵ دکتۆرە بەڕێزەکان بە ئەرکی خۆمانی دەزانن، نابێ منەت بەسەر کەسیشدا بکەین.»

هەڵوێستی دکتۆرەکان حەسانەوەیەکی جوانی دەروونی بە ئێمە بەخشی. هێشتا بەنج بەری نەدابوو، دیگوت: «تکایە ئەو پیاوە تاوەنبار نییە، گەردنتان ئازا ناکەم تووشی نیگەرانی بکەن.»

هێشتا هەر خەمی ئەو پیاوەی بوو کە فیشەکەکەی لە دەست دەرچوو بوو. کوڕەکانی خاڵم و منیش بە گریانەوە لەسەر سەری وەستابووین و ئەویش بە ئازارە کانییەوە هەر دەینالاند، نیگەرانییەکی قووڵ ڕووی تێکردبووین.

لە تەنیایی, نەخۆشخانەدا کەوتە خەیاڵ و بیرکرنەوە، دەچۆوە سەر یادگارییەکانی ڕیحان، ئەو ساتانەی ریحانی تێدا ناسیوە. ڕۆچووبووە ناو خەیاڵێکی قووڵ، ڕێکەوت بوو چاوم تێهەڵەنگووت، کەوتمە زەینێکی منداڵانە، سەیر گوێم لە هەستە شێتەکانی ناخم بوو. ئەو بە دیار تێکئاڵانی لاق و لەتەرم و چۆنییەتی ڕۆیشتنی من پێدەکەنی. لە خۆمەوە کەوتمە داوی و بە خۆمم گوت: لەدەست خۆتی مەدە، فرسەتێکەو هاتۆتە پێش. سڵم نەکردەوە دوای کەوتم، خەریک بوو دەبووم بە ساوایەکی گرینۆک و گڕنەم دەگرت و خۆم بە شاقەلەکانیدا هەڵدەواسی، زۆر جار دەکەوتمە ژێر پێیەکانی, ئەو بە ئەسپای پێیەکانی هەڵدەهێناو زامی لە جەستەم درووست نەدەکرد بەڵام دڵ و هەستەکانمی وێران کردبوو. کە دەهاتمەوە سەرخۆ، گاڵتەم بەو کارانەی خۆم دەهات، لە ناخەوە شەرمەزار دەبووم و بەخۆمدا دەشکامەوە! کەسێکی نەدیوو و, نەناس چۆن ئاوا هۆگری بوویت؟ نا, نا چۆن نایناسم، باوکی لەگەڵ باوکی من هاوڕێی یەکتری بوون، چەندەها

یادەوەریم لە دەمی دایکمەوە گوێ لێبووە کە شەوانە باوکی ریحان و باوکی من گۆرانیان گوتووە. ڕەنگە ئەوە جۆرێکبێ لە نەخۆشی، یان بێ عەقڵی و نەفامییە! ئەو هەست و ڕوانینانەم لە بەر خۆمەوە چەند جار دەگوتنەوە، کەسێکی دی لە ناخمدا دەیگوت: گوێ بەوشتانە مەدە، ئەوە عیشقە دەبێ تێیدا سەرگەردان بی، دەبێ لەژێر تریفەی نیگانیدا گۆرانی بڵێی، دەبێ نەهێڵی خوولیاو خەونە ڕۆمانسییەکانت بە زایە بچێ و بیانخنکێنی، خۆت بە ئاگری دڵت بسپێرە، لێ نەگەڕێی ماڵی دڵت وێران بێ. دەکەوتم هەڵدەستامەوە لەبەر قاپی چاوەکانیدا دەبووم بە کۆتەڵێک و سەر مەستانە بەسەر دیدی شێوای مندا دەڕۆیشت و خۆی شلوێ نەدەکرد، لە ڕەنگ و ڕوویدا دەمخوێندەوە دەیەوێت عەزابیم بدات، دەیەوێ چاوی خەمەکانم لای خۆی هەڵبگرێت و بیانخاتە ناو دەستەسرە مەخمەرییەکەی، لێم دەخوێندەوە نایەوێ پێمبڵێ: خۆت ماندوو مەکە، ئەو ڕێگەیە قەرەباڵغ مەکە، ئەو گۆرانیانە خڕبکەوە، ئەو چریکانەی تۆ ناتوانن ببن بە یادەوەری. خۆم هەڵایساند و ڕێگەکەم پتر ئاڵۆزکرد، خۆم لە ژێر تەریقەتی ئەودا تواندەوە، لەبەر دەمی ئەودا دەبووم بە قەترەیەک ئاو، دەبووم بە شوشەیەکی شکاو، دەبووم بە سەفەرێکی ترساو. دەلینگی دەوارە تووڕەکانم گرت و بە گریانەوە گل بوومەوە، سەر ڕوومەتی ئەو نیگایەیی کە ڕایکێشام و پەلکێشی کردووم، بردمیە بەردەمی مەرگێکی نەخوازراو، لە پەنای چرایەکی شێتی دانام، پەروانەی بیرکردنەوە کانم بێ هەدادان بەدەوری شێتیدا دەسووتان. تەنیا ئاورێکی پەرجوویی سەراپا داگیری کردم، هەنگاو بە هەنگاو، نەمدەهێشت سێبەرەکەی ونبێ،

نەمدەهێشت بۆنی هەناسەکانی بەزایە بچن، نەمدەهێشت لەرینەوەی پرچی ڕەدووی (با) بکەوێ، ڕێگەم بەرنەدا بۆ ئەوەی ئەو بخەمە گیرفانی موحیبەتەوە. ڕۆیشتم و سات دوای سات هێزی زیاترم لە ڕۆحم وەردەگرت، قەیدی ناکا ئەو دەنگە دەنووسمەوە، کە لەبن گوێم پێمدەڵێ: (دوا جار سووتەرۆ و خاپەرۆی ئەوینێکی وێران دەبێتەوە بۆ یادگارییەکانت.) ئاخر سووتەرۆی دڵێکی شێت نامرێ درەنگتر دوای ئادەمییەکان دەچێتەوە حزووری مەرگ. ئەو هەر دەڕوات، تەنها ئاوڕێکی تینوو، خشپەی ئەو یارییانەی گاڵ داو لە دامێنی سرووتێکی شیریندا خستی. یاقووب لەو ڕۆژەوە بە دامێنی ئەو نسێیەدا ڕەت دەبێ، کە (ریحان) بە ئاوڕێکی حەزین و نیگایەکی بێ ئاگا، داغان بووە.

ئەو چەند ڕۆژەی لە نەخۆشخانە لای خاڵم بووم، ڕێگەم نەدا هیچ یەکێک لە کوڕەکانی خاڵم لای بمێننەوە، خۆم لە خزمەتی دابووم. خاڵم دوای چەند ڕۆژ هاتبۆوە سەر حاڵ دەیگوت: «چەند نیگەرانم کە بووم بە کێشە بۆ ئێوە، ئاخر بۆ دەبێ هەر تۆ لام بی؟»

گوتم: «(ئەوە ئەرکی منە، من هۆکاری ئەو حاڵەی تۆم، ناهێڵم کەسی دیکە لەلات بێ.»

بە نیگەرانیەوە تیلەی چاوێکی دامێ و گوتی: «حەقی ئەوەت نییە ئەو قسانە دەکەی، ئەوە قەدەرە و هاتۆتە پێش، کەس دەستەڵاتی کارەسات و ڕووداوەکانی نییە هەر دەبوو وابێ.»

لەوێوە لەگەڵ خاڵم کۆک نەبووم، کەوتمە بیرکردنەوەو لێکدانەوەی ئەو ڕوانینەی خاڵم بۆ ژیان، نەمویست بۆچوونی خۆمی پێبڵێم، هەرچەند خاڵم پیاوێکی کراوە بوو، زۆرجار کە ئایەتەکانی قورئانی دەخوێندەوە، ڕامانی بۆ دروست دەبوو، دەیگوت: خەریکە دەکەومە گومانەوە، بۆچی دەبێ مرۆڤ بتوانێ ئەو بۆچوونە پێچەوانیانە ببینێ کە لە کەلامی خودا دا حزووریان هەیە؟ قووڵتر دەچۆ سەر ئەو کتێبانەی کە شەڕ و کوشتن و کێبەرکێی نا ئاقڵانی تێدایە. خاڵم لە گوماندا بوو، بەڵام نەیدەویست ئەو گومان و تێگەیشتنانەی خۆی لای ئێمە بەیان بکا، پێیوابوو نابێ ئەو حەقیقەتانە بڵێ کە ببنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزان و کێبەرکێی من و ئەیوب. خاڵم بۆ ئێمە باوک بوو، تامی سەمەدی چەرمووی دەدا.

زۆر جار خاڵم خەوی لێدەکەوت روخساریم دەهاتە بەر چاو، قسەم لەگەڵ ریحان دەکرد. ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێ کە بە دەسماڵێکی شین و بلوزێکی شینی ئاویت لەبەرکردبوو، لام وابوو ئەوینێک دنەم دەدا بۆ ژیانێکی نوێ، ئەو ڕێگەیەم زۆر خۆش دەویست کە لەڕۆخی و لە دەورو بەریدا دەگلام و بەردەبوومەوە سەر چاوەڕوانییەکانت، دەیان گوڵدانی ڕەنگاو ڕەنگ بە سوانەکان و بە قەراغ برینەکانمدا هەڵواسرابوون. ئیستا چەند ڕۆژێکە بەلای گوڵدانەکاندا نایەم، بەڵام گریانێکم لە پەنا تۆ داناوە، ئۆخژن و چێژێکم لایە خەریکە لە خۆشیان بەردەبمەوە.

هەر ڕۆژێکم لێ بووە بەساڵێک، دەزانم بوویت بە دڵخۆشی دایکم و دڵنەوایی دەدەیتەوە، دایکم لە نامورادییەکی خراپ

دایە، ئەو بۆ تاقە براکەی ڕۆحی دەبێ بە ئاو، بۆ خەمی منیش دۆش داماوە، دایکم سەری لەو هەموو نیگەرانیانە ئەستوور بووە، بەڵام کۆڵ نادا، کاتێ پانتۆڵی پیاوانە لەسەر جلکەکانی هەڵدەکێشی و دێخوونەکەی توووند دەکا دەڵێی خانزادی سۆرانە. دەستەکانی زبر بوون و قڵشی زەحمەت و کوێرەوەرییەکانی کتێبێکن، هیچ فاڵگرەوەیەک ناتوانێ بەرەدەستی دایکم بخوێنێتەوە، ساتێکی کامەرانی لە گیانی دایکم دانییە، ئەو پێکەنینە کانیشی لە قووڵپی گریانەکانیەوە دەرژا. ریحان وەک دیارییەکی جوان بە تەنیشت دایکمەوە، بۆ ئاوەدانی ماڵەکە، بۆ بەشداری گریانەکانی دایکم کەلێنێکی باشی بۆ گرتبووم. ئەو چەند ڕۆژە لە ریحان دوور بووم، کتێبخانەکەم و نووسینی ناو کتێبەکانیشم فەرامۆش کردبوو، دڵم لە تاوی زەردەخەنەکانی ریحاندا خەریکبوو دەتەقی.

# بەشی نۆیەم

ئەو ڕۆژانەی نەخۆشخانە، بەشێکی زۆری نیگەرانی و دڵە ڕاوکێی یاقووب بوو. چەند دەیهێناو دەیبرد لێکی دەدایەوە، بۆی ڕێک نەدەخرا نەیدەتوانی ڕووداوەکان بخوێنێتەوە. بیری دەچۆوە لای دایکی، ئاوا یاداشتی کردبوو: دەمدی دایکم جلکە ڕەشەکانی تۆختر دەبوون و بەدیار توانەوەو چەوسانەوەیەکی ڕۆحیدا دەتلایەوە. زەحمەتەکانی وەک لەوحەیەکی برۆنزی ڕەنگی دەدایەوە. لە لایەکی دی، ریحان وەک ئامانەتێکی شیرین و بە سۆز، لەسەر دڵم دەبوو بەو سێبەرە کە نەمدەتوانی پشوویەکی جاویدانی بدەم. نەمدەهێشت ئەو لە هەستەکانم دەر بکەم، وەک سورەتێکی پیرۆز دەمخستە ناو دەمارەکانمەوە, جووڵە و هەست و نەستم لە ریحان سەرچاوەی دەگرت.

ریحان ڕاستە ئومێدێکی گەورەیە، بەڵام خەمێکیشە کە تەنیا دڵ دەتوانێ وێنای بکا. کە خاڵم بەو ئازارەوە دەبینی، لە پێستی خۆم دەچوومە دەر، لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا تووشی حاڵەتێکی خراپم کردووە. گەر ئەو دەمانچە نەگریسە نەبا، بەو دەردەوە نەیدەناڵاند.

یاقووب ڕووداوەکانی بۆ کۆنەکرانەوە، لێی بڵاو ببوون و پێویستی بە کەسێکی دڵسۆز هەبوو.

دەیگوت: زۆر جاران کە گرفتێک یا کێشەیەکم دەبوو جاران پەنام بۆ خاڵم دەبرد، ئێستا خاڵم لە بەر دەمم کەوتووە، کەلەکە و کەلەکەشی بۆ ناکرێ چوونکە قاچی، زامێکی قووڵی پێوەیە، کوا بەو نەشتەرگەرییە گەورەیەوە دەتوانێ خۆی وەرگێڕێ؟ گوێم لە دەنگی ریحان بوو، مەشغووڵی لێکدانەوەی ئاریشەکانم بووم. ئاخر دەنگی ریحان میقاتی هەستەوەرییەکانم بوو، کە لە ڕاڕەوەکە بوون هێشتا نەگەیشتبوونە ژوورەکەی ئێمە، گوێم لێبوو گوتی: (ئێرەیە دڵنیام ئێرەیە.) دڵم خووڕپەی کرد، ڕاچڵەکیم و هەستم بە حەسانەوەیەک کرد. بەپیر دایکمەوە چووم، ئامێزی بۆ کردمەوە، ڕوومەتم بە فرمێسکەکانی دایکم تەڕ بوو، تەڕاییەک بەر دەمم کەوت و سوێر بوو، گوتم: (ڕەنگە کاری ئەوەی بێ، چەند ڕۆژێکە ئاو بەجەستەم نەکەوتووە هەموو گیانم چڵکن و پیسە.) دەی دایکیشم هەروا دژوێن و ئاڵۆز بوو، لەچکێکی شەدەی ڕەشی بەسەرەوە بوو غەرقی برینەکانی زەمانە و دەردەسەریەکانی بوو، بۆنی قەنەفڵ و ڕیحانی لێدەهات، ئەو مێخەک بەندو و بۆنە سرووشتیانەی دایک هەر لە بۆنی بەهەشت دەچن، کێ هەیە بە بۆنی قەنەفڵ و ڕیحانی بەر پشتێنی دایکی نەخەوتبێ؟ فرمێسکەکانیان بینیم دایکم و ریحان و ئەیوب و برایەکەی ریحان بۆ سەردانی خاڵم هاتبوون، لە شوێنی خۆم وشک بووم، دەستم بەخۆمدا بەردانەوە، تووشی شۆک بووم. دایکم باوەشی بە خاڵم داکر، تێر تێر ڕوومەتە چرچەکانی ماچ کرد، بە گریانێکی حەزینەوە، بە هەستێکی قووڵی بێکەسییەوە گوتی: «بەقووربانی چاوەکانت بم، دەی وا ئێمە هاتووین، چاوەکانتم بۆ هەڵێنە.»

بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ڕووی لە من کردوو گوتی: « ریحان و ئەیوب و برایەکەیشی هاتوون، لەو ڕۆژەوە منیان جێ نەهێشتووە، مەمنوونیانم.»

کە دایکم چاوی لە من بوو، سڵم کردەوە ترسام بڵێ بریندداربوونی خاڵم خەتای تۆ بوو. وام لێکدەدایەوە ئێستا دایکم شڕی جنێوانم دەکا، دەمکا بە پەڕۆی بێ نوێژ. دەمگوت: حەقی خۆیەتی، لە داری دە دونیایە ئەو تاقە برایە شک دەبا، چۆن دەهری نابێ؟ بەو پرسیارانە مێشکم پڕ ببوو، بەڵام زۆر پێچەوانە، دایکم بە خووڵقەتی شیرینی جارانی لە ئامێزی گرتم و گوتی: «ئەمن بە قوربانی تۆبم، کە هێندە بە پەرۆشی خاڵت و هەموومانی.»

دایکم بوو وەک خوێی بەحرەکانی بێروون، سوێری ڕۆندەکەکان هەژاندمی و قووڵپی گریانم دە ئەوکێ ما، نەمتوانی ددان بەخۆم دابگرم و دەمویست وا خۆم نیشان بدەم کە ناکەوم و لەبەر دەمی ریحاندا شەرم دەکەم بگریم! بینیم ریحان، لە ژێر پرچەکانییەوە نیگای خەماوی نیشان دام و چەند دڵۆپ فرمێسکم بە ڕوومەتە کانییەوە بینی، ئەو شەرمی لە ئەیوب دەکرد، برایەکەی بەلاوە ئاسایی بوو، برای ریحان هەموو پەیوەندیەکانی ئێمەی دەزانی بەڵام زۆر خۆی لەو باسە نەدەدا، دەیزانی نیەتمان خاوێنە، بەیەکەوە لە حیزب دا کارمان دەکرد، ئێمە لەوە گەیشتبووین کە خۆشەویستی پاک یاساغ نییە و ئەو حیزبەی ئێمەی کارمان تێدا دەکرد ئەو ئاریشانەی چارەسەر کردبوو. ئەیوب وەک برا گەورەیەک بە تۆنێکی نەرم و لە سەرخۆ هاتە پێش، ڕووی لە من و لە خاڵم

کردوو گوتی: «بەئومێدی خوا باش دەبی و خوای گەورە گوناهەکانت بۆ پاک بکاتەوە. ئیدی ئەوە قەدەری خوابوو دەبوایە هەر بەو شێوەیە بێ.»

من و ریحان و برایەکەی سەیری یەکتریمان کردوو لە یەکتری حاڵی بووین، بەڵام گرفتێکمان نەبوو، هیچ خۆمان لەوباسە نەدا، نەمانهێشت ئەیوب هەست بەهیچ بکا. خاڵم بە دڵخۆشییەوە چاوی بە هەمووماندا دەگێڕا، بە دەنگێکی نووساو حەزینەوە گوتی: «دڵم خۆش بوو بە هاتنتان توخوا بۆچی ئەو زەحمەتەتان کێشا، ئەیوب گیان سوپاس بۆخوا کە بە سەری کردووینەوە، ئێوە نیگەران مەبن زۆر باشم، دوێنێش کوڕەکان وماڵەوە لێرە بوون، بە ئەوانیشم گوتووە، ئەو پیاوەی دەمانچەکەی لە دەست دەرچووە نەچن نیگەرانی بکەن، ئەیوب گیان بە تۆش دەڵێم ئەو پیاوە پێویستی بە دڵدانەوەیە با نیگەران نەبێ.»

لە ژێر لێویەوە ریحان پێیگوتم: «کەی دێیتەوە؟»

بە دڵتەنگییەوە، ملم بەلای چەپ دا لارکردەوە لێوم بۆ خوارکرد، تێمگەیاند ڕەنگە ئەو هەفتەیە دکتۆرەکان ئیزنمان بدەنەوە، برایەکەی ریحان لە ئێمە باشتر لە ئاماژەکانم گەیشت ڕووی تێکردم گوتی: «هاوڕێ داوات لێدەکەم با من لێرەبم، تۆ بچۆوە پشوویەک بدە.»

گوتم: «نەمهێشتووە کوڕەکانی خاڵیشم لێرەبن، زۆر سپاس خۆم لە خزمەتی دادەبم، زەحمەتتان کێشا ئێمە لەو هەفتەیەدا

ئیزن دەدرێینەوە، دکتۆرەکان پێیان ڕاگەیاندین کە حاڵی بەرەو باشی دەچێ، چەند ڕۆژی دی دەڕۆنەوە.» .

یاقووب دەیویست سەر زەنشتی خۆی بکات، چۆن لەو ساتە ناهەموارەدا، ئەوین و ئەویینداری جێگەی دەبێتەوە، زۆر پەرش و ناجێگیر بوو، وای لە دەفتەری ڕۆژانەی خۆیدا نووسیبووی:

ساتێکی ئاڵۆز و پڕ هەستیار، لە نێوان دوو هەڵوێست دا خۆم دیتەوە. پێموابوو دەبێ جۆرێکیدی لەگەڵ ریحان هەڵس و کەوتم کردبا، ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان حاڵی بوون کە چەندە هۆگری ریحانم. دایکم دەیزانی بەڵام تا ئەوساتەش نەمهێشتبوو ئەیوب بەو پەیوەندییەی لەگەڵ ریحانم هەیە هەست پێ بکا. لە چاوانیم خوێندەوە کە دەمەوێ چیبکەم، نیگایەکی دایە من و گوتی: زۆر باشت کرد خاڵم بەجێ ناهێڵی، تۆ نیگەرانی دایکم و هیچ شتێک مەبە، تەنیایان ناکەم و جێیان ناهێڵم، کتێبخانەکەش کراوەیە، هاوڕێکەت سڵاوی هەبوو بۆت. گرێیەک لە ئاخاوتنەکەی ئەیوب دا هەبوو، گوتی: نیگەرانی هیچ مەبە. ئەوەم کەوتەوە یاد کە چۆن ڕێگەی بەردەرگەی ماڵی ریحان بووە بە یادگارییەکی نازدار، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: هەبێ و نەبێ هەستی بەو خۆشەویستییەی ئێمە کردووە! دەی بزانێ خۆ من کارێکی خراپ ناکەم دەمەوێ لەگەڵ هەموویان ڕاستگۆ بم، کارێک ناکەم هاوڕێکانیشم لێم نیگەران بن. تێگەیشتنی ئەیوب، لەو پەیوەندیەی من و ریحان، تۆزێک سەخت بوو، ئەو پیاوێکی دیندار و لە خوا ترس، ڕەنگە وای بخوێنێتەوە کە بیروو باوەڕی ئێمە ئاوایە ناپرینگێینەوە لە کاری بەد ڕەوشتی. بەڵام بەوە دڵخۆشی خۆم دەدایەوە، تا

هەرگیز ئەیوبی برام هەڵویستی نا بە جێی نەبووە، ڕاستە ئاسمان و ڕێسمانمان جیاواز بوو، هەر یەکەمان بە ڕێگەیەکدا دەڕۆین و هیچمان ناچینە ناو بابەتی یەکترییەوە. بە یەکەوە هەوڵمان داوە، ئەو ڕێزە ڕابگرین, دایکیشم هەمیشە هاوکارێکی باش بووە. دەی ئاخر ناحەقم نەبوو، هێندە هەستم بە تەنیایی دەکرد، سەری کێوانم لێ وێکهاتبوو، دەتگوت لە بن دارێکم شتاقە گەڵای پێوە نییە، داریان لە ڕۆحی داوم، لە فکران ڕاچوو بووم و خەریکی ڕێگە چارەیەک بووم. بەغەمگینییەوە دایکم تیمڕاماو گوتی: «هەر ڕەنگت لە بەر نەماوە، بابی بابم، خۆت دڵ توونە مەکە گەلێک حاڵەتی خراپترو ناخۆشترم هاتۆتە ڕێگە، بەڵام دەستم بە خۆمدا بەرنەداونەوە، دەبێ چاوێک لە دایکی خۆت بکەی.»

دەستی لە مل کردم و تێر ماچی کردم: «گەر لێرەبم بۆ تۆش باش دەبێ.»

گوتم: «دایە گیان یاسای نەخۆشخانە ڕێگە نادەن دووکەس لای نەخۆش بێ، ئەوجار تۆ دەبێ بچیتەوە، ئێوە نیگەرانی من مەبن.»

پێش ئەوەی دەستم لێ بەر بدا، گوتی: «باشە دەڕۆینەوە، بەڵام بەڵێنم پێبدە کە خەم لە هیچ شتێک نەخۆی.»

خەم بە هیچ نەخۆم زۆر نالۆژیکییە، لەگەڵ هەر چاوێکی ڕۆیشتووی ریحان، دەڕۆم و ناهێڵم ئەو نیگایانە بزر بن، ناهێڵم سۆزی دەروێشانەم بەربێتەوە ناو دەریا، خنکانی ئەوینی ریحان هەڵکەندنی ڕیشەی هەموو ژیانمە. لەبەر

خۆمەوەدەمگوت: دایە گەلێک غەمگینم و ئاسان نییە خەم نەمگریەنێ، ئاسان نییە ساتەکانی ئەوینم بۆ ریحان لە یاد بکەم، خەمی هەمووتان دەخۆم، خۆ تۆ دەزانی لەو ڕۆژەوە هەستم بەوە کردووە دەبێ خەمخۆرێکی جددی بم و نەهێڵم ئەو ماڵە کوێر بێتەوە، خەمم خواردووە بێ خەم نەبووم، ئێستا دەزانم لە هاتنتان بۆ ئێرە پارەتان پێ نەبووە قەرزتان کردووە. دایە خەمی ئێوە، خەمی خاڵم، خەمی ریحان خەمی هەموو ئەو ئاریشانەی دێنە پێش خەمی منن. هەوڵم دا ددان بە خۆم دابگرم و وای نیشان نەدەم کە باری سەرشانم گرانە، بە پێکەنینێکی هەڵخەڵەتێنەرانە ڕووم تێکردن گوتم: «دڵنیا بن چۆنی دەتانەوێ وا دەبم.»

ریحان وەک من بیری دەکردەوە، ئەویش حەزی دەکرد بچمەوە، بەڵام زۆر ژیرانە گوتی: «ئەوەی تۆ دەیکەی کارێکی زۆر باشە، ئێمە بەڵێنت پێ دەدەین دایە خەجێ جێ نەهێڵین، چی بە ئێمە بکرێ دەیکەین خۆت هەراسان مەکە.»

تیلەی چاوێکی دامێ و تێیگەیشتم کە دەبێ خۆ ڕاگرم. دەمگوت: ئەو چەند ڕۆژە چییە قابیلە خۆ زیندان نییە، دەی با زیندان بێ خۆ دونیا وێران نابێ، گرنگ ئەوەیە هێز بدمە بەرخۆم و پێ بنێم بەسەر هەموو ئەو نیگەرانیانە و لێیان حاڵی بکەم کە کێشەیەکم نییە.

ئیزنم دان و ڕۆیشتنەوە، وەک پەرجوویەک وێنە و هەڵسووکەوتی ریحانم لە بەر چاولا نە دەچوو. چووم بۆ سەر دەستشۆری دەستم شوشت و ئاوێکم بە دەم و چاوم داکرد، دەستێکی تەڕم بە سەرو پرچم دا هێنا، سەرم هێندە چەور

بوو بۆگەنی کردبوو. خۆم لە ئاوێنەکەدا بینی، دایکم ڕاستی دەکرد، دەتگو ڕە نگی مردوانم لێنیشتووە، سەر ڕوومەتم لە چلک و ئارەقەدا غەرق ببوو، لە بەر خۆمەوە دەمگوت: ریحان کوێی منی کەوتۆتە بەردڵ؟ خۆزگە ریحان ئاوای نەبینیبام، ئەو ڕۆژانەی یەکترمان دەبینی سەرو پرچێکی خاوێن، جلکێکی جوان و پێڵاوێکی شایەستە، ئێستا لەگەڵ ئەوکات ئەرز و ئاسمانم جیاوازە. دڵی خۆم بە قسەی دایکم دەدایەوە، دەیگوت: ڕۆڵە کەچەڵ لە قوڕێشدا بێ هەر ئی شیرینە. ئەوە بۆ عاشق و مەعشووق درووستە، بەڵام پرسیارەکە لێرە دایە! بەخۆم دەگوت: پێتوایە ریحان جگە لەمن کەسێکی دیکەی لە ژیان دانییە؟ ئیرەییم دەکرد، کە ریحان دڵخوازێکی دیکەی هەبێ، یان گەر بەو پیس و پۆخڵیە منی دیتووە لە هەموو ئەو بەڵێن و قەرارانەی داومانن ژەوان دەبێتەوە. ڕەنگە بەزەیی پێمدابێتەوە، ،بڵێ ئەوانە جێگەی بەزەیی و دڵدانەوەن، باوکیان ون بووە و بێ گۆڕیشە، دایکێکی زەحمەتکێش و ڕووت و ڕەجاڵ، لەدەم و چاویاندا دەیان کارەسات دەخوێنیتەوە. ئاخر ئەو حاڵەتانەم هەمووی دەبینی لە گوزەرانی ماڵی خۆماندا، جگە لە خاڵم هیچ کەسێکی دیکەمان نەبوو، بۆیە کە دایکم هەواڵی برینداربوونی خاڵمی زانیبوو، هەردووک چەپۆکی بەخۆی دادابوو گوتبووی: ئەی سەڵاو قەت کەسم نەما، چاوی خوشکت کوێربێ، پشتوو پەنای هەموومان بووی. ڕەنگە ریحان کە گوێی لەو سرووتەی دایکم بوبێ زیاتر ئەو حەقیقەتەی بۆ دەر کەوتبێ، کە خێزانێکی بێ کەس و بێ دەرین. بە هەزاران چیرۆکی لەو وێنەیەم دا تاشیبوو، ئەوەم زۆر پێناخۆش بوو، بەزەیی پێدا هاتنەوە وەک نەریتێکی کەمی

و  بێ هێزیم تەماشا دەکرد. بەڵام لە دەم و چاوی ریحاندا، جگە لە موحیبەت و سۆز شتێکیدیم نەخوێندەوە، کەچی کە سەیری خۆم دەکرد لە ئاوێنەکە، ئەو گومان و دڵەخوورپەیەم بۆ درووست دەبوو. هاتمەوە  ژوورەکەی خاڵم و بینیم خاڵم چۆتە خەوێکی قووڵ، دەیبزرکاند و دەیگوت: «بەڵێ لەگەڵ یاقووب بەیەکەوەین تۆ بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ ئەی تۆ بزربیووی، ئێستا لای هەموان تۆ مردوویت و تەنیا ئەوەیە گۆڕەکەت پێ نازانین!»

به گریانەوە گوتی: «تکایە مەڕۆوە لەگەڵ ئێمە وەرەوە سەیری یاقووب بکە دەڵێی پیاوێکی تەواوە، بەژنی داری خەنەیە. ئەوە کوڕی تۆیە ، تکایە مەڕۆ.» حاڵی بووم لە خەون دایە، بابم لایەتی و نەمویست خەونەکەی لە بار بەرم، تا لەوە حاڵی بووم دەستی بۆ بڵیند کردوو گوتی: «خوات لەگەڵ.»

# بەشی دەیەم

دوای یەک مانگ، لە نەخۆشخانە ئیزن درایینەوە. ئەو ڕۆژەی هاوڕێیەکی خۆم ئۆتۆمبێلی مەقەڕی هێنا، بە هەردووکمان چووبووینە بن هەنگڵی خاڵم، تا بردمانە ناو ئۆتۆمۆبیلەکە. ڕێکەوتێکی جوان بوو، ئەو هاوڕێیەم بۆ سەردانی ئێمە هاتبوو. دکتۆر هاتە لامان و بە پێکەنینەوە بە خاڵمی گوت: هیچ کێشەیەکت نەماوە، تەواو لە مەترسییەکان دەرچووی، ئەمڕۆ دەڕۆیتەوە دوعای بە خێرمان بۆ بکە. ئەو هەواڵەم زۆر بە لاوە خۆش بوو. هاوڕێ چاوێکی لێکردم و گوتی: لەوە باشتر نابێ خۆم و ئۆتۆمۆبیلەکە لە خزمەتتان داین، پێویست ناکا کەس ئاگادار بکەن، من دەتانبەمەوە. زۆر سوپاسی هەڵوێستی هاوڕێکەم کردوو خاڵم بە تۆنێکی حەزین و پڕ لە خۆشەویستییەوە گوتی: یاقووب چەند هاوڕێی باشت هەن، ئەوە خدری زیندە بوو، ئەو هاوڕێیەت فریشتەی خودایە. هێندەی پێخۆشبوو شایی لە دڵیدا دەگەڕا. هاوڕێیەکەم گوتی: مامۆستای ئازیز من و هاوڕێم یاقووب جیاوازییەکمان نییە، من بە ئەرکی خۆمی دەزانم و هیچ منەتێکیشی تێدا نییە،ماڵی هاوڕێیان بۆ هەموومان وەک یەکە ئێوەش کەمتان نەکردووە. ئاخر ئەو هەڵوێستە بۆ من زۆر خۆش بوو، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: چەند سەر بەرزییە بۆ من، لە ماڵەوە دایکم و ئەیوب ئەوە بەگرنگ دەزانن، ڕێگە بۆ من ئاسایی تر دەبێ زیاتر بچمە ناو کایەی سیاسی. نزیکبوونەوەم لە حیزب، بەشێکی زۆری گرتنی ڕێگەی بابم بوو، ریحانش زیاتر هۆکارەکە بەردەوامیم

زیاتر بێ، زۆر جار هاوڕێکانم پێم دەڵێن: تۆ بەروو پشتت ئەتڵەسی، واتا تۆ بابیشت هەر لەو ڕێگەیەدا گیانی سپاردووە بە سەنگینی و ڕێزەوە سەیری خێزانی ئێوە دەکرێ. ڕوانین و تێگەیشتنی ئەو هاوڕێیانەم بۆ من فەرامۆشی و سەربەرزی بوو، بۆ من زۆر ئاسایی بوو هەر داخوازییەکم هەبا بە پێی دەستڕۆیشتنیان دریغیان نەدەکرد، دەیانگوت: هەرچەند سەمەدی چەرموو لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق بوو، بەڵام بۆ ئێمەی کۆمۆنیست، ئەو جیاوازییە نابینین، ئەو وەک مرۆڤێکی حەقخوازو تێکۆشەر بەدەستی بۆرژواو نەتەوەپەرستەکانەوە گیانی بەخشیوە، بۆ ئێمە جێگەی ڕێز و تەقدیرە. ئاخر هەستیشیان بەوە کردبوو، من دۆستایەتییەکی پتەوم لەگەڵ حیزبەکەی بابم هەیە، ئەوان بە لێپرسراوەتییەوە دەیانڕوانییە پێگە و مامەڵەکردنم لەگەڵ هاوڕێیانی شیوعی. ریحانش و برایەکەشی وەک من خێزانێکی شیوعی بوون، بەڵام کاری ڕێکخراوەیی و سیاسییان لەگەڵ هاوڕێیانی حیزبی کۆمۆنیست بوو، لە بەینی کۆمۆنیستەکان و حیزبی شیوعی دا، دەخولامەوە. حیزبەکەی بابم، وەک میرات و بە جێمانی یادگارییەکانی بۆ ئێمە جێگەی هەڵوەستە کردن بوو. هاوڕێیانی کۆمۆنیستیش بەشێکی زۆریان لە هەستەوەرییەکانم داگیر کردووە، ئیدی ئەوە بۆ من هەمیشە وەک دووڕیانێک دەبینرا. ئەوانەی دڕدۆنگ و قەلەقن ناتوانن ئاسوودە بن، چەند هۆکارێک هەن بۆ ئەو حاڵەتە. بەشی یەکەمی دەگەڕێتەوە سەر دەورو بەرو پەروەردە، لە کاتێکدا ئاستی تێگەیشتن و فەراهەم کردن لە ناوەند دابێ، تاکیش وەک ئەو دەوروبەرە کاریگەری لەسەر دەبێ، بەدەر نییە لەو

ئاڵوگۆڕو ڕووداوانەی دێنە پێش. وەختێ سەمەدی چەرموو دەچووە قوڕگی شێر بۆ دادگەری، ڕەنگە کەسانێک خەریکی تەسلیمبوون و خۆ بەدەستەوەدان بوون، هیچ خەمی دادپەروەری و دونیایەکی جوانتریان نەبێ. بابم، مۆرکی ڕووتانەوە و نابوود کردنی ئاغا و دەرەبەگ و سیستەمی پاوانخوازیبوو، دایکم بەو نە خوێندەوارییەی خۆیەوە، هەمیشە سەری بەرز و پڕ شەهامەت بوو.

وەختێ باوکم شوێن بزر بوو، ئاغا کان هەواڵیان بۆ دایکم ناردبوو، گەر بتوانێ نان بۆ بارەگای حیزب بکا، مووچەی تەواوی بۆ دەبڕینەوە، ناهێڵین بێ مێردی پێوە دیار بێ، دایکم لە وەڵامی حیزب و دەرەبەگەکاندا گوتبووی: غەڵەت دەکەن بەبەر دەرگاکەشم دادبێن، ڕۆژێکم مابێ بۆ بکوژانی سەمەدی چەرمووم ماوە، چۆن ئەو ڕۆژەم لە یاد دەچێ، لەسەر مەزراو تووتن و چوارادخ دا، ئێمەیان وەک پۆڕی خوراو لێکرد، مەحاڵە بتوانم خیانەت بە پیاوێک بکەم، گیانی بەخشیوە، ڕۆژێک خۆشی نەدیوە، تا ئەو هەبوو بە ڕاستگۆیی و دڵخاوێنی ژیا، بڕۆن بەر نەفرەتی خودا بکەون. وەختێک، ئەو پەیامە گەیشتەوە بە کار بەدەستانی شۆڕش و ئەو دەرەبەگانەی لە ڕێزی ئەو پارتە دابوون، بەشێکیان شڵەژان و نیگەران بوون، زەحمەت پێیان قبووڵ دەکرا، ئەو دەرەبەگانە لووتی جوتیارێکیان بڕیبوو، فێر ببوون کلکی کەری جوتیارەکانیان دەبڕی، فەرهەنگی دەرەبەگ و دەرهاویشتەی ئەو جووڵانەوەیە سەقەتە بوو، کە جووڵانەوەکە ئەوەندەی پشتگیری دەرەبەگ و بۆرژواکان بوو نیو ئەوەندە ماکی

شۆڕشگێڕی و نیشتیمان پەروەری تێدا نەبوو. دایکم هەڵقوولاوی ئەو دەورو بەرە بوو، چەندان شەو کۆبوونەوە لە ماڵی ئەو داکراوە، هیچ کاتێ نەخەجڵیوە، گومانی نەکردووە هاوڕێکانی سەمەدی چەرموو خیانەتکار و پیاوی خراپ بن، هەوڵیشی داوە، هەردووک کوڕەکەی بەو پەرەوەردەیە پەروەردە بکا. من نەمتوانی خەون و خەیاڵی دایکم و چاوەڕوانی بابم لە بیربکەم، زۆرێک لە هاوڕێ و دۆستەکانم لەگەڵ ئەو حیزب و گرووپانە بوون کە دایە و ئێمەش چارەمان نەدەویستن، بەڵام ئەو هاوڕێیانەمان خۆش دەویستن، کەسانێکی شیرین بوون، بەڵام لە گفتوو گۆ و قسەکانماندا ڕۆژانە لەیەکتری هەڵدەبەزینەوە، لە قسەکانیان نیگەران دەبووم، بەڵام ئەوان هەمیشە دڵی ئێمەیان دەویست و لەوە حاڵی ببوون کە ئێمە خێزانێکی غەدر لێکراوین، بیرم دەکردەوە، ناتوانم ئەو موحیبەت و پشتیوانییە لە یاد بکەم. ئەو پایە و مێژووەی بابم وەک نەخشی بەرد، لە بیرکردنەوەمدا جێگیر بوو، بەڵام تێگەیشتنم بۆ ئایدیاو بیرووباوەڕی چەپ جیاوازی هەبوو لەگەڵ ڕێگەی بابم، بابم و ڕێبازەکەی بڕێک لەگەڵ بۆچوونی من جیاوازی هەبوو، بەڵام هۆگربوونم بۆ موحیبەت و دەستگیرۆیی هاوڕێیانی بابم مکوڕتری دەکردم و ئەو ڕێبازەم خۆشتر دەویست، سەرەڕای ئەو ناشیرینەی کارەکتەرەکانی، بۆمن وەک پاڵپشتیەکی پیرۆز وابوو.

ڕۆژەکەی سارد بوو، بەڵام زۆر بە دڵخۆشی گەڕاینەوە ڕێگەو بان بەستبووی، لە ڕێگە بەو هاوڕێیەم دەگوت: (پەلە مەکە،

هەموو جارێ دایکم دەیگوت: دوور بڕۆ سەلامەت بگەڕیوە. پێموابوو بە هێواشی بڕۆین زۆر زۆر نیو کاژمێر درەنگتر دەگەینەوە، زۆر جار کە سەیارەکە لە تاسەی دەدا خالم ئاهێکی هەڵدەکێشاو لەبەر ئێمەش دەنگی بەرز نەدەکرد، بە هێواشی نووزەیەکی دەهات و دەربڕینێکی هێواش و بەلام ئازار بەخش، کە گەیشتینەوە ماڵی خاڵم بەلایەنەوە سەیر بوو! کەسمان ئاگادار نەکردبوو ئەمڕۆ دەگەڕێینەوە، وا بڕیاریش بوو لەو هەفتەیەدا بێن سەردانمان بکەن و نۆبەتم لەگەڵ بکەن، هەرچەند بە هیچ شێوەیەک قەبووڵم نەبوو جگە لە خۆم کەس لای بمێنێتەوە. پەیوەندی من و خاڵم، وەک خاڵ و خوارزایەتیش نەبوو، پەیوەندییەکی قووڵ و پڕ لە خۆشەویستی بوو، گرێی دڵی خۆی بۆ باس دەکردم، هەندێک حاڵەتی نهێنی و سەرنج ڕاکێشی بۆ دەگێڕامەوە. متمانەی زۆری بەمن بوو. جارێکیان لە بیرم ناچێتەوە گوتی: لەگەڵ بابی ڕەحمەتیت زۆر حەزمان لە شایی و هەڵپەڕکێ بوو، شەوێکیان لەو گوندەی دراوسێمان کە دووری نێوان گوندی ئێمەو ئەو گوندە کاتژمێرێک بوو، کات دووی شەو بوو گوێم لە دەنگی دەهۆڵ بوو، بابی تۆم لە خەو هەستان ڕۆیشتووین بە پیر دەنگی دەهۆڵەوە، هەرچەند بابت دەیگوت: دەنگی هیچ نایە! دەیگوت: کاکە وەڵا گوێت دەزرینگێنەوە، منیش دەمگوت: (ئەوە دەترسی دەنا چ قەیدییە دەچین گەر شایی بوو گەڕێک شایی دەگرین و دەگەڕێینەوە.) بابیشت دەیگوت: (بەو نیوەشەوە شایی چی و حاڵی چی، دڵی تۆم دەوێ دەنا بڕوات بێ دەنگی تەپۆش نایە نەک دەهۆڵ.) دەیگوت: (کە چووینە ناو گوندی چی سەگی گوندی هەبوو دەورەیان داین، بە حاڵە حاڵ

دەرباز بووین.) ئیدی خاڵم وەک برادەرو هاوڕێ سەیری دەکردم، بۆ خۆم حەزم دەکرد لای بمێنمەوە. کە خاوێنم دەکردەوە زەردەیەکی دەهاتێ و دەیگوت: بە کەیفی خۆت گەڵ و گونم دەبینی، بێ دەستەلاتم و هیچ چارەیەکم نییە، باشییەکەی لەوەی دایە تۆ لای منی دەنا بڕوات بێ شەرم دەکەم بەو حاڵە. ماڵیان گەرم کردبوو کتری لەسەر سۆبەی دەکولا، هێندەی نە خەیاند دایکم هاتِ و تێر تێر گریا، فرمێسکی ئۆخژنی دەڕشت و زۆری پێخۆش بوو. چەند باوەشێکی حەزین و پڕ برینی بە خاڵم داکرد و گوتی: «باش بوو خوایە گیان بێ کەس و کارت نەکردم، لە دونیای ڕوون ئەو تاقە برایە شک دەبەم، تۆم بۆ بمێنی هەموو دونیا هی منە، ئاخر دوای بزربوون و نەمانی سەمەد هەموو پشت و پەناو ئومێدی کوڕەکانم و من بووی!»

وردە وردە دەرو دراوسێ هاتن و ماڵی خاڵم جمەی دەهات، کەچکێ قوڵەی تێ نەدەچوو، هەر بابا بوو زوو خۆی بگەیەنێتە خاڵم، ئەو پیاوانەی ڕۆژانە لەگەڵ خاڵم لە گۆڕەپانی چەکفرۆشی مامەڵەیان پێکەوە دەکرد، دەستە دەستە دەهاتن بۆ هەواڵ پرسین. ئەو پیاوەی دەمانچەکەشی لەدەست دەرچوو، هێشتا لەفافی لە دەستی نەکردبۆوە، ریشێکی ماش و برینجی، چڵکن، یەخەی کراسەکەی توێخێکی چڵک لەسەر کەوتبوو، خۆی خزاندە لای خاڵم ویستی دەستی ماچ بکا، پەلاماری دا خاڵم قبووڵی نەبوو، گریا فرمێسک بە چاوەکانی دا هاتەخوار گوتی: «هەرگیز لەخۆم خۆش نابم، چیبکەم ئەوە قەدەری خوا بوو توخوا مامۆستا گەردنم ئازا بکە!»

ئەو خەڵکە هەموویان تووشی سەرسوڕمان بوون، بینییان خاڵم و ئەو پیاوەی دەمانچەکەی لەدەست دەرچوو بوو، پێکدا دەگرییان. خاڵم بە سۆز و غەریبی ئەو پیاوە تەواو داڕما، پێیگوت: «تکا دەکەم خۆت مەخە ئەو حاڵەوە بەرگە ناگرم، تۆ هیچ تاوانێکت نییە، ئەوەتا زۆر باشم، سوپاس بۆ ئەو هەموو خۆشەویستییەی خەڵک، مادام ئێوە دەبینم بەو دڵسۆزییەوە، من تەواو باشم بڕواتان بێ لە خۆشی هاتنی ئەو هەموو دۆستانە هیچ جێم لە جێیان نییە، تۆش گەردنت ئازادبێ.»

ئەو قسانەی خاڵم بەس نەبوون بۆ سوکنایی و دڵنەوایی کابرا، ئەو پیاوە پێیوابوو گوناهێکی گەورە و تاوانێکی خراپی ئەنجام داوە. لێک، لێک ئارەقەی دەسڕی و شەرمی دەکرد، وای خۆ دەهاتە بەرچاو لە بەردەم دادگا وەستاوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکەن. خاڵم بە ڕاوێژێکی نەرم گوتی: «دەستت چۆنە؟ هەر لەکاتی برینداربوونیشم بە هەموویانم گوتووە، تۆ ئازاد بکەن کەس لە گوڵ کاڵترت پێ نەڵێت.»

پیاوەکەش بەشەرمەوە، سەری دەبەر خۆی نابوو وەڵامی دایەوە گوتی: «سوپاس بۆ خوا زۆر باشم، خۆزگە فیشەکەکە بەر سەرم کەوتبا بەڵام بەر تۆ نەکەوتبا.»

خاڵم نیگەران بوو ڕووی تێکردوو گوتی: «تکایە ئەو خەمە لە سەری خۆت دەربهێنە بەو هەڵسوکەوتەی تۆ تەواو قالبم دادەهێزێ، ئەوە نییە زۆر باشم و هیچ کێشەیەکم نەماوە، گەر حاڵم خراپ با دکتۆر نەیدەهێشت بێمەوە ماڵێ.»

## بەشی یازدەم

دایکم لەگەڵ دایکی ریحان لە بێڵایەکە دانیشتبوون، ریحان و کچە خاڵەکەشم، سەرگەرمی چالێنان و کاری چێشتخانە بوون، منیش زۆر چڵکن و بێحاڵ بووم، یارمەتیم لە ئەیوبی برام و کورەکانی خاڵم وەرگرت، بچمەوە خۆم بشۆم و تۆزێک ڕوویی ناو مەجلیسم هەبێ. دیقەتم دایە ریحان، تیلەی چاوی دابووە من، دەیویست، پێم بڵێ: جارێ مەڕۆ، ئاخر ئەو ماوەیە زۆر هەستم بە تەنیایی دەکرد، ساتەکانم بژاردوون، حەز دەکەم باوەشت پێدا بکەم. ئەوە هەر ریحان نەبوو کەوتبووە ئەو حاڵەتەوە، منیش وەک مەنجەڵ دەکولام، لە ناو خۆمدا ورد ورد ببووم. ئەو ماوەیە توانیم ئەزموونێک و وانەیەک بۆ ژیانم ببینم، ئەو قسەیی دایکم دەهاتەوە بیر کە تەنگانەیەک پەیدا دەبوو، ڕوویی تێ دەکردین و دەیگوت: سەبر کلیلی ڕەحمەتە، تەنگانان بەریان کورتە، بۆیە بۆ گرفتەکان ددانم بەخۆم دادەگرت. ئەو ئیشانەی کە بۆ خیزانەکەمان دەهاتنە پێش، نەمدەهێشت ئەیوب تخوونییان بکەوێ، خۆم ڕەپێش دەخست، ئەیوب هەموو جارێ دەیگوت: تۆ خەریکە پێی لێهەڵببڕی، ڕەنگە دایکم وا بزانێ من خۆم دەدزمەوە. نەمدەویست دمبەدمە لەگەڵ بکەم، بە پێکەنینەوە دەمگوت: بۆ مەگەر ڕێزگرتن و هاوکاری کردنی دایە و تۆ پێ لێهەڵبڕینە؟ بەو وەڵامە شەرمی دەکرد و هەستم دەکرد سەرزەنشتی خۆی دەکرد، بە بێ تاقەتییەوە جێی دەهێشتم. بە ئاماژەیەکی

هاوڕێیانە ریحانم حاڵی کرد وا پێویست دەکا بچم خۆم بشوم و دوایی دەگەڕێمەوە.

چووم بە دایکم گوت: «دەچم خۆم دەشۆم؟» دایکم هەستاو بەدەنگێکی نەرم. گوتی: «کە هاتم تەباخم خستۆتە ژێر بەرمیلەکە ئێستا بە دڵنیاییەوە باش گەرم بووە، ئاگات لە خۆت بێ ڕۆژەکە زۆر ساردە، جوان خۆت وشک بکەوە، پێمخۆشە پشوویەک بدەی ئەوە کاکت و کوڕەکان هەموویان لێرەن، خەمی ئێرەت نەبێ، دەزانم جەرگم پێتانەوە ڕەش بووە بەقسەم ناکەن.»

ڕووی لە دایکی ریحان کرد، گوتی: «یاقووب هەموو بەیانییەک دەبێ کترییەک ئاوی بۆ گەرم بکەم، بێ سەر شووشتن ناچێتە دووکان، ئەوەندەی پێیدەڵێم هەر بە قسەی خۆی دەکا.»

وامزانی لەگەڵ دایکی ریحان باسی من دەکا، ڕامام! بیرم کردەوە، ئەوە دایکم دەیەوێ، سکاڵا لای دایکی ریحان بکا، گوتم: «دایە بێخەمبە چۆنی بتەوێ ئاوا دەکەم.»

ڕۆیشتم نیگا و تەماشەکردنی ریحان، زەمەنێکی جوان و وروژێنەری درووست کرد، دەتگوت یەکەم ڕۆژە ریحانم بینیوە دڵم ئۆقرەی نەبوو، ڕەنگە دە جار ئاوڕم دابێتەوە، داسەکنینم نەبوو، هێندە دڵم بەو قەرەباڵغییە خۆش بوو حەزم لێ نەبوو جێیبهێڵم، بەڵام هێندە دژوێن بووم بێزم لە خۆم دەکردەوە. ددانم بە خۆم داگرت، لێوی خۆم گەست و بە زەردەخەنەیەکی شاراوا گوتم، دەڕۆم و خۆم دەشۆم و

دەگەڕیمەوە. وەختی ڕۆیشتن چەند میوانی دیکە هاتن نەگەڕامەوە سەریان، تیژ ڕۆیشتم تا ماڵی گیرنەبووم، گەیشتمەوە کلیلی دەرگای حەوشەم پێنەبوو، بەسەر حەوشەکەدا خۆم هەڵدا، کلیلی ژوورەوە وەک هەمیشە لەسەر رووخی دەرگا دانرابوون هەموو گەڕەک شارەزا ببوون دایکم کلیلەکانی لە چ شوێنێک دادەنێ، چوومە ژوورەوە، ژوور هالاوی لێهەڵدەستا، خەنی بووم لە خۆشییان، وام وێنا کردبوو ژوورێکی سارد و سۆڵ، دەمگوت بێ نەوتی و سووتەمەنی، لەوەیە، دایکم و ئەیوب لە سەرمان ڕەق ببنەوە، بەلام پێچەوانە بوو. دایکم جلکەکانی بۆ دانابووم و خاولییەکەم هەڵگرت، چووم بۆ گەرماوەکە، گوتم: دەبێ خۆم بشۆم تا ئاوێ ڕوونم لێدێ، سەرم شانە دەکەم, خۆم تیف تیفە دەدەم و بۆنیش بە خۆم دادەکەم.

ئێوارە دوای مەلابانگدان، پۆشتەو پەرداخ، هەناسەیەکی خۆشم هەڵمژی، گوتم ئۆخەی کە توانیم ئەرکەکانی سەر شانم بەجێبهێنم. ئاخر لەوە خۆشتر نییە مرۆڤ بکەوێتە بەرچاوی کەس و کار، ڕازی بوونی دایکم و ئەیوب و ماڵی خاڵم, گەلێک خۆشی پێ بەخشیم. ئەوەشم لەچاوی ریحان خوێندەوە کە هیچ نیگەران نییە لەوەی کە هاوکاری خاڵم بووم، ئەو هاوڕێیانەشم هەموویان پشتیوانێکی جوان بوون، هاوڕێ جوامێر لە هاوڕێیانی شیوعی، کە دڵی زۆر بە من دەکرایەوە، ئۆتۆمۆبیلەکەی تەرخان کردبوو، دەیگوت: ڕازی نابم ئۆتۆمۆبێل بەکرێ بگری گەر بیبەنەوە بۆ نەخۆشخانە خۆم و سەیارەکەم لەخزمەت داین، لای هاوڕێیانی حیزب باسم

کردووە کە دەچم سەردانی یاقووب و خاڵی دەکەم، هەموویان یەک دەنگ هاوڕابوون، کەس ناڕازی نەبوو بۆیە خەیاڵت تەخت بێ. هاوڕێیانی کۆمۆنیستیش زۆر بە پەرۆشەوە بوون، گوتیان خۆمان و سەیارەکەمان چیمان لە دەست بێ دریغی ناکەین، زۆر دڵم بەو هاوکاری و بە دەنگەوە هاتنەی خەڵک و هاوڕێیانم خۆش بوو. خێرا دوای ئەوەی پشوویەکی باشم وەرگرت، بەڵام وەک لەسەر ئاو و ئاگران بم، ئەو هەموو ماندوو بوون و بیرکردنەوەیە، ئەوجار نەمتوانی چرکەیەکیش بخەوم، بە پەلە بووم تا دەگەمەوە ماڵی خاڵم، تا دەچمەوە ریحان نەڕۆیشتبێ و تەندروستی خاڵیشم بۆم گرنگ بوو. وەک با، تیژ کۆڵانەکەم بڕی و بۆنی خۆشی جلکەکانم ڕێگەکەی غەرقی سەمایەکی ڕوحی کردبوو، بەرامەی ئەو بۆن و ئەو ئۆخژن و دڵخۆشییەی ئێوارەیەم، کەشێکی ڕەنگاڵەیی درووست کرد، سەمایەکی مەستانەی بەخشیبوو بە ڕۆح، لەبەر خۆمەوە سروودەکانی سەرکەوتنم دەگوت، بە دیار ئاوێزەوە گوێم لە شیعر و لاوک و سرووتەکانی باران دەگرت. گەیشتم بە حەوشەی ماڵی خاڵم، ریحان و دایکی خەریکی ڕۆیشتن بوون، لە بەردەرگە تێکهەڵەنگوتین، ڕێکەوتێکی جوان و هەلێکی باش بوو، ریحان هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی، بۆنەکەی ناسییەوە، نیگای دڵخۆشی ڕژاند و خەریکبوو بەسەر دایکیدا بەر ببێتەوە، دایکی ریحان چاوێکی لێکردم و گوتی: «ئێمە درەنگمان کرد دەڕۆین، لە وەختێکی دیکەدا دێمەوە، سەرتان لێ نابڕم، چاوم لەسەرتان دەبێ، ئێوەش وەک منداڵی خۆم وان.»

گوتی سەرتان دەدەمەوە، نەیگوت سەرتان دەدەینەوە! جا ئەوە وەک گرێ پوچکەیەک بە بیرکردنەوەم وە نووسا، ئاخر دەبێ ریحانش بێتەوە نابێ، خۆ نیگەران نەبووە؟! نا، نا ئەوەتا چۆن شاگەشکە بووە، هیچی خراپ لە چاوەکانی ناخوێنمەوە، ئەو عیشقە لە ڕووکاری دەخوێنمەوە کە ڕۆحی بە ڕۆحم گرێدراوە، ڕەنگە دایکی بەو شێوەیە قسەی نەکردبێ، زۆر جار مرۆڤ لە پەلە پەلی دا ناتوانێ وەک خۆی دەیەوێ ئاوا بدوێ، من ریحانم لە خۆمم خۆشتر دەوێ، دڵنیاشم لە ڕاستگۆیی و دڵخاوێنی ریحان.

بەژوورکەوتم، دیتم دارای شەریکم هاتووە بۆ سەردان و لێپرسین، شاگەشکەبووم، ئاخر بۆ مانگێک دەبوو نەمبینیبوو، ئەویش زۆر دڵخۆش و ئاسوودەبوو، هەستم کرد پێی خۆشە باوەشم پێدا بکا، دەستم بۆ درێژ کرد، تەوقەیەکی توندم لەگەڵ کرد، ڕامکێشا بە ئامێزمەوە نووساند، تێر، تێر ماچم کرد. گوتی: «هاورێ، وەڕەزی ئەو بۆنەم کردبوو، ڕۆژم دەژماردن، دەزانی چەند هۆگری تۆم؟»

گوتم: «دەی ئەو ڕۆژانەت چۆن بەڕێ کردوون، چۆن بووی لە ئیش و کارەکانت، حاڵی کتێبخانەکەمان چۆنە؟ دەبێ بمبووری لەوەی کە ئەو ماوەیە تەنیا کارەکانی دووکانت بەڕێوە بردووە.»

دارا، سەری دڵنیا بوونی بۆ لەقاندم، کە خەیاڵم ئاسوودە بێ هەموو شتێک بەدڵی خۆمان دەبێ. دیقەتم دایە ژووری ماڵی خاڵم یەکی دیکەی نەدەبرد. بەخێرهاتنی هەموانم کرد. خاڵم تێم ڕاماو گوتی: «هاتیەوە؟ چەند ڕۆژە ئاو بە لەشت

نەکەوتووە، هۆکارەکەی من بووم، یاخوا پیرۆزت بێ چەندم حەز لێبوو چووی خۆت شووشت و چەند پێت سەربەرزم کوڕی بابی خۆتی!»

ئەو گۆتەیەم لەزۆر شوێن گوێ لێ بووە، دەڵێن کوڕی بابی خۆتی! بۆم جێگەی دڵخۆشی بوو کە بابم پیاوێکی بە بەزەیی و ڕاستگۆ و دڵسۆزی وەڵاتەکەی خۆی بووە، لەوێ بستێک باڵام کرد، خەریک بوو هەستەکانم ئازاد بکەم و دەست بە قسەکردن بکەم، زمانی خۆم گەست گوتم نا، تا کەمتر قسە بکەم باشتر دەبمە جێی سەرنج و ڕازی بوونی خێزانەکەمان، جارێ هیچ پێویستیت بەو گفتوو گۆیانە نییە، ئێرەماڵی خاڵتەو نابێ بیکەیتە ڕۆژی خۆت، دڵخۆشی خۆم نیشانی ئامادەبوان دا، بە پیکەنینەوە گوتم: «خاڵە گیان هێشتا نەمتوانیوە ئەوە بم کە ئێوە لەمنتان دەوێ.»

ڕۆژ خەریکی ئاوابوون بوو، هەور و تەم و مژ بوو، دونیا بەرەو تاریکی دەچوو، کارەبا زوو زوو دەکوژایەوە، میوانەکان مەجلیسیان گەرم کردبوو، یەکێک لە میوانەکان تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، گوتی: «کاتمان زۆر درەنگ کرد، هەڵبستین خراپ نییە، با ئەوانیش پشوویەک بدەن، چوونکە دڵنیام ماندوون و پێویستیان بە حەسانەوەیەکی باش هەیە.»

هەرچەند ڕاستیەکەی وابوو، بەتایبەتی خاڵم پێویستی بەوە بوو شوێنێکی هێمن و بێدەنگی بۆ دابین کرابا، بەڵام ئیختیدار و ماڵی خاڵم هەر ئەوەندەی لێهەڵدەکەوت، جێ و ڕێگەیان بەرتەسک بوو. لەگەڵ ئەوەش دا، خاڵم دڵی هێندە ئاوەدان بوو هیچ کات لەبەرامبەر میوان و خزمەتکردنی میوان دەستە

وستان نەدەبوو چی هەیبا حەزی دەکرد لەگەڵ خزم و خەڵک بیخوا. زۆر جار گوێم لە دایکم بووە دەیگوت کاکی من قەت نابێ بە هیچ، قەت نابێتە ساحێبی چوار دیناری خۆی، نانی ئەورۆی هەبێ خەمی سبەینێی نییە، خەریک بوو بە لاقی بریندارێ، بەو هیلاکییەوە هەڵدەستاو بەربینگی بە میوانەکان دەگرت، نەیدەهێشت بڕۆن، هەر ئەوەندە بوو تەلاقی نەخوارد. دواجار یەک دەنگ گوتیان بەخوا دەڕۆین، میوانەکان ڕۆیشتن و داوام لە دارا کرد ئەو بمێنێتەوە.

# بەشی دوازدەم

ئەو ئێوارەیە بۆمن تایبەت بوو، لە بن میچی ژووری دانیشتنی ماڵی خاڵم، هەودای دووکەڵی جگەرە، هێڵێکی ڕێکی درووست کردبوو، وەک تابلۆیەکی هۆنەری ئەو ناوەی خستبۆوە باوەشی خۆی، خەیاڵم بۆ تابلۆکانی ڕیحان و هونەری تابلۆکێشان چوو، زۆرجار خۆڕسکی هەورەکان هونەرێکی جوان و سەرنج ڕاکێش دەخولقێنن، بە بن میچی ئاسمانەوە وێنای ئەسپ و ماچ و پرچی درێژی پەریەکانم بینیوە، ژوورە بچووکەکەی ماڵی خاڵم، بە دووکەڵی جگەرە و پەستانی هەڵمی گەرمی سۆبەکە تابلۆکان دەبینران. لێ هەناسەم تەنگ ببوو خەریکبوو دەنگم بڵێند بکەم، کەمێک ئاگاتان لە حاڵی نەخۆشەکە بێ، گەر هەر جۆرێک لەو حاڵەتەدا قسەم کردبا زۆر بەسەر خێزانەکەماند دەشکایەوە. ژوورەکە جگە لەگەرمی و هالاوی گەرما، پێ کردنی جگەرەکانیش وای کردبوو، کەمتر بەر پێی خۆت دەدی. دڵم توووند ببوو، نیگەرانی ئەوە بووم کە جگەرە چەند زیانی هەیە، کەچی کەس گوێ بە ڕێنمایی و تەندرووستی خۆی نادا، بۆ تەندرووستی خاڵیشم باش نییە. کەوتمە سەر بیرکردنەوەیەکی سەیر، زۆر جار بیستوومە، دەڵێن ژینگەی پیس کاریگەری خراپی نابێ لەسەر پیسی، بەڵام پاک و خاوێنی دەکەوێتە ژێر مەترسی، پیسی و خاوێنی بە یەکەوە تەبا نین. دارا سەیرێکی کردم و گوتی: هاوڕێم زەحمەت دەتوانم هەناسە بدەم تەماشا بکە کەس ڕێز

لە پاکوخاوێنی ناگرێ. دارا بابەتی زۆری لەسەر پاک و خاوێنی دەیخوێندەوە، کتێبخانەکەمان چەند سوودی مادی هەبوو دە ئەوەندە سوودی خۆ پێگەیاندنی هەبوو، هەر کتێبێکی تازەمان هێنابا بۆ دووکان، بێ سێ و دوو دەمانخوێندەوە، دواتر گفتووگۆمان دەکرد. دارا گوتی: «دەبێ یارمەتیم بدەی بڕۆم دواتر دەتبینمەوە.»

حەزم لێ بوو نەڕوا، بەڵام منیش هاتمە ئەو بڕوایە ناتوانێ هەناسە بدا، فشاری دووکەڵی جگەرە و هاڵاوی گەرمی ژوورەکە ئەو ڕاستییەی سەلماند. خاڵم کۆکەیەکی توندی تووش ببوو، سەرەڕای بریندار بوونەکەشی ئەو کۆکەیەش تەنگی پێ هەڵچنیبوو. خاڵم لە ڕوو دامابوو گەر نا پێی دەگوتن کە لە ژوورەوە جگەرە نەکێشن، چەند ساڵ بوو وازی لە جگەرەکێشان هێنابوو، دەیگوت: «زۆر جار خەونی پێوە دەبینم، زۆر حەزدەکەم دەست پێ بکەمەوە، بەڵام دکتۆر لێی قەدەغەکردووم.»

خاڵم دڵنیا بوو ئەو دووکەڵ و ژینگەیە کارێگەری خراپی دەبێ لەسەر تەندرووستی. بەڵام هێندە بەڕوان تەنک بوو لە ڕووی نەدەهات  بە میوانەکان بڵێ جگەرە بۆ من باش نییە، پێشی وابوو سەردان کردنی ئەو دۆستانە، خۆشەویستی و دڵسۆزییە، کەواتە ناکرێ قسەیەکی لەو شێوەیە بکەم، ئەو حاڵەتە دەبێتە دەرکردنی میوانەکان لە ماڵی خۆی.

دارا ڕۆیشت، حەزم دەکرد شەو بەیەکەوە باین، دەمویست هەندێک باس و خواسی ئەو چەند ڕۆژە لە دارا بزانم. ئاخر هەواڵی فرۆشی کتێب و دەنگ و باسی بازاڕ و هاتنی دۆستانی

کتێبم دەویست. چەند ڕۆژە نە ئاگام لە کتێبخانە بوو نە هیچ شتێک کە پەیوەندی بە ریحان و ئاڵوگۆڕەکانی ناوچەکەوە هەبوو، چونکە یەکەم جارم بوو مانگێک دوور بکەومەوە. پێموابوو ساڵێک دەبێ، لای خۆمەوە زۆر قسەم کەڵاڵە کردبوون کە لەگەڵ دارا باسیان بکەم، بەتایبەت کارە تایبەتییەکانم، دارا وەک هاوڕێیەکی باش و برایەک ئاگای لە هەموو ئیشێکی من بوو، دەیزانی چی دەکەم، بۆمن گرنگ بوو لەگەڵ ماڵی ریحان زۆر تێکەڵ بوو، هەر پێشنیاری دارا بوو لەگەڵ ریحان پەیوەندی بگرم، دارا خۆی پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیەکی ریحان هەبوو، زۆر یەکتریان خۆش دەویست، بەشێکی زۆر لە هاوڕێکانمان بەو پەیوەندییەی داراو دۆستەکەیان دەزانی، دارا وەک پەیکی نامەبەر دەیتوانی دەور و نەخشی جوانی هەبێ، دەیانجار بە کاری هاوڕێکانی گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە، تەنیا بۆ ڕازی کردنی هاوڕێ و کەسە نزیکەکانی چی ئەرکێک زەحمت با دەیکرد. جارێکیان تازە پەیوەندیم لەگەڵ ریحان درووست کردبوو، هێشتا ئەو دڵنیایی و ئاسوودەییە بۆمن درووست نەبووبوو، ئێوارە وەختی نان خواردن نەمهێشت ئەو نان بخوا بە پەلە نامەیەکم نووسی و دامە دەستی، گوتی: با نانی بخۆم دەچم، گوتم: نابێ دەبێ ئێستا بچی ئەو نامەییەی بدەیتە دەستی ریحان. گوتی: کاکە ئەو پەلە پەلەی ناوێ، سبەی دەیدەمە دەست خۆی. زانی نیگەرانم، لەبەر دڵی من نامەکەی وەرگرت و چوو بۆ ماڵی ریحان. بۆی گێڕامەوە چۆن چووە، گوتی: چووم سڵاوم کرد، دایکی و ریحان لە ماڵ بوون، هەرگەیشتم ڕیحانم حاڵی کرد پشویەک دەدەم، تۆزێک دەخەوم، لایان سەیر بوو کاتی خەو

نییە، گوتیان: وەرە نان بخۆ بۆ برسیت نییە؟ گوتم: برسیم نییە تۆزێک سەرم دێشێ و دوایی کە هەستام شتێک دەخۆم. بەو بیانوە چووم لەسەر دۆشەکەڵەکە پاڵ کەوتم و خۆم خستە ناو خەوێکی قووڵ، ئەوان مەشغووڵی نان خواردن بوون، ریحان تیلەی چاوێکی دامێ و دەیزانی ئیشەکە پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە، چاوی لێبوو نامەکەم خستە ژێر دۆشەکەڵەکە، ڕەزامەندی نیشان دا. ئەوە سەرەتای یەکەمین نامەی من بوو بۆ ریحان، وەک یادگارییەکی جوان لەیادم ناچێتەوە، دارا هۆکاری بەستنی پەیوەندی و ئەوینداریمان بوو، بۆیە ئەو هەموو ئاڵۆزییەی لە ناخمدا کۆم کردبۆوە دەمویست ئەوشەو لەگەڵ دارا تاوتوێیان بکەین.

ئەیوب وەک هەمیشە بێ دەنگ و مات، قسەیەکی نەدەکرد، زۆریش حەزی لەشوێنی قەرەباڵغ نەبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە لەبەر دڵی دایکم و خاڵیشم، زۆری لە خۆی کرد بمێنێتەوە، لای قەرەوێڵەکەی خاڵم دانیشتبوو، چاوی بە هەمواندا دەگێڕا، قوڵاغ ببوو، جگە لە ژاوەژاو، هیچ شتێکی نەبیست، نەیدەتوانی بەچ بیانوویەک بچێتە دەرەوە، ئەو جگەرەشی نەدەکێشا بەو بیانووە بچێتە دەر هەر چۆنێک بوو، بەناوی دەست نوێژەوە یارمەتی خواست و ڕۆیشت بۆ مزگەوت. دایکم دیتی ئەیوب دەڕوا گوتی: «دوای نوێژ دێیتەوە بۆ ئێرە، لێرە نان دەخۆین.»

ئەیوب بە ئاماژەی سەر لەقاندن ڕەزامەندی دەربڕی. ئەیوب چەند بەپەلە بوو بۆ نوێژ، هێندەش دڵی لای خوێندنەوە بوو، زۆر جار کە پشتیوانی منی دەکرد، سەبارەت بە خوێندنەوە، دەیگوت: هەر بیروو باوەڕێک کتێبی هەبێ گومانی تێدا نییە

بۆ خوداو خەڵک سووڵحاوە، چونکە کتێبی خوداش بو ڕاستکردنەوەی خەڵکە لە خواریەکان، بۆ باشترکردنی کۆمەڵگەیە، دەی کەوایە خوێندنەوە کارێکی زۆر باشە، خوداش گەر خواستی لەسەر بێ و بیەوێت هیدایەتت بدا، ئەوە خۆی خاوەنی هەموو دیاردە و ئەو کارانەیە کە دێنە پێش.

من حەزم نەدەکرد و دڵیشم نەدەهات گفتووگۆی لەو بارەیەوە لەگەڵ بکەم، هەمیشە وەک برا، وەک ڕێزگرتن بەو ئاقارەدا نەدەڕۆیشتم، بەڵام زۆر جار پرسیارم هەبوو بۆی، جارێکیان لەبەرامبەر ئەو بۆچوونانەی دا گوتم: باشە بەو پێیەی ڕوانینەکانی تۆ بێ کەسێک باوەڕی بە دین و دوارۆژ نامێنێ، خۆی تاوانبار نییە، ئەوە بە قودرەتی خودا گەیشتووە بەو باوەڕە؟ زۆر لەسەرەخۆ بێ هەڵچوون و بە پێکەنینەوە گوتی: ئەوەی من لێی حاڵیم، خودا لەکارەکانت ڕازی بێ بەسە بۆ دوارۆژ، ڕازی بوونی خودا، بە تەنیا نوێژوو ڕۆژوو نییە، تۆ لەشوێنی خۆت گونجاوبە، زمانت بە خەراپ نەگەڕێ، داوێن خاوێن و ڕاستگۆبە، زیادەڕۆیی لە هیچ شتێک دا مەکە، هەمیشە دەوری خێر ببینە لە دەور و بەرت، وڵات و خەڵکەکەت خۆش بوێ خودا لێت بێبەری نییە. ئەیوب جیاواز لە دیندار و خەڵکی دیکە بیری دەکردەوە، هیچ کات لە کتێبەکانی من نیگەران نەدەبوو، جارێکیان کتێبێکی کاڕل مارکسم پێبوو، بینی گوتی: ئەو کتێبەم خوێندۆتەوە، بەڵام ئەوکات وەک ئێستا نەبووم توندبووم، بەرچاوم تاریک بوون، بە تێگەیشتنێکی دووژمنکارانە دەمخوێندنەوە، ئەوە زیانی پێگەیاندم، ئێستا بەو دیدە داخراوە کتێب ناخوێنمەوە،

هەموو کتێبەکان پەیامبەرێکیان هەیە، گرنگ ئەوەیە بەدواکەوتنی ئەو کتێبانە بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاستی خزمەتکردن بەخەڵک.

ئەیوب بە نەرم و لەسەرەخۆییەی توانیبووی جێگەی خۆی بکاتەوە لەناو خەڵک، هەتا چەپەکانیش زۆر ڕێزیان لێ دەنا. هاوڕێکانی من لەگەڵ منیان باس دەکرد، کە ئەو برایەی تۆ پیاوێکی سەنگینە، نەمانبینیوە هەستی کەس بریندار بکا، لە خۆشیان باڵم دەگرت، ئەوەش هۆکارێکی باش بوو، کە هیچ کات دەنگمان بەسەر یەکدا بەرز نەدەکردەوە، ئەویش بەڕاستی لە ئاستی ئەو ڕێزە دابوو.

دەنگی ریحان بۆمن وەک سێبەرێک وابوو، لەو کاتانەی خەیاڵم پەرت دەبوو، دەروونم دایسا و شووعلەی دەچوو بۆ دەوارەکانی وەرەس بوون، دەڕژا بۆسۆراغی بینینەوەی خۆم، بۆ ڕاوەستانی ئەوساتانەی دەمم لەدەمی ئێوارەدابوو، ڕەنگم لەسەر پەڕی کۆلکە زێڕینەدا گۆرانی سرووتەکانی بێ تاقەتی منیان دەگوت. ئەو ژاوە ژاوە و قەرەباڵغییەی ماڵی خاڵم، نەیتوانی ڕۆیشتنی ریحانم لێ دوور بخاتەوە، نەیتوانی چاوداگرتنی ریحان فەرامۆش بکەم و لەو تابلۆیەم دوور بخاتەوە ڕۆژانێک بە دەنگێکی هێواش پێیگوتم: تۆ دەتوانی لەگەڵ من بناغە ئەوینێک دابڕێژی، دەتوانی ئەو حەزوو ئارەزووانەی وێنات کردوون بەیەکەوە بیانگەیەنینە جێ. وەک لە بانێکم بەردەنەوە، قووشقی بووم و دونیام لی تاریک بوو. ئاخر بۆمن هەواڵێکی سەنگین بوو، لە ژیانی خۆمدا هێندە دڵخۆش نەبووم، قەت فریشتەیەک ئاوا ڕووبەڕوو پێی

نەگوتووم، کەس ئەوەندە سەرنجی ڕانەکێشاوم، کەس هێندە عاشقانە نەیدواندووم، منێک لە بیابانی ناموورادیدا، لە جەنگێکی کۆمەڵایەتی سەختدا، لە دووڕیانێکی مەترسیداردا کەسێک هەیە پێم دەڵێ با بناغەی سێبەرێک بۆ ئەوینێک دابڕێژین، ئەوە سرووتێکی تازەیە، ئەوە پەیامێکە دەیەوێ ئەو چیرۆکانە بنووسێتەوە، کە ڕۆمان نووسەکان دەستیان پێی ڕا ناگا، پەیامەکانی ئاسمان ناتوانن وەک خۆی، خەیاڵەکانی ئەو تابلۆیە بنووسنەوە. من وەک کەسێکی کەم ئەزموون، وەک مەخلووقێکی دوور لەدەردەشە و نەریتی خێڵ، بەسەر دونیایەکی تازادا کەوتم، بۆمن گرنگ بوو، پێشتر خەیاڵێکی لەو چەشنەم هەبوو، دەمگوت: کەی بێ، خان و مانێک بۆخۆم دەستنیشان بکەم و تا هەتایە لەگەڵی بژیم، دەمگوت بۆ من ژیانێکی تازە و پڕ ئەزموون دەبێ، دەزانم ریحان ژیانم خۆش دەکا، گۆڕان بەسەر کۆی خواست و ئارەزووەکانم دادێنێ. ڕاستە من خواستم زۆر شت بوو، لێ نەدەگوونجا ئەوەی خۆت دەتەوێ ئەوە بێ، ئەو هەموو خەیاڵ و بیرکردنەوە، چۆن لەگەڵ کچێکی کراوە، چۆن بتەوێ ئەوە بخووڵقێنی کە هەستت دەرکی پێدەکا، ئاخر کوڕێکی شەرمن، هیچ کات ماچی ناودەمی نەکردووە قەت نەیتوانیوە نامەیەکی شیعر ئامێز بنووسێ چۆن بتوانێ لەدەفتەری یاداشتەکانیدا بەزمانی شیعر بدوێ. ئەو هەستانە لە مێشکمدا دەیانگوت: ڕەنگە دوا بکەوی بەدبەخت، ئەو فرسەتانە لەدەست خۆت مەدە، ژیانێک بۆ تۆ هاتۆتە بوون، لەدەست خۆتی مەدە، بیستوومە دوای ژیانێکی زۆر ئەزموونێکی زۆر، ئەو فرسەتانە دێنەدەست، جارێکیدی شتی وا نابینیتەوە.

## بەشی سێزدە

تا زەمەن زیاتر دەڕۆیشت، خەیاڵەکانم پەرتتر دەبوون، دنیام زۆر لێ ئاڵۆز ببوو، شتەکانم لێتێکەڵاو دەبوون، لایەک عیشق هانی دەدام شێعر بخوێنمەوە، هەستێکی شاعیرانەم بۆ هاتبۆپێش، هەمووشتێک سۆزی ڕادەکێشام و بە ناسکی دەدوام، چاوی هەموانم لەسەر بوو، دیقەتەکانیان ورد بوون، کەمتر دەپڕژامە سەر کتێبخانە, دارا بەدەستمەوە هەراسان ببوو، خۆی تێکنەدەنا دەیگوت: «تۆ ماندووی هەموو کارەکانت ڕێکبخە ئەوجار دوای پشوودان وەرە بۆ دووکان.»

دایکم زۆر خەمی دروستکردنی خێزان و بینینی بووک و منداڵی ئێمە بوو, دەیگوت: «خودایە ئەو کراسەشم لەبەردانەبێ تەنیا منداڵی ئێوە ببینم.»

ئەو نوێژانەی دایکم کەشێکی جوانیان درووست کردبوو نزاکانی, مۆزیکی خرۆشان و ئاسوودەییان دەبەخشی. ئاخر لە بستێک منداڵییەوە گوێم بە پاڕانەوەو سۆز گۆش کراوە. زۆر دەچوومەوە سەر یادوەرییەکانی منداڵیم، لەگەڵ ئەیووب شەڕمان لەسەر باوەشی دایکم بوو، ئاگام لەدایکم بوو بە چرپە بە گوێی ئەیووبیدا دەچرپاند، نەمدەزانی چی پیدەڵێ، ئەوەندەم دەزانی بێ دەنگ دەبوو، لە باوەشیدا دەخەوتم. لەبەرخۆمەوە دەمگوت: ئەو ڕۆژەی خاڵم سەرەڕای ئازاری پشتی چوو بوو بۆ کرێکاری, چەند ڕۆژانێکی ناخۆش بوون

بۆ ماڵی خاڵم. جارێکیان لەگەڵ کوڕەخاڵەکەم ڕۆیشتین بۆ کەرکوک، بێ ئەوەی دایکم ڕازی بێ، بێ پرسی ماڵەوە چوین بۆ هێنانی ڕۆن و برینج، لە قەدەر ئەو پارەیەی پێمان بوو، زۆر لە بازاڕ گەڕاین و هەردووکمان هێندە گەورە نەبووین، لە خۆمان دەترساین تووشمان بە تووشی خەڵکی خراپ بێ، بەڵام ئەو شووفێرەی لەگەڵمان بوو، زۆر هاوکارمان بوو، بە پشتیوانی ئەو شتەکانمان کڕین و ئاسوودە بووین. خاڵم هیچ سۆراغیکی نەبوو، لەهەر کەسێکیان دەپرسی وەڵامێکی وایان دەست نەدەکەوت دڵخۆش بن، کوڕی خاڵم بەوردی ئەو بەسەرهاتەی بۆ میوانەکان گێرایەوە، لای میوانەکانی ماڵی خاڵم زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، هەموان بە خۆشحاڵییەوە گوێیان شلکردبوو، ئیدی بڵاو ببووم و دەگەڕام چۆن خۆم کۆ بکەمەوە، ئەوەندەی هۆگری خاڵم بووم هێندە بیرم لە بێ بابی نەدەکردەوە، جێگەی هەموو کەسی بۆ گرتبووینەوە.

کوری خاڵم هێندە ورد ئەو سەفەرەی بۆ میوانەکان گێڕایەوە، دەتگوت حیکایەتیان بۆ دەکا، وەک شەوانی بەر ئاگردان، گوێیان قووڵاغ کردبوو ئاردەوێژی گێڕانەوەی بە چێژ و پڕ وێنا بوو، گوتی: «دوای شەش مانگ، بابم سۆراغی نەبوو، تەمەنم ١٦ساڵ بوو، دەمخوێند زۆر لە خوێندن بێ تاقەت و وەڕەس بووم، خواخوام بوو کارێکم دەست بکەوێ و واز لە خوێندن بهێنم، وەختێ بەدوای باوکمدا دەگەڕاین دایکم و پوورم و خێزانەکەمان زۆر دڵتەنگ و بێ قەرار بوون, لەهیچ شوێنێک ئۆقرەمان نەدەگرت، ئاخر لە یادمە کە لە گوند دابەزین و لە ئۆردووگای زۆرەملێ لە ناو تۆزو خۆڵی ئەو

دەشتە فرێیان داین، حکوومەتی سەدام هەر ماڵێک ٥٠٠ دیناریان وەک قەرەبوو دابووینێ، نەمان دەزانی چۆن ئەو پارەیە تەواو بکەین، چونکە ڕاستیەکەی ئێمە هیچ کات ئەو برە پارەیەمان نەبینیبوو, لە ماڵیشماندا نەبوو. بەهەرحاڵ، ئەو پارەیەمان قرت لێبڕی و هیچی دیکەمان شک نەدەبرد، ڕۆژ دوای ڕۆژ ژیانمان تەنگتر و خراپتر دەبوو، تەنیا ئاسۆیەک کە هەبوو کرێکاری بوو، دەبوو بۆ پەیدا کردنی کار پیاوەکان بچن بۆ شارە گەورەکان، بابم بەو حاڵی پشت ئێشەو ئازار و موعاناتەی هەیبوو قۆڵی لێهەڵماڵی و ڕۆیشت و ئێمەی جێهێشت، ئێمە منداڵەکان هەموومان سەرکەو بنکەبووین، بەکەڵکی ئەوە نەدەهاتین دەست بۆ هیچ کارێک ببەین کە ژیانمان دابین بکا، ڕاستییەکەی شاگردی دۆندرمە خانە و ڕسم فرۆشتن و بۆیاغ کردنی پێڵاو نەمدەتوانی پێداویستیەکانی ماڵێ دابین بکەم، منداڵەکان لەخۆم بچوکتربوون و تاقە خوشکێم لەمن گەورەتربوو، چاویان لە دەستی من بوو, نەمدەتوانی ڕازیان بکەم، دووری بابیشم هێندەی دی دەست و پێی بەستبووین، زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بووین، خوێندن و یاری کردن لەگەڵ مندالانی گەڕک، خۆشییەکانی منداڵیمان جێهێشتن و خەمێکی قووڵ یەخەی گرتم و بە ئازارێکی زۆرەوە دەمگووزەراند. دڵم بۆ کچی جوان لێیدەدا، خۆم نزیک دەکردەوە لەو کچانەی لە قوتابخانە هاوڕێم بوون، دڵم زۆر شتی دەویست، زاتی ئەوەم نەبوو بیان درکێنم، خەم و دەردو کێشەکان هەروا کەڵەکە دەبوون، بەسەر ئەو هەموو دەردەسەریانەدا دایکم نەخۆش کەوت. خزم و دەرو دروسێ گوتیان بیبەن بۆ سەر چاک و

پیران، ئەو نەخۆشییە لە قەوامی دکتۆران دا نییە مەگەر خواو چاک و مشایخ ئەو دەردە لە قالبی ئەو ژنە دەربکەن دەنا لە قەوەتی کەسدا نییە، دایکم پشتی بەسگی وەنووسابوو، لاقی عەردی نەدەگرت، پوورە خەجم لەگەڵی چوو بۆ سەر ئەسحابە بەقوودرەتی قادر دایکم ڕەنگ و ڕووی خۆشتر بوو پشتی بۆ ڕاست دەکرایەوە، ڕنگ زەردییەکەی تێپەڕاند و هەموومان لە خۆشیان نەمان دەزانی چی بکەین هێندە دڵخۆش بوون باس ناکرێ. برا بچووکەکەمان هەمیشە گڕووی بۆ باوەشی بابم بوو، دەگریا بەهیچ ژێر نەدەبۆوە، دایەش بە قوورگی پڕ لە گریانەوە بەهەناسە ساردییەوە دەیگوت: «ڕۆڵە گیان چی بکەم، قووڕی کوێت بۆ وەسەری بکەم، دێتەوە بابە دێتەوە چی شتی جوانە بۆتان دێنێتەوە.»

براکەم لە پرسیارەکانی خۆی نەدەکەوت و دەیگوت: «کەی دێتەوە؟ تۆ هەر دەڵێی دێتەوە، ئاخر بەبێ بابم نانووم.»

دایکم بەحاڵی و بێ دەستەڵاتی خۆیەوە ناچار بوو دەبێ قەناعەتی پێ بکا و ڕازی بێ. گوتی: «ڕۆڵە گیان شەو دێتەوە، دێتە خەونت و دەچیتە باوەشی بابە.»

بەوشێوەیە بیانوەکانی کاکە چکۆڵەمان دەبڕی و چاوی دەچوونە خەوەوە. ئێواران بابی هەموو منداڵەکان دەگەڕانەوە، بە دەستی پڕ میوە و زەردەخەنە و باوەشەوە، منداڵەکان ڕاکە ڕاکیان بوو بە غار بۆ باوەشی بابیان، تەنیا ئێمە دەوەستاین و هیچ باوەشێک نەبوو خۆی بۆ غار بدەین، سەرمان لەبەر خۆمان دەنا، هیچمان نەدەگوت، لە قووڵایی ناخمانەوە دەگریاین، من باخۆشتر بووم لە براکانم و خووشکەکەشم

لەبەر چرووسانەوەی ماڵ و هاوکاریەکانی دایکم، پشتیوانییەکی باش بوو، بڕیارم دا هەرچۆنێک بێ بچم ئیشیک بدۆزمەوە، هەندێک لە خزمەکانم دووکانیان هەبوو، برینج و شەکر و چاو ڕۆنیان بۆ دەهات لە شارەکان، ئۆردووگا شوێنی کاسبی بوو بازاڕێکی خۆڕسک دروست ببوو، کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەهاتن بۆ ئۆردووگا ڕۆن و برینج و شەکر و چاو جگەرەیان دەکڕی و بە قاچاغی دەیانبردەوە ئەودیو، مامەڵەکردن لە ئۆردووگا زۆر گەرم و گووڕ بوو، تێکە و لێکەیەک بوو کەس ئاگای لەکەس نەبوو کەچکی قووڵەی تێ نەدەچوو، بڕیارم دا خۆم تێکەڵی ئەو بازاڕە بکەم، چی فیرار و خەڵکی یاخی بوو لە ئۆردووگا جێگەی ببۆوە، وەک ناوچەیەکی ئازادکراو وابوو، بازاڕچەیەکی گەورەی لێبوو لە هەموو شارەکانی عێراقەوە خەڵک ڕووی تێدەکرد، من مێرمنداڵێکی فەقیر و بێ دەرەتان بووم، خێزانەکەمان دەستکورت بوو، هەرچۆنێک بێ لەگەڵ یاقووب ڕێککەوتین و بڕیارماندا لە قەدەر ئەو پارەیەی لە بەر دەستمانە هەندێک گۆرەویی و مەخمەر و هەندێک فستەق ببەین بۆ شارەکان. لە شارەکان ساغمان دەکردنەوەو بەو پارەیەش لەوێوە شەکر و ڕۆن و برینجمان پێدەکڕی و لە بازگەکانی حکوومەت بە سەد قولهوو وەڵڵاو ئایەتەلکورسی نەجاتمان دەبوو. زۆر جار بازگەکان بەزەییان پێدادەهاتینەوە لێیان نەدەستاندین، دایکم دەیگوت: «ڕۆڵە تا ئێوە دەگەڕێنەوە لەسەر بەرماڵێ نزاتان بۆ دەکەم، ئایەتەلکورسیتان لێ دەخوێنم خوای گەورە چەپاڵەتان بدا.»

منیش چی ئەو ئایەت و نزای دایکم هەبوو هەموویانم لە بەر کردبوو کە دەگەیشتینە بازگەکان دەمخوێندن و فووم بەخۆم و بە یاقووب و سەیارەکەدا دەکرد. زۆر زەحمەت بوو تا توانیم ئایەتەلکورسی لەبەر بکەم، چوار مانگی ڕەبەق لای مەلا هاتووچۆم کرد تا جزووی عەممەم تەواوکرد. ئایەتلکورسیشم وەک ئاو و دۆ لەبەر بوو. لە بازگەکانی حکوومەت خۆمان وەک دیل و کۆیلە دەهاتە بەرچاو، کۆتا جار برێک پارەم پەیدا کردبوو، بێ پرسی دایکم لەگەڵ یاقووب چووین بۆ کەرکوک، کات دەی سەرلە بەیانی بوو بە بازاڕدا دەگەڕاین، وەک تارماییەک بینیم پیاوێکی چڵکن چۆغەیەکی ئاڕەقاوی و نیتاقێک لە پشت و هەندێک شتی دیکەی لە کۆڵی خۆی بەستبوو، شڕە جەمەدانییەکی لەسەری بەستبوو، غەریب غەریب تەنیا جادەکەی دەپێوا، دەستێکی بە خۆیدا بەردابۆوە، سیگارێک بەدەمیەوە و بیرکردنەوە لە منداڵەکانی خێزانێکی بەش مەینەت، چۆنییەتی گووزەرانی ژنێک و شەش منداڵ کە تەنیا من و خودا شک دەبەن دەیان ئەندێشەی دیکەم لە ئاکاریدا خوێندەوە. چاوێکم لە یاقووب کرد و گوتم: «دیوتە ئەوە بابمە، بابە بابە.»

کە ئاوڕی دایەوە، بەچاوی پڕ فرمێسکەوە گوتی: «کوای چاوم لێت نییە؟» گوتم: «ئەوەتام بابە بەلای ڕاست ئاوڕ بدەوە.»

ڕوانی و بەلای محەجەرەکاندا هات ڕێگە نەبوو محەجەرەکان بوون بە بەربەست تابتوانم بچمە باوەشی و دەستی بەرنەدام تا کۆتایی شەقامەکە و تەواو بوونی محەجەرەکان باوەشی

پێداکردم و گوتی:«بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ چ کارێکت بە ئێرەیە؟»

بە هەناسە بڕکێەوە گوتم: «ژیانی ئێمە بەوشێوەیەیە.» کە لە باسکردنی حاڵی ماڵەوەدا بووم. دیتم بابم گریا، گوێم لە دەنگی شکانی چۆکم بوو، درز کەوتە دڵم و گریانی وەک کێوێکی گەورە لە بەردەمم هەرەسی هێنا، کە ئەو گریا خودا ئومێدەکانی لێ دەستێنێتەوە، ئاخر گریانی باوک خەراپبوونی ژیان و هاتنی ماڵ خرابوونت پێدەڵێ، مەترسی شکانی باڵەکانم پێدەڵێ، کە فرمێسکەکانی بابم دیتن. بە بەرچاومەوە دیوارەکانی بەختەوەری ڕووخان، مەرگی ئاواتەکانم بینی، تینم دایە بەرخۆ، دەبێ خەمی دونیام لە بەر بێ، ئەوجار جێگەی بابم بگرمەوە، سەیرم کرد بابم بە ڕەنگ زەردی من نیگەرانە و دڵ پڕ بوو گوتی: «چۆن دەبێ تۆ لە مەکتەب بی و بەو زرووفە ناخۆشە ڕوو لێرە بکەی بەو بێ کەسیی و ناشارەزاییە ئاخر خۆ خوا غەزەبی لێنەگرتوون، ئەوە نییە خۆ من لە بەر ئێوە هاتووم کرێکاری دەکەم، ناهێڵم کەم و کووڕیتان هەبێ، خۆم ماندوو دەکەم بۆ ئەوەی بە سەربەرزی بژین، قبووڵی ناکەم جارێکی تر بێیتەوە دەبێ ئاگات لە خوێندنەکەت بێ.»

دەزانی چەندم پێخۆش بوو بابم یەکسەر لەگەڵ ئێمە گەڕابایەوە، دایکم و هەموویان چاوەڕوانی گەڕانەوەی بابم بوون، چونکە دەمێک بوو بابم بێ سۆراغ بوو، بۆ من سەرکەوتنێکی گەورە بوو، هەواڵێکی لەوشێوەیە. گوتم: «بابە

حەزدەکەم لەگەڵ ئێمە بێیتەوە خۆ ئێمە هەمووومان لە سویی تۆ مردین.»

بە نیگایەکی خەمبارەوە چاوێکی لێکردم و گوتی: «بەڵێنت پێدەدەم چەند ڕۆژم ماوە تا ئەو پارانە وەردەگرم بە دایکت و بە هەمووان بڵێ بەدەستی پڕ دەگەڕێمەوە.»

هەموویان زۆر ورد و هێمنانە گوێیان ڕاگرتبوو، هەر خوا خوایانبوو ئەو نەزیلەیە تەواو نەبێ، ئەژنۆیان لە باوەش گرتبوو، چاک خۆیان خستبووە ناو چیرۆکەکە. دوای تەواو بوونی چیرۆکەکە، ئیزنم وەرگرت و ڕۆیشتم، ئەو شەوە لە ماڵێ تەنیا بووم، بیرم زۆر ئاڵۆزبوو، زەینم دەچۆوە سەر ئەو چەند ڕۆژەی نەخۆشخانە، وێنەی هەموو نەخۆشەکانم دەهاتە بەرچاو، نیگەرانی و ئازارەکانی هەمووانم دەدی، لەگەڵ ئەندێشەکانیان یەکانگیر ببووم، چاوێکیشم هەر لە ڕێگا بوو ئاخۆ دایکم کەی دەگەڕێتەوە، هەرچەند دایکم ئیوارە گوتی: «ئەمشەو لای خاڵت دەبم و ئەیووبیش لێرە دەبێ تۆ ماندوو بووی و پشوو بدە.»

بەڵام لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دایکم قەت قەناعەت ناکا بە تەنیا لە ماڵێ بم، دەیگوت: تا گەورەتر بن دڵم زیاتر دەترسێ، هەمیشە چاوی لە دوومانبوو. هەرچەند دیقەتم دەدا بژێوی و بەڕیوەبردنی ماڵ ئەرکێکی زەحمەتە، ئاوا ژیان بەڕیوە ناچێ، دەبێ بیرێک لە حاڵی خۆمان بکەمەوە، لەگەڵ ئەیووب و دایکم قسە دەکەم، بە تەنیا بە کتێبخانە ناتوانم پێداویستییەکانی ماڵ دابین بکەم، دەزانم دایکم ئەو تواناو سەلیقەیەی جارانی نەماوە بتوانێ خێزانێک بەڕێوە ببات، ئەو بەدەردی خۆیەوە

دەناڵێنێ، شەوانە لەبەر ئازاری پشتی حەجمنی نییە و ئۆقرەی لێهەڵگیراوە، ئاخر گەمارۆی ئابووری کاریگەری لەسەر خەڵکی هەژار و بێدەرەتان زیاترە، خەڵکی خوا پێداو بە خەیاڵیان دانایە، پارەیەکی زۆریان مۆڵ کردووە و لەسەر یەکیان داناوە، بەڵام خێزانی ئێمە چۆن بتوانێ لەو سەردەمی گەمارۆ و قات و قڕیەدا خۆی دەرباز بکا؟ هەموو داهاتی ئێمە جلشۆری و نانکەری خەڵکی و ئەو چەند ساڵەی من کارو کاسپیم کردووە، ئەوەش بڕێکی زۆر کەم و دەروەستی ئەمڕۆ نایە. ڕۆژانە دەمبیست، خەڵکی هەژار و کەم دەرامەت بەدوای دەڕاسەکانەوە بوون بۆ خڕکردنەوەی گوڵە گەنم, زۆر جاردەستیان درێژکردووە بۆ گوڵە گەنمی ناو دەمی دەڕاسەکە، پەنجەیان بەر کەوتووە قرتاوە، دەیانگوت ئاپۆرای ئەو خەڵکەی بەدوای خڕکردنەوەی گوڵە گەنمەوەن هیچی کەمتر نییە لە کۆڕەوەکە، ئەوە ببوو بە زەنگێکی مەترسیدار و نا ئومێدییەکی قووڵ. دمزانی دایکیشم بیری لەوە دەکردەوە بچێت بۆ خڕکردنەوەی گوڵە گەنم، ئەو هەستە داغانی کردبووم، دەمگوت ئەو ڕۆژە دەبێ بمرم گەر دایکم ئەو کارە بکا، هەرگیز ڕێگەنادەم، دەی لەو خەیاڵانە ئاڵابووم و دەمهێناو دەمبرد، بە هیچ خەو نەدەچۆ چاوم، کەلەکەو کەلەکەم دەکرد، بالیفەکەم دەگۆڕی، جێگەکەم دەگواستەوە، بەزۆر شێوە تاقیم دەکردەوە ئەو شەوە تا سەعات سێ هەر بێدار بووم. ویستم چەند لاپەڕەیەک لە گوڵی ڕەشی شێرزاد حەسەن بخوێنمەوە، بەشیک لە چیرۆکانم خوێندەوە و چاوم لێڵ بوون بۆ خەوێ، بڕێک لەو دڕدۆنگی و قەلەقیە نەجاتم بوو، بەیانی لە دەنگی دەرگا خەبەرم بۆوە، دایکم بە ستلێک ماست و بڕێک نۆکی

کولاو بەژوور کەوت. دایکم و ئەیوب کلیلی خۆیان پێبوو، بۆیە پیویستی نەدەکرد تەقوولبابی دەرگا بکەن، بەلام جیرەی دەرگاکە گەرەکی بە خەبەر دەهێنا، لە دەنگی جیرەی دەرگاکە خەبەرم بۆوە. بەیانی نان و ماستێکمان خوارد، سفرەکەم هەڵگرتەوە، ئەیووب ڕووخسەتی وەرگرتوو گوتی: «دەچم بۆلای دۆستێکم نەساغە.»

سەیرێکی دایکم کردوو هیچی نەگوت، هەر کاتێک ئێمە دەرۆیشتین، نیگایەکی ئەو بەس بوو کە دەیەوێ شتێک بڵێ و بەلام نایەوێ بیدرکێنێ نەبادە ئێمە نیگەران بین. دیقەتم دایە، چوو بۆ بێلایەکە دوو بنە تەلیسی گەورەی تۆو گەسک هێناو لە بێلاکە هەڵیرشتن، تێیرامام و دەنگم نەکرد، ناحەقی نەبوو، ژیان و گوزەران زەحمەت بوو، تا دەهات بێکاری و دەستتەنگی ڕووی لە خەڵک کردبوو، وایلێهاتبوو لەبەر گرانی شت و مەک و پێداویستییەکانی ژیان، دەرەقەتی هیچ شتێک نەدەهاتی، نەتدەتوانی بیر لەخۆت بکەیتەوە، نەدەپرژایە سەر کارە تایبەتیەکانی خۆت.

دەم و چاوی ریحانم لێبزر نەدەبوو، ئەوم لەسەر سەری داڵغەکانم دانابوو، زۆر جار کە لە ئەوپەڕی نا ئومێدیدا دەبووم خەیاڵەکانی ئەوم لێدەبوون بە فریادرەس، تووشی نیگەرانییەکی قووڵ ببووم، چاوم لە دایکم بوو، بەدیارییەوە دانیشتبووم، خەریکی پاککردنی تۆو گەسک بوو، تۆو گەسکەکە ببەین لە ئاشی بکەین و بیکەین بەنان، سەیری چاوەکانیم کرد فرمێسک بە چاوەکانی دادەهاتنە خوارەوە، نیگەرانی و بێهێزی هەراسانی کردبوو، هیچ کات دایکم ئاوا

نەبینیبوو، تا من دایکمم بینیبێ چاوەکانی ئومێدیان لێدەڕژا نەک ڕۆندەک و خەم، بە پێکەنینەوە هەڵس و کەوتی دەکرد خۆری ئاسوودەیم لەودا بینیوە، هەمیشە هەستم بەدەرکەوتنی هیوا دەکرد کە چاوەکانی هەڵدێنان و گنجەکانی ژێرچاوی دەبوون بە تابلۆیەکی برۆنزی. ئێمە بە زەردەخەنە و ئومێدەکانی ئەو گەورە بووین، لە گەندوو گووی دەرهێناوین، لەسەر پێی خۆمان ڕاوەستاوین، نەیهێشتووە پێویستیمان بە دەستی کەس بێ، جاریکیان باسی گوزەرانی خۆی بۆ کردین و بە پێکەنینەوە گوتی: «هەموو کارێکم لەبەرخاتری ئێوە کردووە، چیرۆکی دەردەسەریەکانی من تەواو نابن.»

لێ جەخار برسییەتی و بێکاری ورووژمێکی زۆری هێنابوو، خەریکبوو دایکم دەرۆستی نەیێت و بکەوێ، ئەو دیوارەی هەڵیچنیبوو خەریکە برووخێ، ئەو فرمێسکانەی دایکم ململانێی لەگەڵ زەحمەتییەکانی دکرد، خەریکە کۆشکی ژیان و ئومێدەکانی وێران دەکا، بڕێک چوومە پێشێ و لێی نزیکبوومەوە، ڕۆبوومە دەستەکانی و ماچم کردن، بەسینگی خۆمەوە نووساندن، تاڵە سپییەکانی پرچی کە شێوەی مانگێک لەسەر ناوچەوانی درووست کردبوو بەدەستەکانی خۆم لامدان و چاوم بڕیە چاوی و پێمگوت: ڕەنگە ئەو فرمێسکانەی تۆ سبەینێ ببن بە ڕۆمانێک و جەنگی هەموو دونیای تێدا بنووسمەوە، چاک دەزانم ئەو دەستانەی تۆ چ خۆشەویستییەکیان پاراستووە، دەزانم دەتەوێ پێمان بڵێی ماندووم ماندوو، لەوە زیاتر بڕ ناکەم، لاقەکانم لەدووم نایەن، چاوەکانم ڕووناهییان تێدا نەماوە، دەستەکانم تێکەڵ دەبن،

بڕبڕەی پشتم خەریکە لێکبڵاو دەبێ و چی ئازای بەندەنم هەیە وە ئازار کەوتووە.

لە خەیاڵمدا گوتم: هەمووی دەخوێنمەوە، ئیدی دروێنەی خەمەکانت دەکەم بە مەڵۆی ئەوین و نەمری بۆ یادەوەرییەکانت دەهۆنمەوە، ڕێگە نادەم چیدی ژەنگی دەردەسەریەکان و چرووسانەوەت لەبەر باری ژیان هەراسانت بکا، دەروازەیەک دەدۆزمەوە بۆ ئاسوودەیی.

بەشی چواردەم

یاقووب وەک هەمیشە دەچوو بۆ ناو خەیاڵی قووڵ، دەیڕوانییە سرووشت و سپێدەکانی دەدواند، وەک شیعر، ساتەکانی سپێدەی هەڵدەگرتەوە و ئاوێتەی ڕەنگەکانی دەبوو، بە ئەوینێکی خاوێنەوە دەیگوت: سپێدە بەدیار ئازاری دایکمەوە، بە سرووتێک رەنگەوە دەیویست ئومێدمان بداتێ. دەیویست نەکەوین، دەیویست بە دایکم بڵێ لە روحی سەرگەردانییەوە هاتووی و شەڕی هەموو ناشیرنیەکانت کردووە، نابێ بکەوی ئەو سەداو هاوارانەی دڵت دەلەرزێنن تێدەپەڕن. دایکم لە گەرمی دەستەکانی سپێدە چی گۆرانی حەزین هەبوو دەیچڕی. نەرمتر لە باران رادەژا، چ سپێدەیەکی خەمگین بوو، لە چاوی دایمکدا زەمەنێکی وێران و پرکێشمەکێشمم دەبینی. بەو تەمەنەوە، ئەو دەبوو خەمی نەکەوتنی هەبێ، دەبێ ئەو نەهێڵێ شکان بێتەماڵەکەی. ڕوویتێکردم و گوتی: ئەوە دەڵێی چی ناهێڵێم بستێک لێرە بڕۆی، دوور بکەویەوە دەمرم. ئەو

دنیایە بەسەرخۆمدا وێران دەکەم، هەموو ژیانی خۆم بۆ ئێوە داناوە. نا، نا، رۆڵە هێشتا هەر بەپێوەم، هێشتا ئەوانەی بابی ئێوەیان ونکردووە لێم دەترسن، دڵنیابن چۆکدانادەم و ناکەوم. هیچ کات ساتەکانی راپێچکردنی بابتانم لەبیر ناچێتەوە، دەبێ سەرم بڵندبێ، بێخەم بن.

لەوکاتەدا، راچڵەکیم و هەستم خرۆشا، دەمویست پڕ بە گەرووم هاواربکەم, خەمی نان و ژیان بکەم بە گۆرانی. تازە نامیلکە شیعری تاشکۆفەی سووری کراسێکم دەستکەوتبوو، شیعرێک ئاوێتە بە ژیانی زەحمەتکێشان و دیدی چەپانەی تێدابوو. هاتەوە یادم رووم لە دایکم کردو گوتم:

«لە دەستە گەرمەکانی تۆ

کە منداڵی ئاوەڵ دوانەی ناو باوەشمن

چیها قسەم پێیە بیکەم

ئەگەر خەمی نان لێم گەڕێ.»

شیعرەکەم تەواو خوێندەوە، دایکم دەستیگرتم و گوتی:

« دەزانم خەمی نان، خەمی گەورەی ئێمەیە.»

رۆندک بە لووزەو بە چاوەکانیدا دەهاتنەخوار. دەمزانی ئەو بۆکوێ دەڕوانێ، دەڵێ منداڵەکانم گەورەبوون و گوێم لێناگرن، گەنج کە سواری سەری خۆی بوو هیچ شتێک لەبەرچاو ناگرێ، تەنیا بیر لەخۆی دەکاتەوە، ناگەڕێتەوە سەر کوێرەوەریەکانی دایک و باوکی. لە دڵی خۆیدا دەڵێ:

یاقوب کەڵکەڵەی خۆشەویستی لە سەریداوە، زەحمەتە بتوانی خۆشەویستەکەی جێبهێڵێ. بەڵام برسییەتی و نەبوونی وادەکا دەستبەرداری هەندێک شت بێ. ناو دڵی دایکم دەخوێندەوە کە چەندە لەوە دەترسێ ژیان زەحمەت و دژوارییە، هێندەش لەوە دەترسێ بزربوونی ئێمەو رۆیشتنمان وێرانی دەکا، بۆیە هەمیشە لەبیری ئەوەدابوو لێی دوور بکەوینەوە، ئەو تەواودەبێ و قەڵەمی دەست و پێیانی دەشکێ. رۆژێک بە گاڵتە گوتم: «دایە دەمەوێ وەک ئەو خەڵکە بچم بۆ ئێران، دەڵێن لەوێ کورەخانە و دەواجن و کاری گاوداری زۆرە.»

قسەکەم بەشێکی راستیشی تێدابوو، یەکسەر دەرهەڵبوو گوتی: «غەڵەت دەکەی بۆچی دەتەوێ بەدەستی خۆت کفنم بۆ ببڕی، ئەگەر یەک رۆژ لێم دوورکەونەوە بێشک ئۆقرە ناگرم. ئەو چەند رۆژەی لە ماڵی خاڵت بووی لەگەڵ ئەیوب بۆ کاری نیسک رنینەوە، هەزار غایلەم بەدڵدا هات، دەمگوت دووپشکەیەک مارێک یان هەرشتێک ئازار بە منداڵەکانم بگەیەنێ، بەرگەی ئازاریان ناگرم. ئەوە کاری ئێوە نییە دوورکەونەوە، ئەمن لەداری دنیایە ئێوە شک دەبەم. سۆزوخۆشەویستی بابیشتان بۆ من ئێوەن.»

بابم لە نیگای ماندووی دایکمدا، خۆی نیشاندەدام، نەیدەهێشت چاو دابخەم. سمێڵەکانی دەبریسکانەوە، چاوی بڕیبووە سەر قسەکانم و دەربڕینی ئاخاوتنەکانم، دوورونزیک دەیویست بێت و دەستبخاتە سەرشانم و پێمبڵێ: «ئەو ئازارانەی ئێوە ماندووم دەکەن، چاوم لێتانە، شەوانە بەدرەنگەوە دێم و تەماشای کاسەی نان و هەموو ژوورەکان دەکەم، رۆژبەڕۆژ

سەیری جلکەکانتان دەکەم، پێڵاوەکانتان دەبینم خۆشیم لێدێ، چاوم لەسەرتانە، چەندەم پێخۆشە گەورەبوون و خەریکە باڵدەگرن، دەتانەوێ بفڕن و هێلانەکە جێبهێڵن؟»

بابم هەر دەتگوت زیندووە، قسەکانی زۆر بە ڕێوجێ دەکردن، من هەرگیز بابم نەبینیوە، بەڵام ناسیمەوە چونکە وێنەی بابم لە رووومەتی دایکمدا دیاربوون، رۆژنەبوو بابم نەبینم و لەگەڵم پێنەکەنێ. ئەو لە پرچەکانی دایکمدا دەهاتودەچوو، دایکمی ماچ دەکرد دەستی بەسەریدا دێنا. بە فەقیانەی سپی و گۆچانێکی دار بەلاڵووکەوە خۆی نیشاندەدام.

باوکمم دەدی، رۆژێک گوتم: «دایە ئەو رۆژە باوکمم لەبەردەمی قوتابخانە بینی راوەستا بوو، منی بینی و بزر بوو، خەریکبوو هاوار بکەم، هێندەی نەمابوو دڵم راوەستێ.»

دایکم گوتی: «دەی بابی ئێوە هەر زیندووە، لە ئاسمانە دەگەڕێتەوە.»

ئەو قسانەی نەیدەهێشت بێ هیوابین، نەیدەهێشت بکەوین. ئەو ئومێدە لەگەڵم گەورەبوو، ئەو شەوانەی لەگەڵ ئەیوب لە باوەشی یەکتری دەخەوتین، هەستمدەکرد باوەشم لە بابم داوە، لە ئامێزی ئەیوب دا خەوم لێدەکەوت. ئەیووب لە من باخۆشتربوو، هەستی بە زۆر شت دەکرد، نەیدەویست نیگەران بم.

دەیگوت: یاقوب تۆ گەورە دەبی و منیش گەورەتر، شەوانە بۆی باسی زۆر شت دەکردم و بۆنی بابمی لێدەهات، سەرنجم دەدایە دایکم زۆر کەیفی بەو برایەتیەمان دەهات،

لەبەرخۆیەوە دەیگوت: یاخوا بەقوربنتان بم، ئەمن دەمرم بەخوای لەخۆشی ئێوە.

لە قوتابخانە هاتمەوە دەستم تەزی بوون پێڵاوم پڕ ببوون لە شلّتوشۆ، کتێبەکانم لە نایلۆنێک پێچابوون و بە جیرێکی پان بەستبوومن، لێم بەربوونەوە ترسام کتێبەکانم تەڕ بووبن، ئاخر بەسەر دەم و چاواندا کەوتم. لەپشتمەوە باوکم یەخەی پالّتۆکەی گرتم و بەرزی کردمەوە، باوەشم لە کتێبەکانم نەدەکردەوە. هەلّیساندم و وەکو غەیب بزربوو. گوتم: (بابە، بابە.)

وام هەست دەکرد پێمدەلّێ: (لەهیچ شتێک مەترسێ، وەک تارمایی بەدواتەوەم، وەک هەتاو دەخزێمە ناو هەناوتەوە.)

ئەو شەوانەی دایکم نیگەرانە باوکم دێتەخەونم، بەوە دەزانم دایکم کێشەیەکی هەیە یان نەخۆشەو نایەوێ لەلای ئێمە بیدرکێنێ، یان خەمێکی دیکەی هەیەو پێمان نالّێ. ئەوە راستییەکە، پێش هەر ڕوودانێک ڕوویدا، دایک دەزانێ.

زۆر بیرم کردەوە، چۆن بەو حالّەوە دایکم جێبهێلّم و لەو ڕەوشە خراپە بیدەمە دەستی قەدەر. ئەی ڕیحان، خۆ ئەویش بۆ من زۆر سۆزبەخش، دلّنەوایی و ئاسوودەیم پێدەبەخشێ. وێنەی ڕیحان کە لە نەخۆشخانەبووم لەلای خالّم، بەهێواشی دەیدواندم و هەستم نەدەکرد تەنیام، بەردەوام ئەو وشانەی ئەوم لە خەیالّ بوو کە دەیگوت: «دەبێ مالّێکی رەنگین و گەرم و گوڕ دروست بکەین، دەبێ مندالّەکان بە جوانی پەروەردە بکەین، ناوم بۆ مندالّەکانیش داناوە، با دوو مندالّ زیاتر نەبن.

تۆ حەز بە منداڵی زۆر دەکەی؟ -تۆ چۆنت پێباشە با وابێ. حەزدەکەم یەکەم منداڵمان کچ بێت.»

تێڕوانینی ڕیحان پێچەوانەی دەوروبەرمان بوو. بەلامەوە گرنگ نەبوو یەکەم منداڵ کچ بێت یان کوڕ، ئەوەی بەلامەوە گرنگ بوو بتوانین ئەو ژیانەی دەمانەوێ ئەوەبێ. زۆر دڵم نەدەهات ئەیوب لە دنیای خۆی داببڕم، وا چووبوە ناو خەیاڵ و فەنتازیای خۆی، هیچ ساتێکی بەفیڕۆ نەدەدا.

تێکەڵی موناجات و سرووتەکانی ئاینی ببوو، مەولانای دەخوێندەوە گەر ئەو ساتانەی خەریکی خوێندنەوەی دیوانی مەحوی دەبوو، یەکپارچە دەبوو بە سۆزو میهرەبانی. دەیگوت:

«یاقووب وەرە گوێ لەو شیعرەی مەحوی بگرە»

بپرسە حاڵم، ئیهمالی وەفا بەس

بترسە تۆ لە حەق، جەورو جەفا بەس

بەکامی غەیرو بێگانە، براله!

بەری بوونت لە یارو ئاشنا بەس

ئیلاهی بێبەلابێ نەخلی باڵات

بەری بۆ من بەلابوو، هەر بەلا بەس

نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید

وەرە با تۆبە کەین، ئیتر ڕیا بەس

خودا ئەم دەردەی عیشقەم لێ نەکا کەم

هەتا هەم بەس لەباتی هەر دەوا بەس

ئەوەی ئەو ویڵیە بورجی زەمینە،

دەبەس بڕوا مەسیحا بۆ سەما بەس

ئەیوب لە زیکری خۆیدا هەمیشە بۆ جیهانێکی دیکە دەڕوانی، ئەو کوڕە گەر عیشقی خوداو بیروباوەڕەکەی لەدڵدا نەبا، پەنای نەدەبردە بەر شیعر. من خەریکە بۆ عەشقی ڕیحان باڵدەگرم, دەفرم ناتوانم بۆ هیچ کات لەبیری بکەم. بەردەوامی من لەگەڵ کتێبەکان، هۆکاری ئەوەیە ڕیحانم لێ دوورناکەوێتەوە، ئەدی ئەیوب چۆن بتوانێ لە خالقی خۆی دووربکەوێتەوە. نا، نامەوێ لە هەستی بدەم، دەبێ بەردەوامبێ ئەو بەمانای وشە عاشقە. دەمگوت: «کاکە هیچ خەمی ژیانت نەبێ، لەسەر بەردیش بێ بەشی خۆمان پەیدا دەکەین.» دەمزانی شعوری هێندە بەرز بوو بە شەرمەوە دەیگوت: «ئاخر خۆمن دەبوو ئەو ئەرکەم بینیبا نەک تۆ. تۆ لە من منداڵتری بەبیرمدێ تۆ لەدایکبووی، تۆ پاش بابی، نەدەبوو هێندەم ماندوو کردبای.»

دەمزانی نیگەران دەبێ، منیش هەستی ئەوم دەخوێندەوە، دەمگوت: خۆ هیچ نەبێ پێدەزانێ و سپڵەنییە، هەموو بەیانییەکیش پێش ئەوەی نانبخوات دەستی دایکم ماچ دەکات. دایکم زۆر دڵی بە ئەیووب خۆشەو دەڵێ، کوڕەگەورەکەم هەر لە ئەولیایان دەچێ، زیانی بۆ مێرووولەیەکیش نییە، هیچ دەنگیش بەرزناکاتەوە، بەوییێ بیست و چوارسەعاتە سەر لەسەر کتێبان هەڵنەگرێ. دایکم زۆرجار پێیدەگوت: دەڕۆڵە

بەسە کەمێک واز لە کتێبان بێنە خۆ خەریکە چاوان دادەنێی، وا بڕوا لاڵ و کەڕیش دەبی، ئەو دنیایە ئاو بیبات هەر ئاگاشت لێنییە، لەبەرتومە کوڕی خۆم بەخوای پەرۆشی تۆمە.

ئەیووب خۆی تێکنەداو بە زەردەخەنەوە سەری بەرزکردەوەو لە دایکم راما، تەماشایەکی پەنجەرەکەی کردو گوتی: «ئەو کتێبانە باسی تۆدەکەن دایە، کێ بە خوێندنەوەی دایکی چاوی کوێردەبێ. وا هەستدەکەم رۆژبەڕۆژ تۆ دەخوێنمەوە. باسی ئەو تیشکە دەکەن کە رۆژانە خۆر دەینێرێ بۆ ماڵەکان. باسی نووری خودا دەکەن. ئاخر خۆ من عاشقی خۆڕاگری تۆم و دەمەوێ ئەو هەموو لەسەرخۆیی و خۆڕاگرتنەی تۆ لە کتێبەکاندا وەبینم بۆیە نامەوێ لێی دوورکەومەوە.»

گوێم لێبوو دەیگوت: «خودا هەموو شتێکی جوانی پێبەخشیوم، مادام ئێوەم هەیە لەهیچم کەم نییە هەر پەرۆشی تۆمە دەنا چۆن دڵت خۆشدەبێ وابکە.»

لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «چاوی دایەت کوێربێ یاقووب هەر بە منداڵی گەورەبووی نەتتوانی تامی منداڵی خۆت بکەی، هەروەک بابت بەرپرسیارێتی ماڵداری و خەمەکانی ئێمەت خستە ئەستۆی خۆت. نەمردووم ماڵ و حاڵی ئێوەم بینیوە ئەوجار با بمرم.»

ئەوەندە هۆگری ئێمە ببوو وەک شێتان لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد، جارجارەش لەبەرخۆیەوە نارەنارێکی دەکرد، هێندێک جار لەناوەڕاستی گۆرانیدا پێدەکەنی و دەیگوت: «دەڵێی جندم لەسەرن بەو تەمەنەو بەو کاکۆڵە سپیانەوە من و گۆرانی.»

دایکم عاشق بوو عاشقی ژیان و منداڵەکانی بوو. گەر ئەو ئەوینە جوانەی نەبوایە نەیدەتوانی بەرگەبگرێ. وەلات و نیشتمانیشی زۆر خۆشدەویست. وشەی هێندە پەتی و کوردانەی بەکاردێنا دەتگوت (هەنبانەبۆرینەیە.) زمانێکی شیرین و جوانی هەبوو، دەیزانی من و ڕیحان یەکتریمان خۆشدەوێ. دەیزانی چەندە هۆگری ئەوم. بۆیە دەیگوت: «تۆ دڵت نایە ئێرە جێبێڵی دەنا دەزانم کەڵکەڵەی ڕۆیشتنت چۆتە مێشکی.»

بە پێکەنینەوە: «خۆ پێمناخۆشنییە ئەوەندە هۆگری ڕیحانی، ئەوان وەک خێزانی خۆمان وان، ڕەچەڵەکیان دەناسم لەوی چاکترمان دەستناکەوێ.» ئەو هەموو خۆشەویستییە کاریگەری خراپی لەسەر دایکم دروستکردبوو ڕۆژبەڕۆژ کێشی دادەبەزی و لاواز دەبوو. زۆرجار کە دەهاتمەوە دایکم لە بێلایە دەخەوت جاجمەکەی بەسەرخۆی هەڵدەکێشا، هەرهێندەی منداڵێک قەبارەی دیاربوو، هێندە بچووک دیاربوو دەمگوت دایکم ڕۆژبەڕۆژ لە کەمی دەدا دەترسام بەجێمانبێڵێ و هەتیوبین. تا ئەو بمێنێ وادەزانم باوکیشم هەرماوە. ئاخر شێرەژن بوو، گوێم لێبوو زۆربەی خەڵکی دەیانگوت:

دایکی ئێوە هەمیشە دژی زوڵم و زۆرداری بوو. لە شەڕی ئاغاو جوتیاردا لەپێش پیاوان دەڕۆیشت. شەدەیەکی ڕەشی لەسەری دەبەست و پڕ بە گەرووی هاواریدەکرد، دەبێ ئاغاکان بزانن ئێمە چیدیکە قەبووڵی ناکەین بمانچەوسێننەوە، زەوی کێ ڕەنێیوی بێنێ بەرهەمەکەشی بۆ ئەوە. دەیانگوت ژنی سەمەدی چەرموو توانیویەتی کاریگەری لەسەر ژنانی

دیکەش هەبێ. خۆی خۆشەویست کردووە کەس نییە راوێژی پێنەکا. بۆیان دەگێڕامەوە دەیانگوت: دایکی تۆ لە ریزی پیاوان بوو کەس زاتی ئەوەی نەکردووە چاوی خەیانەتی لێبکا. بست بە بست بالآم دەکرد، ئەو پێناسەو روانیینە بۆ خێزانەکەمان هاندەری زیاترم بوون بۆ سووربوونم لەسەر باوەڕەکەم و هۆگربوونیشم بۆ دایکم و دەوروبەرم.

لە دووریانێکدا بووم، خەڵک حاڵی باشنەبوو، دەستەنگی و قاتوقڕی رووی لە هەمووان کردبووە، ئەوە هەر ماڵی ئێمە نییە بەدەست بێ ئیشی و نەبوونیەوە هەراسان بووە، دەورو پشتیشمان هەروان، ئەوەی دەمی دەکاتەوە لەو حاڵە ناڕازییە.

# بەشی پانزەهەم

خەریکی ڕێکخستنەوەی کتێبخانەکە بووم، پیاوێکی باڵابەرزی گەنمڕەنگ سڵاوی کردو گوتی: «من خەڵکی ئێرە نیم، لەدوای ڕاپەڕینەوە کەوتوومەتە ئەوناوە، بەدوای کارێکدا دەگەڕێم هاوسەرەکەم تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە، هیچ دەرامەتێکیشمان نییە، سێ منداڵیشم هەیە هەرکارێک هەبێ دەیکەم. ناچارم بۆ ئەوەی ژنەکەم نەمرێ بەردەرگای هەرکەسێک بماڵم، دەپاڕێمەوە دەڵێم خوایە دوژمنەکەشم بەحاڵی من نەبێ. منداڵەکانیشم بێ دەرەتانن لێرە کەس شکنابەم. تۆ وەک گەنجێک گەر ئاسۆیەکت پێشکەێ دەردی من دەرمان بکەی.»

دەستم بۆ چەکمەجەی دووکانەکەم برد کەمێک پارەی تێدابوو دوو ڕۆژ بوو ئەوەی فرۆشتبوومان هەڵمان نەگرتبوو، جیرەیەکم لێبەست و نەمژمارد، بۆم ڕاداشت گوتم: «سەرەڕای حاڵی خراپی ئێمەش لەو دووکانەدا هەر ئەوەندەم لەدەستدێ.»

بە نیگەرانیەوە گوتی: «سپاس، دەستتخۆشبێ، من پارە وەرناگرم ئەوە بۆمن کیفایەت نییە، نامەوێ فێری ئەوکارەبم، دەمەوێ کرێکاری بێ ئیشێکی ماڵان بێ، حەمباڵی بێ، واتا هەر کارێک هەبێ دەیکەم، ئەوەش دەزانم حاڵی کەس باشنییە بەڵام ئەگەر دۆستێک پێویستی بە کەسێکی وەک من هەبوو

ئامادەم هەموو کارێک بکەم، لەبیرت نەچم و دێمەوە سەرت لێدەدەم.» بەدڵێکی بێ ئومێدی دەستی درێژکرد تۆقەیەکمان کرد، دوو دڵۆپ فرمێسک بە رووومەتییەوە بوون، پەنجەی گەورەی کۆڵ بوو، بە پەنجە کۆڵەکەی فرمێسکەکانی سڕینەوە, رووی وەرگێڕاو خواحافیزی کرد. کەوتمە بیرکردنەوەیەکی قووڵ و خەمێکی دیکە هاتەناو خەرمانەی خەمەکانم. نەمدەزانی نە بۆخۆم بگریم نە بۆ ئەو خەڵکە، لە هەستی خۆمدا جوانی وێنەی ئەو پیاوەم یاداشتکرد تا لەبیرم نەچێتەوە.

دەمگوت: ئاخر کاری چی؟ بۆ ئەو وڵاتە هیچ خێری تێداماوە، تا ئومێدێکی تێدابێ. ڕەنگە هەزاران خێزانی ئاوا سەرگەردان لەو ناوچەیەی ئێمەدا هەبێ، ژیانی هەر تاکێکی ئەو کۆمەڵگایە تەماشا بکە بۆخۆی شێرپەنجەیەکە، هەموو خێزانێک گرفتاری ئەو دڕدۆنگیە بووە، ئاگر لە زۆر ماڵدا ناکرێتەوە، قات و قڕی بەربینگی بە خەڵکی گرتووە، دڵنیایی و ئاسوودەیی بەدیناکرێ، باشە دەتوانم چی بکەم؟ ئەو پیاوە ئومێدی لەسەرمن هەڵچنیوە، پارەکەشی لێوەرنەگرتم، خۆزگە پارەکەی لێوەرگرتبام ئاسوودە دەبووم. پرسیارم لە خۆم دەکرد ئەو پیاوە بۆ چی هانای بۆ من هێناوە؟! بەژوورکەوتنی لام غەریب نەبوو، دەتگوت هاتووە کتێب و پێداویستی خوێندنەوەی بوێت، بەلای کتێبدانەچوو، خودایە من کوێم لەوە دەچێ بتوانم کار بۆ خەڵک پەیدابکەم، گومانم بۆ زۆر شتێدیکە دەچوو، دەمگوت: دەبێ کارێکیدی نەبێ؟! بیهەوێ خۆی لەمن نزیک بکاتەوە، بۆچی من چیم تا ئەو پیاوە بیەوێ خۆی نزیک

بخاتەوە. دەنگەدەنگم لەگەڵ خۆم پەیداکردبوو، بەو پرسیارانە سەری خۆم ئەستوور کردبوو. ئەو پیاوە بەهێزبوو، شکۆی درەوشاوەی هەبوو، قەبووڵی نەکرد ئەو برە یارمەتییەم لێوەربگرێ، هیچ بەکەسێکی خراپ نەدەچوو، یان فێڵباز و سەختەچی بێ، فرمێسکم بەچاوەکانییەوە بینی، سەغڵەتی کردم، ئەو فرمێسکانە گەواهی ئەوە دەدەن نیەت و دڵی خاوێنە، نا، نا، هەرگیز لە کەسێکی درۆزن و تەڵەکەباز ناچێ، ڕەسەنزادەیە، باشە گەر کەسێکی سووک و فێڵبازبا پڕی دەدایە پارەکانی دەستم.

دڵم بەوە خۆشە دێتەوە لام، کە گەڕایەوە دڵنیام هیچم لەدەست نایە، دەبێ خەجاڵەتی بکێشم، دەی خۆشم زۆر بێکارم، ئەو کارەی من بەحاڵ دەتوانین مەمرە مەژی دوو خێزان چاویان لەو برە پارەیە دەستمان دەکەوێ، دەزانم ئەوجار بێتەوە، هەواڵی مردنی هاوسەرەکەیم پێدەڵێ، ئەوە کارەساتە بۆ خێزانەکەی، بۆ منیش جێگەی نیگەرانیە، فرمێسکەکانی ئەو پیاوەم لە یاد ناچنەوە، هیوادارم بەوشێوەیە نەبێ، گەر بێتەوە هەواڵی دەستکەوتنی کار و باشتربوونی هاوسەرەکەیم پێ بڵێ.

بەگژ ئەو خەیاڵانە داچووبووم، دەستم لە کتێبەکان وەردەدا، خەریکی ڕێکخسنیانبووم و بیرم لە کۆکردنەوەی خۆشم دەکردەوە زۆر پەرتبووم، دەستم هەر دە کتێبەکاندابوو، دەمگوت: دەبێ ئیشێکی باشتر پەیدا بکەم، کەللەم پڕببوو، لە خەیاڵی ئەوە دابووم دەمگوت: دەبێ ئەو خەڵکەی دەوروپشتم، وکو من سەرگەردان و پڕ ئەندێشەبن؟!

چێشتەنگاو بوو گوزەرەکە جممەی دەهات، دەرزیت هەڵاویشتبا بە عەردی نەدەکەوت، ئەو هەموو ئاپۆرایە دەتگوت ڕۆژی حەشرە، دوو دوو سێ سێ بەیەکەوە قسەیان دەکردوو جارجارە دەنگی بڵند و پەڵەکەنووشت گوێ لێدەبوو، گۆرەپانی بازاڕەکە کەسی دیکەی نەدەبرد، شان شانی دەسمی، ئەو خەڵکە بەشی زۆری بەدوای کارێک دادەگەڕا، لەسەر شۆستەکان جێگە نەمابوو سەرجادەکانیش ڕێگەی سەیارەیان نەهێشتبۆوە، خوا نەخواستە نەخۆشێک یان ژنێکی دووگیانت پێبا بردبات بۆ نەخۆشخانە، ئەگەر حاڵی جێگەی مەترسیبا ڕەنگە گیانی سپاردبا، زۆر جار هۆڕنەی ئۆتۆمۆبیلەکان سەدایەکی ناقۆڵای دروستدەکرد، شۆفێرەکان بەدەنگی بەرزو کەمێک گلەیی و تووڕە بوونەوە هەرایان لە خەڵکەکەی دەکرد، گەلێک جاریش شوفێرەکان دەکەوتنە بەر توانج و قسەی ناخۆشی خەڵکەکە، دەی کاکە عەیب ناکەی هۆڕنە لێدەدەی؟ دەی باشە ئەی ئێوە بۆچی سەرجادەکە چۆڵ ناکەن باشە ئەوێ کوا جێگەی ڕاوەستانە؟ دەی بڕۆ لەسەری مەڕۆ، من لە حاڵی خۆم وەڕەزم، بەخوا لەخوایەکم دەوێ، باشە برا باشە بمبوورە... بە دەنگی هۆڕنەکان خەڵکی سەرجادەکە قووشقی دەبوون و لێکڕا ئاوڕیان دەدایەوە، کۆبوونەوەی ئەو خەڵکە بەشی زۆری بەدوای کارێک دادەگەڕا، بەشێکیشی هەر ڕاهاتبوو، سبەینان زوو خەبەری دەبۆوەو پەلەی بوو تا دەگەیشتە ناوبازاڕ، بێ ئەوەی کارێکی هەبێ وەک خوویەکی هەمیشەیی لێهاتبوو. خەڵک لەگەڵ تری خۆی بەشەڕدەهات، تووڕە بێ تەبیعەت، ئەو حاڵەتە ڕۆژ بەڕۆژ پەرەی دەستاند، ڕۆژانە شەڕو جنێودان و قسەی

ناشیرین بازاڕی تەنیبوو، خۆیان لە شۆفیرەکان تووڕە دەکرد دەیانگوت: ئەی چیبکەین بێ ئیش و کارین، گەرکارێکمان دەستبکەوێ ئێمەش لێرە کۆنابینەوە. ورد سەرنجم دابوو بەشێک لەو خەڵکە نیتاقیان بەستبوو، جلکی ئیشکردنیان پۆشی بوو، بەردەمی دووکانەکەی منیش یەکێکیدی نەدەبرد، دەمگوت: بەدبەخت ئەوەتا وەرە ئەو ئاپۆرایە ببینە بۆکار تا ئێوارە لەسەر جادەن، کوا ئیش دەستی تۆ دەکەوێ؟ دەی چۆن دەتوانی ئاسوودەیی بە ژنە نەخۆشەکەت ببەخشی؟

تلانەوەو ناڵین و ئازاری هاوسەرەکەت، شێرپەنجە قەراری لێهەڵگرتووە، فرمێسک و بێ نازی منداڵەکان و خەمێکی وا گەورە چۆن فریای ئەوە دەکەوی هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵمژی؟ بۆمن خۆشتر بوو، ئەو برە هاوکارییەت وەرگرتبا، دڵم ئۆقرەی دەگرت، خۆم پێ سەرکەوتوو بوو، دڵم بەوە خۆش دەبوو، بەدەستی بەتاڵ نەچووبایتەوە، هیچ نەبا هاوسەرەکەت بزەیەکی ئاسوودەیی کردبا، ئەو کات ماڵێک دەگەڕایەوە دۆخی ئاسوودەیی، بۆ من خۆشتر دەبوو، ئەوکارەت لەگەڵ کردبام، دەمتوانی بەردەوام بم، دەمتوانی سەرم لێ نەبڕیبان، بەشی خۆم دەمتوانی دەستی هاوکاری نەبڕم و بەردەوام بام. بۆ ئەوکارەت لەگەڵ نەکردم؟ خۆمن ئەوڕۆژانەی نیگەرانییەک سەرم لێ دەدا، بابم دێتەوە، بەنیگایەک حاڵیم دەکا، هیوام بۆ دەگەڕێنێتەوە، بابم لە ڕووی دایکمدا خۆی نیشان دەدا، وەختێ دایکم خەفەتبار دەبێ بابم دێتەوە لای من دەخەوێ و بەچپە قسە لەگەڵ ئەیووب دەکا، دەست بەسەرم دادێنێ و دڵنەوایی دەڕژێنێ، هانمان دەدا بۆ

چاکە، بۆ دەستی هاوکاری. بەنیگای دایکمەوە بابم کەمێک خۆی نیشاندام، ویستی قسەبکا، ڕەشەبا دەرگەی حەوشەکەی ئێمەی توووند پێوەدا، بابم بزربوو، وەک جادوویەک دووریان خستەوە لە من! سەرەتایەک بوو بۆدروستبوونی خەمێکی قووڵ، هەروەختێک بابم چرکەیەک خۆی نیشاندابام، ئەو ڕۆژە ڕووداوێک بۆمن دەهاتەپێش، بەڕەنگی فریشتەکان دەهاتە بەرچاوم، لێمان خافڵ نەدەبوو، دەستی پێمانەوەبوو، چاوی لەسەر ئێمە لانەدەبرد، ئەوکاتەی دەستم بۆ چەکمەجەکەی دووکان برد، هەستم کرد بابم پێمدەڵێ چی لەدەستت دێ بیدەیە، بادەستت کراوەبێ، بەوکارانەت ئاسوودە دەبم، گوتم: بابە ئەو دوو ڕۆژە چیم پەیداکردووە دەیخەمە بەردەستی، تا هەمیشە لەگەڵم بی. وا لە نیگای بابم دا دەمخوێندەوە، حەقم بەسەری وەنەبێ، خەڵکی کوێیەو چ کارەیەو چیدەکا، هەرکەسێک داوای هاوکاری لێکردی کەمتەرخەم مەبە، گەر هیچیشت لەبەردەست نەبێ، دەتوانی بە دواندنێکی خۆش و دۆستانە دڵخۆشی بکەی، لەڕووی ڕوحیەوە هەست بە ئاسوودەیی دەکا.

پەیدابوونی ئەو پیاوە لە دووکانەکەم، وەک ئەوە دەچوو تاقی بکرێمەوە، ئاخۆ دەتوانم لە ئاستی ئەو پەروەردەییەی دایکمدابم؟! خۆرسکی گەیشتم بەو قەناعەتە، دەبێ بەردەوام بم لە یارمەتیدان و هاوکاری لێقەوماوان، نابێ ڕێنمایی دایکم و سێبەرو خەسڵەتەکانی بابم فەرامۆش بکەم. بەداخم ئەو پیاوە ڕۆیشت و لە بەرچاوم بزربوو، نەمتوانی ڕوحی سەمەدی چەرموو ئارام بکەم، لەناخەوە بابم، دنەی دەدام و

دەبێ وێڵ بم و بەدوای ئەو پیاوەدا بگەڕێم، تا لە دووکانەکەم دەرکەوت و سوڕایەوە چاوم لەدووی بوو، بەڵام نەمتوانی چیدی بیبینم و ڕۆیشت، دڵم بەر زەبرێکی پڕ ئازارکەوت، زیاتر من دەمەویست، ڕێچکەی دایکم و سەمەدی چەرموو بپارێزم، ئەوان بەوە ئاسوودە دەبوون ئەو پیاوە هاوکاریەکەی وەرگرتبا.

حەقی ئەوەی هەبوو ناونیشان و گەڕەک و شوێنیماڵەکەیم وەرگرتبا، دەی ئەوکات گەر گوتبای کاکە خۆ تۆ پۆلیس نیت، چ کارێکت بەماڵ و شوێنی منە؟ خەیاڵم وێرانی کردم، باشە چیمپێدەکرێ، بەس پەرۆشیەکەو هیچیدی. ڕاستە پەرۆشی بوونیش بەشێکە لە تایبەتمەندی خێزانی سەرکەوتوو.

بەشی شازدە

یاقووب لە یاداشتەکانیدا، تیرۆرکردنی هاوڕێ ڕۆژهەڵاتییەکەی وەک کابووسێک لە دەفتەرەکەیدا تۆماری کردبوو، دەنووسێ:

کاتی دووکان داخستن بوو، دارای هاوڕێم گوتی: «درەنگ هاتمەوە، کارێکم بۆ هاتبۆپێش، دەبوو ئاگادارم کردبای، بەڵام زۆر بەپەلە ڕۆیشتم. بیرتە هاوڕێیەکمان هەبوو خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، دکتۆر ڕەسووڵ چەند ڕۆژە دیار نییە بێ سەروشوێنە، برادەران پێیانوایە جمهوری ئیسلامی ئێران دەستی لەو کارەداهەبێ، لە ڕێگەی برادەرێکمەوە

ئاگادارکرام، بچین دەورو بەری شار و دەشت و دەر بگەڕێین بەڵکو سۆراغێکی بزانین.»

بەو هەواڵە داهێزام و بیرم بۆ زۆر شتی نەخوازراو چوو. لەبەر خۆمەوە دەبزڕکام، قسەی بێ سەرەو بەرەم دەکردن، شۆک بووم، ئاخر بۆچی دەبێ کەسێکی ئاوا ئیشخۆش و دڵخاوێن و ماندوو، کاری لەو شێوەیەی لەگەڵ بکرێ؟ هۆگربوونی بۆ خەڵک، بێ ماندووبوون بوو. لەگەڵ ئازاری هەموو کەسێک دەژیا، زۆر جار دایکم دەیگوت: لەگەڵ ژەهریش دەخورێتەوە، خوێن شیرین و لەبەردڵان، خۆی پێ لەکەس گەورەتر نەبوو، سەدان جار لە گفتوگۆ و بەرکەوتەکانیدا دەیگوت نۆکەری هەموو کەسێکم، بچووک و خزمەتکاری خەڵکی بەشەرەفم، نیشتمان و وڵاتم وەک دایکم دەپارێزم. تۆزێک خۆم بەوە ڕازیکرد، دەمگوت: دکتۆر ئەو فێڵانەی هەن، دەیەوێ تاقیمان بکاتەوە، بزانێ تا چەندە پەرۆشی ئەوین. هیوادارم خۆی شاردبێتەوە، لەناکاو خۆی بە ژووردا بکاو دڵمان ئاسوودە بکا. دارا ویستی تۆزێک بابەتەکە هێوربکاو گوتی: «دڵم بۆشتێک دەچێ، ڕۆژێکیان لای من درکاندی، کە لە فرسەتێکدا سەری دایک و براکەی بداتەوە، چونکە دکتۆر ترسنۆک نییە، دەیگوت هێندەم خەڵکی باش دۆستمە، گەربچمەوە ڕۆژهەڵات سێ مانگیش دەتوانم بحاوێمەوە، بۆیە دڵم زۆر ڕوونە.»

سەرێکم بۆ لە قاندوو گوتم: ڕاستە دکتۆر سەرەڕای کاری پزیشکی لەبواری شۆڕشدا چەلەنگ و ئازاو لە خۆبردوو بووە.

سڵی لە هیچ شتێک نەدەکردەوە، لە هیچ شتێکی باش نەدەپرینگایەوە، بەڵێ پارتیزانێکی بە ئاگایە.

ئەو خۆشەویستی هەموو خەڵکە، چۆن دەستیان دەچێتە کوشتنی؟ پەرۆشی و دڵسۆزی دکتۆر مەزەندە ناکرێ، لەسەر گیرفانی خۆی دەرمان و پێداویستییەکانی پزیشکی دەبەخشیە هاورێکانی. ماڵەو ماڵی دەکرد، کێ نەخۆشی هەبا سەری لێنەدەبڕی، خۆ هاورێیەک نەخۆشبووبا ئاگادارت نەکردبا، ئەوە دەبوو خۆت لە دکتۆر شاردبایەوە. توورە دەبوو، دەیگوت: ئەوە خەیانەتم لێدەکەن، لە خۆتانم دوور دەخەنەوە، ئەی نەتانگوتووە کوڕی ماڵێی؟ خۆبەخش و مرۆڤدۆستێکی عەیار بیست و چواربوو، چەندجار قسەمان لەگەڵ کردووە: ئەوەی تۆ دەیکەی ئێمە حەزناکەین، چونکە پەرۆشی خۆت نیت، تۆ دەبێ بیر لە ژیانی خۆت بکەیتەوە، کەمێک لەو هەبلە خەرجییەت کەم بکەوە، دەیگوت: بێخەم بن، زۆرم هەیە، مادام ئێوەم هەیە باکم لە هیچ نییە، ئێوە سەرمایەی منن، ئێوە بە پەرۆشی ساغ و سەلامەتی منەوەن ئەوەندەم بەسە، لە نەیارەکانم دەمپارێزن، وا دەزانم لە باوەشی خێزان و کەس و کاری خۆمدام، دەبینم بێ من پارووتان پێ قووت نادرێ، دەی گەر بۆ ئێوەم نەبێ بۆ کێم دەوێ. دکتۆر زۆر لەوە دڵنیابوو، کەس دڵی نایە قسەیەکی پێبڵێن و پەنجەی لێبدا، بەدۆستەکانی پشت ئەستووربوو، دەمانگوت: هەر دۆست زەفەرت پێدەبەن، تکایە هێندە سادە مەبە سبەی ماڵ و حاڵت دەبێ، لە هەوڵی پاشەکەوت و پێکوەنانی ماڵدابە، ئەی سبەینێ ژیانی هاوسەری پێکبهێنی نابێ شتێکت بە پەراسوانەوە هەبێ؟

بە نەرمە پێکەنینێکەوە سەیری دەکردین و دەیگوت: کاکە من باوەڕم نییە پێڵاوی ژنانە لەبەر دەرگەی ماڵی خۆم ببینم، تا ئێستا کچێک پێینەگوتم خۆشم دەوێ. کۆڕو کۆبوونەوەکانی هەمیشە جەفەنگ و خۆشی بوون، زۆر جار برادەران بە شەهید بانگیان دەکرد، چونکە گوێی لە ڕێنماییەکان نەدەگرت، بەگاڵتەوە دەیگوت:«کەس من ناکوژێ، چیم تا من بکوژن، دەیان قارەمان و پیاوی تێکۆشەری ئازا هەیە لەو نێوەدا ئێمە تێڕا ونبووین، بڕواتان بێ، جمهوری ئیسلامی منی لە بیرچۆتەوە، هێندە سوارچاک و کوڕو کچی باش یاخیبوون لەو ڕژێمە دژی گەلییە، هاتوونەتە ڕیزی هێزە بەرهەڵستکارەکان، ئێمە مانان تێڕا ونبووین، ئێستا گرەوتان لەگەڵ دەکەم، ئاوابچمەوە کاریان بەمن نییە، حەزم لە خزمەتکردن و ماندووبوونە، دڵنیابن هاوڕێیان، دۆستەکانم دەمپارێزن.»

دارا نیگەرانبوو گوتی: «ئەو پیاوە لە سادەیی و دڵخاوێنی خۆیەوە دەڕوانێتە بابەتەکان، لێم ڕوونە خۆی دادەنێ، ئەوجار ئەگەر کارلە کار ترازا هیچ ناکرێ، دەبێ کاڵەکی بە ئەژنۆی خۆمان بشکێنین، هەر ئەوجارە سەلامەت بێ، تووشی ڕووداوی ناخۆش نەهاتبێ، ڕاوێژ لەگەڵ برادەران دەکەین، ئاگای لەخۆی بێت و ئاوا لێی قبووڵ ناکەین. دەبێ سنوورێک بۆ ئەو کارانەی دابنێت، نەیارەکانی هیچ شتێک لەبەرچاوناگرن» چووبوومە ناو خەیاڵی قووڵەوە، بێ ئاگا، لێک لێک پەنجەکانم دەتەقاندن، وەک ئەوەی پێمبڵێن تازە دەست لە دکتۆر بشۆن و چاوتان پێی ناکەوێتەوە. وەختبوو

شێتبم، چاوم تاریک ببوون، دکتۆرم دەهاتەوە خەیاڵ، ڕۆژێکیان گوتی: «نیوەڕۆ دێمەوە، دەمێکە نەهاتووم بۆ لای دایە، ڕنگە ڕامنەگرێت، ئێستا دەڕۆم وەختی دووکان داخستن دێمەوە.»

زۆرم پێخۆشبوو، زۆری پێنەچوو گەڕایەوە تەبەقێک هێلکە و هەندێک میوەی پێبوو، لێی چوومە پێش و گوتم: «ئەوە بۆچی ئەو کارەت کردووە؟»

گاڵتەی بە قسەکەم هات، مۆڕەیەکی لێکردم، لێی حاڵیبووم نابێ چیدی لەسەر بڕۆم! چاوێکی لێکردم و گوتی:«حەزدەکەم ئەیووبیش لە ماڵ بێت، چێژ لە دانیشتنەکانی دەبینم، خواپەرستێکی جوانە، خۆزگە هەموو موسڵمانێک ئاوا خوای خۆی جوانکردبا، لە ڕەوشت و تێگەیشتنی ئەودا، تەبایی و خۆشبەختی و بەیەکەوە ژیان دەبینم.»

گوتم: «ئەیووب بەیانی زوو بە دایکمی گوت، نیوەڕۆ نایەمەوە سەری برادەرێکم دەدەم، بەڵام گەر شەو بمێنیەوە دەگەڕێتەوە.»

پێشهاتەکان باش نین، ئاوا دەستەوستان بین، ئاخر ئەو پیاوەی بەدەست ژنێکی نەخۆش و گوزەرانێکی خراپ و دەستەنگیەوە دەڕووخێت، دیارنەمانی دکتۆر، وەک یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەمان، حاڵ وا بڕوا وێران دەبم، لە پەلوپۆ دەکەوم، ئەو پێشهاتە ناخۆشانە خەمی گرانی و قات و قڕی و خەمی ماڵو حاڵی لە بیربردمەوە. زۆر گوێم لە گەورەکان دەبوو دەیانگوت: تا باخۆشتربی، بیروو خەمت زیاتردەبی،

خەمەگەورەکان واتلێدەکەن بەرگە بگری، تەکانی زیاتر بدەیتەخۆت بۆ دەربازبوون، بگەڕێی بەدوای چارەسەری گونجاو. زۆر هەوڵم دەدا، ئەو خەم و ئاریشانە لە مێشکم دەربکەم، بەڵام نەدەکرا یادوو یادگارییەکانی دکتۆر فەرامۆش بکەم. ڕۆژێکیان لە کن دایکم و ئەیووب دەیگوت: «ئێوە بێخەم بن، ژیان و گوزەرانی ئێوە لەگەڵ ژیان و گوزەرانی منە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، خاوەن کەس و کاری باشم، خۆا شاهیدە لە هەموو شتێک بیمنەت بن، دڵنیاتان دەکەمەوە زۆرشتم پێدەکرێ.»

ڕووی لە من کردوو گوتی: «ویستت بچی بۆ ئێران، ماڵێمان ئاگادار دەکەم، ڕینمایت بکەن.»

دایکم لەو سەرێ گوێی لێبووگوتی: «بەقوربانت بم ئەو کارەمان لەگەڵ مەکە، لە برسان بمرین ناهێڵم منداڵەکانم لێدوور بکەونەوە، تۆش هەر ئەولادی منی فەرقت نییە لەگەڵ کوڕەکان، دەستم دامێنت ئەو کارەم لەگەڵ مەکە.»

دکتۆر بە پێکەنینەوە گوتی: «دایەگیان، خۆ منیش بێ یاقووب ڕەنگە هەڵنەکەم، بەڵام بچێت بۆ ئەودیو دەبێ ئاگام لێبێ.»

ئێمە دەمانزانی دکتۆر پەرۆشیبوو بۆ ئێمە دەیویست هەر هاوکارییەک بەوی بکرێ بیکات. لەوە گەیشتبوومە قەناعەت ناتوانم دایکم و ئەیووب جێبهێڵم. خۆ من هەر بەسەرێکەوە سەرگەردان نەبووبووم، بە هەزاران فکرو غایلەم لە دڵدا زیندانی کردووە. دکتۆر بەدایکمی دەگوت: «دایە بڕواتبێ دایکی منیش ئاوا کۆڵاوە، بێ باوکین و بە هەتیوی گەورە

بووین، سۆزی باوکمان نەبینیوە، باوکم شەهید بووە، جا ئەو دایکەی ئێمە چیماوە نەیکا، ئەوەتا من لێرە لای ئێوەو هاوڕێیانم، ئەوانیش دڵنیام لە خەم و نیگەرانیدا دەژین و دایکم چاوان وشک ناکاتەوە. بەڵام شۆڕش و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕژێم وەک ئەرکێکی ئەخلاقی و کوردانە بە پیرۆز دەزانم، دایکم لە ناچاری دەبێ ڕابێ.»

دایکم ورد چووبووە ناو قسەکانی دکتۆر، خۆی لە وێناکردنەکەی دکتۆردا دەبینی، ناڕەحەتی و دەردەسەرییەکانی خۆی دەهاتنەوە بیر، ئێمە لەو دۆخەی دکتۆر دابووین، دایکم فرمێسک چاوەکانی ماتکردبوون، لە ناخەوە دەکوڵی، بەڵام لەبەر ئێمە خۆی ڕاگرت و خۆی دەخواردەوە. ڕووی لە دکتۆر کردوو گوتی: «ڕۆڵە گیان جیاوازیتان پێناکەم، بۆچی هەموو جارێ ئەو زەحمەتە دەکێشی شت لەگەڵ خۆت دەهێنی؟ هێندە خۆت بە غەریب مەزانە، تۆ دڵنەوایی و جێگەی ئاسوودەیی ئێمەی.»

لەیادو یادگارییەکانی دکتۆردا، مات ببووم، بێهزی کردبووم، دوودڵ بووم، هێندە خۆم هێناوبرد، نەمدەتوانی هەواڵی دیار نەمانی دکتۆر لای دایکم باس بکەم. دایکم بزانێ شێت دەبێ، بە دارای هاوڕێم گوت: «تکایە با جارێ ماڵی ئێمە ئەو هەواڵە نەزانن دایکم لەوەیە بەرگە نەگرێ، دوای نیوەڕۆ دەچین بۆ سۆراغی، بزانین برادەرانی خۆیان هەواڵی نازانن.»

ئەو ئێوارەیە هەموو شوێنێکمانکرد، بن دارو بەردی ئەو دەروو دەشت و شاخە نەما نەگەڕێین، چووین بۆ ڕۆخ ڕووبار و کەندو لەند نەما سۆراغێکمان دەست نەکەوت. بۆ سبەی

وەختی چێشتەنگاو بڵیندگۆی مزگەوتی گەورە، بانگەوازیکرد، تەرمێک دۆزراوەتەوە لە بناری، بۆگەنی کردووە ڕەحمەتی خواتان لێبێ بچن بۆسەر قەبران، بەو هەواڵە چۆکم شکا. دەنگێکی نامۆ لە پشتم هات، یەکسەر دڵم بۆ تیرۆر کردنی دکتۆر چوو. هەبێ و نەبێ ئەوە. بە غار خۆم گەیاندە مزگەوت، بۆگەن ئەو ناوەی پرکردبوو، دەستمان بە لووتمانەوە گرت و وردە وردە نزیک کەوتمەوە لە تەرمەکە، ئاپۆرای خەڵک و پەرۆشیان، ئەوناوەی تەنیبوو کەسێکیدی نەدەبرد، بینیم هەڵمسابوو، لاقێکی تا نزیک ئەژنۆی دەعبا خواردبووی، برین بە پشتە سەری و ناوەڕاستی پشتیەوە هەبوو. ناسیمەوە بە جلکە کەتافیەکەیەوە، تێیڕامام، وامهەستدەکرد دەمدوێنێ: «چەند بەمنتان گوت خۆت خۆت بپارێزە، دەتانگوت هەموو کەس جێگەی باوەڕ نییە خۆتی تەسلیم بکەی، بەڵێ دۆستێک بە حیز فرسەتانە لە دواوە لێیدام، هەرچۆنێکبوو، خەڵکەکەم حاڵی کرد، من دەیناسم و هاوڕێی خۆمە. دڵم پڕ ببوو، خەریکبوو لە هاڕژنی گریانێ بدەم، بەڵام ددانم بە خۆم داگرت، خەریکی شووشتن و کفن و دفن و بە خاکسپارنی دکتۆر بووین. کاتێک چوومەوە ماڵێ، هەرچەند دەمویست بە دەم و چاومەوە دیار نەبێ، ئەختو چارم کرد نەمتوانی، دایکم هەستی بە شێواوی دڵتەنگی منی کردبوو، خۆ ئەوە گومانی تێدا نییە دایک پێش هەموو کەس دەروونی منداڵەکانی دەخوێنێتەوە، ڕوح بە ڕوحی منداڵەکانیەوە گرێدراوە. دایک زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێم ترپەی دڵی مناڵەکانی هەست پێدەکا، هەناسە تەنگییان و خەمۆکیان بە دڵ دەبینێ، لەگەڵ نیگەرانی خەمەکانیاندا دەژێ، چۆن بتوانم حاڵەتێکی وا هەستیار و کارەساتێکی ئەوها

بشارمەوە، دەمویست کتووپڕ ئەو هەواڵە بە دایکم نەڵیم، سەیرمکرد، دایکم ڕاماوە، گوتی: «شتێک هەیە بە منی ناڵێی؟ هەر لە چاوانتڕا دیارە تووشی حاڵەتێکی خراپ بوویت، لیم مەشارەوە، پێمخۆش نییە لە کەسیدیکە بیزانم، تا زووە بیڵێ.»

کۆڵەگریم لە ئەوکێ مابوو، وەختبوو پڕ بە ژوورەوە هاواربکەم، بەڵام هێندە دڵی شکابوو لە ژیانیدا، ددانم بەخۆم داگرت و بە قورگێکی نووساو، بە دڵێکی پڕ، بێحەواس و بەهێمنی گوتم: «دایە دکتۆریان کوشت، بۆگەنی کردبوو، دەعبا لاقێکی خواردبوو، بێ کەس و بێدەر لە گۆڕستان شاردمانەوە، گۆڕەکەمان پەستاوتەوە، نیشانەم کردووە، گەر دایکی ڕێی لێرەکەوت، بچم گۆڕی دکتۆریان نیشان بدەم. دەمویست لێتی بشارمەوە، چەندی کردم نەمتوانی درۆت لەگەڵ بکەم.»

دایکم لە بانگێی دا، گوتی: «ئەی هاوار! چۆن دەستیان چۆتە دکتۆر؟ بۆچی کوشتیان؟ ئای خودایە ئەو هەموو خەمە گەورانە لەپای چی؟!»

ئەیووب بەسەر گریانی من و دایکمدا هاتەوە، ئەویش زانیبووی دکتۆر تیرۆرکراوە، بە نیگەرانیەکی قووڵەوە گوتی: «زۆر بەداخەوە، خوا غەزەبیان لێبگرێ، پەپوولەیەکی ئاوا جگە لە چاکەو پەرۆشی بۆ خەڵکی، شتێکی دیکەی نەبوو، خودا حەقت بستێنێ.»

خۆی نزمکردوو باوەشێکی لە دایکمدا، بە حەزینەوە گوتی: «دایە گیان تکایە بەرگە بگرە تۆ هەموو ژیانت زام و ئازارە.»

دایکم بە هەستێکی پڕزامەوە، فرمێسکەکانی سڕین و شەدەکەی خستەوە سەر سەری و چاوێکی لە ئێمە کرد، هەستمکرد چێ لە چاوەکانیدایە، من و ئەیووب زۆر جار گفتوگۆمان دەکرد، دایکم گوێی دەگرت، دمگوت: « کاکە ئیسلامیبوونی جمهوری ئیسلامی، بە زۆری زۆرداری داسەپاندنی بە سەر ئێرانیەکاندا، ئەو هەموو نا دادیەی ئەو دەستەڵاتە دروستی کردووە زیان بە ئیسلام ناگەیەنێ؟»

زۆر هێواش و نەرم لە وڵامدا دەیگوت: «برای خۆم، ئیسلام و جمهوری بەناو ئیسلامی، زۆر لە یەک جیاوازن، ئەوانەی بەناوی خوداوە خەڵک دەکوژن، بەناوی دینەوە حەرام حەڵاڵ دەکەن، زۆر دوورن لە پەیامی پەروەردگار.»

لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەیووبدا، گفتوگۆکان دەهاتنەوە، ئەیووب دەستی خستە سەرشانم و گوتی: «ئەوە کارەساتێکی جەرگبڕە، دکتۆر کوڕی خۆمانبوو، هێندەی تۆ لای من شیرین بوو، خودا حەقی بستێنێ، خۆ هەر جمهوری ئیسلامی ئەو کارەی نەکردووە، لە هەموو سەردەمەکاندا کاری وا قێزەون کراوە، لە سەردەمی سەحابەکانیشدا، چەندان کاری وا خراپ و ناشیرین، دژی فەرموودەکانی پەروەردگارو پێغەمبەر کراوە بەناوی دینەوە، تکایە با ئەو کارە خراپانە لە سەردین و بەرنامەی خودا ئەژمار نەکەن.»

دەنگم نەکرد، خۆم کڕ کرد، لە تاوی دکتۆری چنگێکم لێمابۆوە، لە ناوخۆمدا دەسووتام و زۆر گریام، هیچم بەبەر وە نەماوە، خۆم لەسەر لاقان ڕا نەگرت دانیشتم. ئەیووب بە پەلە پەرداخێک ئاوی بۆ دایکم هێناو منیشی بەرزکردەوە دەستی

گرتم و بردمی بۆ ژوورەوە پێیگوتم: « تکا دەکەم لە بەر دایکم بە هێز بە، دەچم دایکم دەهێنمە ژوورەوە، خۆ ڕاگربە لای ئەو مەگری، باوەشی پێداکردم و بەڵێنم پێبدە.»

دوای بەخاکسپارنی دکتۆر، تووشی حاڵەتێکی ڕەشبینی و دڕدۆنگی ببووم، لە هیچ شوێنێک دانەدەسکنام، قنیاتم نەبوو، نەمدەتوانی خۆم کۆبکەمەوە، پەرش ببووم، لە حەژمەتی بە ناحەق کوژرانی دکتۆر خەریکبوو لاربیمەوە. سەنگینی بەدەستەوەبوونی ئەو، دەتگوت بۆ دڵنەوایی و سێبووری ئێمە دروست ببوو، مەجلیس و دانیشتنەکانی هەر ئاوەدانی بوون، بە شیعرو پەخشان و گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی شەوق و زەوقێکی پڕ چێژی دەبەخشی، باڵاکورت و گەنمڕنگ بوو، قشتیلەو لەبەردڵان بوو، چاو و برۆ ڕەش، پیماندەگوت: «حەیف بۆ قولانجێکی دیکە باڵات بەرزبا.»

زۆر جار دەیویست گۆرانیمان بۆ بڵێ، دەیگوت: «دەنگم خۆشبا بێتامم دەکرد، دەڵێی میزی بە تەنەکەی دادەکەم، گەر ئێرە بە ماڵی خۆمی نەزانم، ئاوا بێتامی ناکەم.»

ئای دکتۆر ئەو داخە دەمکوژێ، گوێت بە ڕێنمایی و ئاگادارییەکانی برادەرەکانت نەدەدا، دارا زۆر لە من نیگەرانتربوو، گوتی: «ڕیحانم بینی هەواڵی مەرگی دکتۆری بیستبوو، نەیدەتوانی قسەبکا، بە حەزینەوە باسی یادەوەریەکانی دەکرد کە لەتۆی بیستبوون، زۆر پەرۆشی تۆی بوو. پێیوابوو زەحمەتە بەرگەی ئەو زامە قووڵە بگری، ڕێنمایی دامێ کە لێت دوورنەکەومەوە، جا پێویستە تۆش بە

پەرۆش حاڵی خۆتەوە بی، دەزانم زامەکە قووڵە بەڵام ئەوە چارەسەر نییە.»

بەسەر خۆم نەهێنا، ئەو ئامۆژگاریانەم پێخۆش نەبوون، ئەو قسانە زۆر سواو بوون، بەڵام وەختێ ناوی ڕیحانی هێنا، تۆزێک هەوڵمدا هێوربیم و خۆم وا نیشانبدەم کە بێگومان دەبێ خۆ ڕاگربم، گوتم: «کاکە لە دەستدانی دکتۆر گەمە نییە، بۆ هەرکوێ دەچم یادو یادگاریەکانی جێمناهێڵن، ئەو ئازارە کاریگەریەکانی ڕەنگە وێرانم بکا، کتێب و جانتاکەی لە ماڵی ئێمەیە، ئەوەتا قەڵەمەکەشی وەک یادگارییەک هەڵم گرتووە، بەڵێنت پێدەدەم دەیپارێزم، جلک و بەرگ و وێنەکان و شتە تایبەتییەکانی دەدەمەوە کەس و کاری، وەختێک دڵنیام دایک و براکانی پەیدا دەبن، ئای دەبێ چۆن وەڵامی دایکی بدەمەوە! دارا گیان، بیرتە چەند دڵی بە کتێبخانەکە دەکرایەوە، ناڵەی جودایی هەڵدەگرت و بە هەستێکی جۆانی عاشقانە شیعرەکانی دەخوێندەوە، هێمن ئاسا، دەستەکانی لەگەڵ دەجووڵاندن.»

لەگەڵمان دەگوتەوە، ئێمە هێواشتر لەبەرمان دەگێڕایەوە، هێندەی ئێمە زیاتر دڵی بە کتێبخانەکە خۆشبوو، هۆگربوونی بۆ ئێمە ئەژمار نەدەکرا، ئاخر ئێوەم هەبێ چ گەوادێک زەفەرم پێدەبا, پیاوێکی دڵخاوێن و بێمنەت و بە ئیرادەبوو، جۆرێک بە توندی قسەت لەگەڵ کردبا، دەیگوت: «خۆ من بەقسەی تۆ ناکەم، قەت لە تۆ تووڕە نابم، بزانم دڵت گەردی گرتووە هەزارجار داوای لێبووردن دەکەم.»

ئەو حەوسەلە و تایبەتمەندیانەی لە دکتۆر دا هەبوون لە کەم کەس دا هەبوون، یادو یادەوەریت زیندوو، گیانت شاد و ئارام.

بڕیارمدا نەڕۆم، بڕۆم ژیان لە ماڵی ئێمەدا دەبێ بە دۆزەخ، وێرانبوونی دایکم وەباڵەکەی بە ملی من دەبێ، هەرچۆنێکبێ چیمان دەست بکەوێ مەجبوورین دەبێ بە پێخۆرو دەستی پێوە بگرین و ئیدارە بکەین، زەحمەتییەکانی ژیان قەبووڵ بکەین باشترە لەوەی ماڵەکە لە دایکم خراپ بکەین، ئاخر نیگەرانییەکانی ڕۆژ دوای ڕۆژ زۆرتر دەبن، بە تیرۆرکردنی دکتۆر وەک جەرگی سووتابێ، ڕۆیشتنم بۆ هەرکوێیەک بێ بۆ دایکم سەخت دەبێ، قەرارم گرت جێێ نەهێڵم، لە ئەندێشەو خەیاڵمدا، بابم بینی، دەستی خسبووە سەر جانتاکەی دکتۆر، چەند شیرین و لە سەر خۆ گوتی: (ئەوەی دەمویست ئەوەتکرد) سەرم بەرزکردەوە، گوتم: «بابە گیان ئەوە تۆ هەر لەگەڵمدای، بۆ تۆ لە ژیانداماوی؟»

بە پێکەنینەوە گوتی: «تۆ پێویستیت بە من بێ بێگومان بە لەوێ دەبم.» ئەوەندەی گوت و بزربوو، سەرم لە ئامادەبوونی بابم دەرنەدەچوو، دێت و دەردەکەوێت و دەڕوا!؟ وەک بروسکە بزر دەبێ، تارمایی و شێوەی فریاد رەسێک هانامان دەدا، بیرم دەکردەوە خەریکدەبوو شێتبم، بەڵێ شێت ببووم.

کاتێک باسی دەرکەوتنی بابم دەکرد، دەبوومە جێگەی گاڵتەپێکردن، دەیانگوت: «تۆ بە قسەی خۆت وەک کۆمۆنیست و کەسێکی دوور لە خورافیات، چۆن باوەڕ بەوە دەکەی مردوویەک بگەڕێتەوە؟»

دەهاتمە سەر ئەو بڕوایە، دەروونم تێکچووەوە، مێشکم هاڵۆز بووە، ئاوا بەردەوام بم، دەبم بە گرفت بۆ ماڵەوە، بە زووترین کات سەری دکتۆربدەم، گەر ئەو بابەتی بینینی بابم، بچێتە ناو

خەڵکەوە، ئەو متمانەو بوونەم نامێنێ، ئاخر من پاش بابم چووزانم ڕەنگ و شێوەو گفت و لفت و هەڵسوکەوتی چوونە! لە زگی دایکمدابووم، بابی منیان شوێن بزرکردووە، نازانم گۆڕەکەشی لەکوێیە، بەڵێ خەڵەفاوم، خەریکە تەواو دەبم بە کەسێکی خورافی و کەسایەتییەکی کۆنەخواز. دەمگوت: «نا، لای کەس باس لەو بابەتە ناکەم، پێشتر گەر باسیشم کردبێ، خۆم ناهێنمە سەر ئەو باسە، گومانی ئەو خواست و وەڵامانە دەڕەوێنمەوە.»

هاتنەوەی بابم بۆمن، وەک لە دایکبوونێک وابوو، هەتیو بوون و حەزینی لە بیر دەبردمەوە، وەک کێوێک وابوو، لێم ببوو بە تایبەتمەندی، هیوایەکم هەبا دەهات و بۆی دەستەبەر دەکردم، بینینی بابم زۆر شت دەگەیەنێ، خەیاڵم وام لێدەکا، بیرکردنەوەو ئەندێشەکانم، بکەم بەڕاستی، شیعرو شانامە بنووسم بۆ میهرەبانی باوک، سەرم نەوی بکەم بۆ ئەو وێنانەی لە خەیاڵی خۆمدا دروستم کردوون، وێنەکانی بکێشم، ئاخر بابم لە ژیانی خۆیدا وێنەیەکی نەبوو، تەنها وێنەی دەفتەر خدمەکەشی نەمابوو، بەڵام دایکم وای پێناسە بۆ کردبووین وێنەو ڕووخساری لە بەرچاومان دەدرەوشانەوە، باوکم پرچێکی ڕەش و نێوچاوانێکی گنج تێکەوتوو، باڵایەکی مام ناوەندی، تێکسرماو، لە دیدی دایکمدا کەس هێندەی بابم جوان و لە بەر دڵان نەبوو. زۆر شتم لە پێناسەکانی دایکمدا هەڵێنجابوو، سەربردەو ژیان و حەرەکات و سەکەناتی بابم غەریب نەبوون لەلام، ئەوەشم لا ئاشکرابوو بابم چۆن عاشقی دایکم بووە، چاوی دایکم، هەمووی هەر گۆرانی و حەیرانی

بابم بوون، هەمووی هەر پێکەنین و دڵخاوێنی و میهرەبانی بابم بوون، بەڕووی دایکمەوە ئەو تابلۆیانەم دەبینین، دەمدی کەڤاڵ و ڕەنگە ئاوێزەکانی دیدی بابم چەند ڕۆشنکەرەوەی ماڵەکەمان بوون، بوونی بابم لە ڕۆحی دایکمدا جێمابوون، هەر دەربڕینێکی بە قسەکانی بابم ئاوێتە ببوو، بۆیە بابم هەمیشە لامان بوو.

## بەشی حەڤدە

قەیرانەکانی وڵات هەموو کون و قووژبنێکی گرتبوو، یاقووب بە ئەمانەتەوە ڕووداوەکانی لای خۆی هەڵدەگرتن و وردە وردە پەڕی دەفتەرە گەورەکەی پێ پڕ دەکردنەوە. نەیتوانی خۆی لە ئاستی ئەو کارەساتانە بێ دەنگ بکا، ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوە:

قەدەرێکی نەخوازراو، حاڵەتێک خەریکە ژیان پڕ دەکا لە نائومێدی. وێنەیەکی وای درووستکردووە، هەمووان لە ئەستۆی خۆی دادەماڵن، کەس ئامادە نییە بەرپرسیاریەتی وەربگرێ، ئەوانەی دەمی خۆشیان دێننە پێش، تەنها بۆ بەرژەوەندی و خۆ دەوڵەمەندکردن و کوشتنی هەستی تێکۆشان و سڕینەوەی گیانی بەرەنگارییە. لەو نێوەندەدا هەربابایە ئەو وڵاتە جێبهێڵێ و ڕێگەی مەرگ هەڵبژێرێ، خاک و نەتەوەو پیرۆزیەکانی دەبن بە وێنەیەکی ناشیرین و کەس خۆی بە خاوەنی نازانێ، گەنجەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری وتە بەناو بانگەکەی موحەمەد ماغوت، کە دەڵێ: (جگە لە پێڵاوەکانم، هیچ شتێک بە نیشتیمانەکەم نابەستیتەوە.)

ژیانی خەڵکی وای دەخواست هەرکەس ئازابێ وەڵات جێ بهێڵێ، بەنگینە دراوسێمان بوو، برای چوار خوشک بوو، تارژەنێکی کارامە و چالاکوانێکی چەلەنگی بواری لاوان بوو، ڕۆژنامەوانێکی خۆڕسک و کارامە، هەر لە منداڵییەوە کەم

ئەندام بوو بێ دار شەقە نەیدەتوانی هەنگاوێک بڕوا، چی هەیبوو لە ماڵ و ئەشیا کردی بەپارە وەک زۆربەی گەنجانی ناوچەکە ڕێگای هەندەرانی گرتە بەر، لەو کات و ساتەش ڕێگەی هەندەران ڕێی مردن بوو ڕۆژ نەبوو یەختێک نقووم نەبێ، دەریای ئیجە ببوو بە سێ گۆشەی بەرمۆدا، گەنجێکی زۆری وەڵاتەکەم بوونە خۆراکی ئەژدیهاکانی ئیجە. بەنگینە ڕۆیشت و ڕێکەوت ئەو شەوەی وەڕێدەکەوێ، نامە بۆ هاوڕێکانی دەنێرێ دەڵێ: ڕۆیشتم ئیدی من دەمەوێ بژیم، دەمەوێ هونەرەکەم بڵند بکەم، دەمەوێ لەدەست حوتەکانی وەڵات ڕزگارم بێ، هەوڵ دەدەم ژیان مانایەکی دیکەی پێ ببەخشم، نامەوێ ژیان وێنەیەکی ناشیرینم پێ بکێشێ دەمەوێ خۆم تابلۆیەکی ڕەنگین و پڕ ئاوێزە بکێشم.

هەموان لە چاوەڕوانی دەرچوون و سەرکەوتنی بەنگینە دابووین، دەمانگوت: خودا بەدڵی خۆی لەگەڵ دەکا، ئەو دەڕوات بۆ ئاسوودەیی و باڵابوون، لێ جەخار ئەو بوو بە میوانی قرشەکانی ئیجە، ئەو لە ناو دەریا منداڵێک دەخاتە سەر سینگی و لەگەڵ دارشەقەکانی دەربازدەکا، ناهێڵێ منداڵەکە بخنکێ، خۆی دەکا بە قوربانی منداڵەکە، منداڵەکە بوو بەو بەنگینەی نووسینەوەی خنکانەکانی ئیجە بکات بە کتێب، بەنگینەی بچکۆلانە دوای دەورانێکی تر حیکایەت و وێنەی خنکانی ئیجە یاداشت دەکا، مۆرێکی ڕەش لە ناوچاوانی خراپکاران و هۆکاری خنکانی ئەو گەنج و لاوانە دەدا.

دایکم لە پرسەی بەنگینە کە هاتەوە ڕوحی لەبەردا نەمابوو، دەیگوت: گەر گوێت لە نزوولە و گریان و فوغانی خوشکەکانی دایکە بەدبەختەکەی دەبێ جەرگت دەبێ بەئاو.

دایکی دەیگوت: چۆن چاوم بەرایی دەدا کتێبخانەکەت ببینم؟ خوشکە کانی لەبەر یەکتریان دەگێڕایەوە، ڕۆمان و شیعر و چیرۆکەکانی ناو کتێبخانەکە ئێوە جێمان مەهێڵن، ئێوە لەگەڵمان بن، ئێوە دەتوانن کەمێک لە هەناسەی بەنگینەمان بدەنەوە، ئەی چی لە قەڵەم دەفتەرەکانت بکەین کێ دەتوانێ قەڵەمەکەت بگرێتە دەست و پەخشانێکی پێ بنووسێ؟ تاقانە برا هەی ڕۆ هەزارجار هەی ڕۆ!

گوێم لە جیرەی دەرگاکەت دەبێ کزەم لە هەناوان دێ، خۆم گرمۆڵەدەکەم دەڵێم ئەوە بەنگینەیە دێت و دەڵێ خوشکە جوانەکانم قاوەیەکم بۆ دروست بکەن یان چایەکی کەم ڕەنگ.

بەدیار جلەکانتەوە دەیان گۆرانی و حەیرانی سەرچیایی دەڵێین، نازانم چۆن بتوانم گوێ لە مۆسیقا و دێڕی نەخوێندروەی کتێبەتازەکانت بگرم؟ چۆن بتوانم گوێ لە کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبییەکانت بگرم، برای چوار خوشکان، تارەکەت وەک پشتیوانی و دڵنەوایی لەوەتاغی خۆتدا پێشوازی لە هاوڕێکانت دەکا دەبەر هاوڕێکانت بمرین، خودایە تووشی چ کارەساتێک بووین؟!

شاعیرەکان نیشتیمانیان بە کەلاکی تۆپیو وێنا دەکرد، شەڕی براکان و گەمارۆی ئابووری، هێنانی دووژمن بۆ گیانی یەکتری، چەند ڕەوشێکی نا لەبارو قێزەونبوو، کۆمەڵگە غەرقی بێ موبالاتی و بێ ئینتیمایی ببۆوە.

ژنێکی ئەسمەر و کەڵەگەت، قەراغ چاوەکانی بۆر و تاریک ببوون، لە تۆغیانی خۆیدا، وەک خۆر پڕتین و پڕ وزە بووە، بە وێنەی مانگ درەوشاوە بووە، بینم بەدیار چەند کیلۆ ئاردێکەوە وەستاوە تف بارانی دەکا، پیاوێکی ڕیشن، دەستێکی لەشانی دا، گوتی: «بۆچی تف لەو ئاردە دا دەکەی؟ ئەوە قورئانی بۆ فرۆشراوە، کارێکی باش ناکەی.»

ژنەکە گوتی: «نان ڕیسوای کردم، کەرامەتی شکاندم، ناتوانم سەرم بڵێند بکەم!»

نان لای هەموو بیروو باوەڕەکان پیرۆزە، چیرۆک و سەرگووزەشتەکانی نان، لای بەشێکی ئەو کۆمەڵگەیە ڕۆشنە، دایکم زۆربەی جارەکان، لە کاتی نانخواردن بۆی باس دەکردین، دەیگوت: «بابتان لێوە نانی دەخوارد، هیچ کات قەراغی نانەکانی خەسار نەدەکردن.»

خۆکوشتنی ژنان، دزی و تالانی، گەڕانەوە بۆ دەوری خێڵ و درووستکردنەوەی عەشیرەت و پاشەکشەکردن بۆ دواوە، ئاخر حاڵەت هەبووە، ژن بۆ ئەوەی منداڵەکەی لە برسان نەمرێ لەشفرۆشی کردووە.

خەڵک هەمووی نیگەرانبوو، کەس تا ئێوارە لەخۆی ئەمین نەبوو، وایلێهاتبوو دەبێ پشتت هەبێ و خاوەنی کەس و

کاربی، تا پارێزراوبی، تا کەس نەتوانێ بیڕێزیت پێبکا، سەرەڕای تەق و تۆقی مەیدانی چەکفرۆشان و ئازادی چەکهەڵگرتن، تەواو ڕەوشەکەی نالەبارکردبوو. دەنگی تەقەیەکی زۆر دەبیسترا، دەتگوت، تەپڵی سەرکەوتن لێدەدرێ، دایکم هەردووک گوێی خۆی تووند گرتبوو، دەیگوت: «قەت کەسم نەما، دەبێ ماڵی کێ خراپ بێ! خوایە ئەو خەڵکەی چەپاڵە بدەی، زۆربەی خەڵکی زاروو لێویان لێڕەق بوون، ئەو تەق و تۆقە لە پای چی؟»

ڕووم لە دایکم کردوو گوتم: «هیچ نییە، فشەیە، مەیدانی چەکفرۆشانە، بیکەیسی تاقی دەکەنەوە، ها دەنگی بیکەیسی هەردیارە.»

هەر لە خەیاڵی پەیداکردنی کارێک دابووم، کێ کتێب دەکڕێ؟ کێ سەلیقەی خویندنەوەی کتێبی هەیە، ئەمڕۆ کار و پەیداکردنی بژێوی ژیان لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە. سەیرە خەریکبوو ئەو قەناعەتەم بۆ درووستبێ کتێب و خوێندنەوەو نووسین فشەی تەواویش نین. ئەوەی زۆر دەخوێنێتەوە هێر دەبێ، هەست بە بەرپرسیاریەتی و ماڵ و خێزان ناکا، لە ڕووی کتێبەوە قسە دەکا، ئەو سەردەمەی ئەمڕۆ تێیکەوتووین، شەڕی ژیان و پەیداکردنی پارەیە.

بەبیرخۆم دەهێنایەوە نا، نووسین و خوێندنەوە، بناغەی وەدەستهێنانی مافەکانە، برسیبوون و سەرگەردانی میللەتی ئێمە، پشتکردنە لە کتێب و خوێندنەوە. پێویستیەکانی ئێمە بە دونیای دەرەوە، هۆکارەکەی نەخوێندەواری و گرنگینەدانە بە زانست و زانیاری.

نا، هەرگیز کتێبخانەکە تێکنادەین، هەوڵ دەدەین لەسەر ئەو ئیشەمانەوە، کارێکی شایستە بدۆزینەوە. دەمویست بۆ ئەو مەبەستە، پەنا بۆ هەندێک کەسی دیارو شارەزا ببەم، پەشیمان دەبمەوە، بە هۆکاری ئەوەی، مەرج نییە ئەوان لە من شارەزاتربن، خۆم دەبێ کاری خۆم چارەسەر بکەم. خۆ هەر من وانیم، ڕەنگ لە زۆر خەڵکی باشتربم، نەمهێشتووە ماڵەوە ناگزووربن، ژیان هەر ئەوەیە، ئەو دایکە قووڕ بەسەرەی ئێمە بە گەنجی لێی قەوماوە، چۆکیشی دانەداوە، خەڵک هەمیشە وەک نموونە دەیهێننەوە، قسەی پێشینان چەند جوانن˙ تەنگانان بەریان کورتە˙ بەو حاڵە ناخۆش و بێ ئومێدیە دایکم جێبهڵم، هیچ ئازایەتی نییە، ئازایەتی ئەوەیە چۆک بەو زەمەنە ناشیرینیە دابدەی، زۆر گوێم لە ڕاوێژەکانی دەگرت، لە دڵسۆزی و میهرەبانی خۆیەوە، بە دیوە خراپەکەوە شتەکانی دەبینی، پێیوابوو ئێمە هەر منداڵین، دەستی چەپ و ڕاستی خۆمان ناناسین، بەقسەی دایکمانبێ، نابێ تخوونی زۆر شتبکەوین، هەموو ئیشێکی بە ئیشی ئێمەی نەدەزانی، گەر هەڵسوکەوتنەکانی ئێمەی بەدڵ نەبا، بە دەم و چاویەوە دیار بوو، نیگەرانی دایدەگرت. بەتەوسەوە گوتی: «دەزانم بەتەویای چین، چیتان لەبن سەری دایە، گەر کارێک بکەن ئاگام لێی نەبێ گەردنتان ئازا ناکەم، قسەی ناودڵتان دەزانم، وا مەزانن هێندە گێلم، ئەو خورماییەی دەیخۆن دنکەکانی لە گیرفانی مندایە، لێتان دەپاڕێمەوە، ئەو دونیایە هی ئەوە نییە خۆتانی پێوە ماندوو بکەن، خەمی دونیاتان لە کۆڵ ناوە، خەریکی ژیانی خۆتان بن، بیر لە هیچ شتێک مەکەنەوە، تا من هەبم لەسەر لاقی خۆم وەستابم، پێویستتان بە کەس نابێ.

ناحەقی نەبوو، وزە وزێکمان هەبوو، ڕۆژ نەبوو باسی ڕۆیشتن و دوور کەوتنەوە نەکەین.

ئەیووب کەڵکەڵەی ڕۆیشتنی بۆ ئێران هەبوو، بە مەبستی خوێندن و زیاترچوونە ناو دین و پەیڕەوکردنی دین وەک خۆی. لەبەر خۆمەوە دەمگوت: «ئیمان بە ئەقڵیەتێکی باڵا، خوێندنەوەی ناخی بێئومێدی مرۆڤەکان، قەرەبووکردنەوەی ئەو نا ئومێدیەی بە باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی، جۆرێک لە قەناعەتی بنیات ناوە، کارێکی زۆر گرنگ و چارەسەرییە تا لە ڕاڕایی گومان دەربازی بێ.»

ئەیوب توانیبووی بڕوابوونێکی تەواو بە دین و فەڕزو سوونەتەکان و چی دین و قورئان بیڵێ لاری نییە. ئیرەیم پێی دەبرد، زۆر لەسەر دینی خۆی موکووڕ بوو، هەموو شتێکی جوانی لە خودا دا دەبینی. ئەو خودای تەنها لە میهرەبانید دەبینی، ڕووی لە من دەکرد، دەیگوت: «لێرە کەس فێری هیچ نابێ، ئەوەی دەشیزانین لە بیرمان دەچێتەوە، دەترسم ئیمانم بەو نەزانانەی ئێرە لەق بێ، بۆیە تا ڕۆژێک زووتر بڕۆم هێندە لە خوداو ئیمانەکەم نزیکتر دەبمەوە، مەلاکانی ئێرە دۆڕاون، بەرژەوەندی و تەماعکارییان دین و ئیمانی لە بیر بردوونەوە.»

ئەیووب چەندان جار بە شیعرەکانی مەحوی و نالی کۆڕی گەرم دەکرد، دەیگوت: «تەماشا، ئەوانە مەلاو عوولەمای زەمەنی خۆیانبوون و مەلا لەسەردەمی خۆیاندا، چەندە مەزن و درەوشاوە بوون. مەلاو پیاوەکانی ئێستای ئیمان، چەندە جیاوازیان.»

ئەو منگەمنگەی ئەیووب، سەرەڕای دەستەنگی و نەبوونی، ئێمەشی لەخۆی وەڕەس کردبوو، من زۆر حەزم دەکرد بچێت و نەجاتمانبێ. وزەوزی لە پێوەدانەکەی ناخۆشتربوو، سەرە ڕۆیەکانی منیش خەریکبوو دایکم وێران بکەین، دایکم دەیگوت: «نە بەعس و نە ئەوانەی سەمەدی چەرموویان شوێن بزرکردوو، بوو بە دیداری ئاخرەتێ، نەیانتوانی بمڕوخێنن. تا ئێستا بە پێوەم، ماڵم گەرم و گوڕە، چونکە چاوم لە ئێوەیە نەکەوتووم، بەڵام ئێستا خەریکە بە چۆکم دادێنن، دەمشکێنن، خوا لێتان هەڵناگرێ.»

قسەکانی کاریگەری هەبوو، ئەیووبی پەشیمان دەکردەوە، دەهاتمە سەر ئەو باوەڕەی جارێکی تر بیر لە دوورکەوتنەوە نەکەمەوە. دەیگوت: «دایکم پێیخۆش نەبێ بستێکی لێدوور ناکەومەوە، هەرچەند دەمەوێ زیاتر شارەزابم, تا زیاتر بخوێنم و بخوێنمەوە، ڕازیبوونی خوا بەدەست دێنم، لە پێناو خودا دەمەوێ کام ڕێگەیە سەختە پێیدا برۆم، بەڵام نیگەرانی دایکم، نیگەرانی خودایە.»

ڕوانین و دیدی ئەیووب بۆخۆی بوو، وردبونەوەو بەدوا کەوتنی زانیاری لای ئەو، پێیوابوو تەنها لە کتێبە دینیەکاندایە، مرۆڤەکان دیدو ڕوانینی جیاوازیان هەیە، لە دیدی منەوە، کە جێ پێت بەهێزبوو، دەتوانی کتێبەکانی نامۆ بە بیرو باوەڕیشت بخوێنیەوە، تا بەهێزتربێ. ئەو درزو کەلەبەرانە ڕوونتر دەرک پێدەکەی، لە زانیارییەکان دەوڵەمەندتر دەبی، ئەو پێشتر هەموو جۆرە کتێبێکی دەخوێندەوە، کتێبەکان، دەتوانن مرۆڤەکان بگۆڕن، ئەو دەیگوت: «خاوەن زانستێکی قوول

نەبی هەموو کتێبێک کارت تێدەکا، کاتێ کتێب بە دیدێکی فەلسەفی و ئەقڵیەتێکی باڵا نووسرابێ، کە چەکی ئایدیای تۆ بە هێزتر نەبێ دەتشێلێ ناچاری تەسلیمبوون دەبی. چی کتێب بێتەلام دەیخوێنمەوە، ئەو کتێبانەی دەنووسرێن، گەڕانە بەدوای خودا، نەزەرو بیرو باوەڕی هەر نووسەرێک بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکانە، واتا یەقین و دڵنیابوون تەنها خوێندنەوە دەتداتێ. کتێبێک پەرجوو یا نهێنیەکت بۆ هەڵدێنێ، هەست دەکەی خودا لەپشت ئەو پەیام و نووسین و دەرخستنی گومانەکانە، دۆزینەوەی خودا، لە کرۆک و دێڕ و پەرجووی وشەکاندایە، مرۆڤ بێ بوونی خودایەک، ناتوانێ ڕێگە ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە، خودا ئەو قەناعەتەیە دەربازت دەکا لە دڕدۆنگی و نا ئارامی، کتێب درووست پێت دەڵێ: «مرڤ دەبێ وابەستەبێ، بەو ڕستە و ماناو پەروەردەیەی دەیخوێنێتەوە، کاری ئەو ماناو وێنانە، بۆ گۆڕین و ڕاستە ڕێکردنی خواستەکانی مرۆڤە بۆ ژیانێکی باشتر.»

زۆر جار هۆگربوونم بۆ تێگەیشتنەکانی ئەیوب زیاتر دەبوو، تایبەتمەندی و هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی ئاسایی نەبوو، لەبەرخۆیەوە قسەی دەکردوو دەبزڕکا، هەر جارێک دەچووە ناو یادگای خوداوە، یەک پارچە دەبوو بە درویشێکی ڕاستەقینەی خودا. ئێوارە دوای نوێژی شێوان، ئەو لەگەڵ دوو غەریبە لە مزگەوت گەڕایەوە، سەرەڕای دەستکورتی و نەبوونی، بەڵام دایکم بەڕوویەکی خۆش و حورمەتێکی زۆرەوە، پێشوازیلێکردن، بە خولقێکی گەنمیەوە هێندە گوتی:

«یاخوا بەخێر بێن، سەر هەرتک چاوی دەمن، خێر و بەرەکەتتان هێنا، ماڵێک میوان ڕوو تێنەکا خوا بەرەکەتیشی ناوێتێ.»

قسەکانی دایکم لە هەر کوێیەک بن دەیانناسمەوە. پێ و قەدەم و خێربێ، وەک ماڵی حۆتان وایە، جیاوازیتان نییە لەگەڵ ئەولادەکانم. گفت و لفتی شەکربوو، برادەرەکانی ئەیووب دەستیان لەسەر سینگیان بوو، لەگەڵ هەر قسەیەکی دایکم، سەریان دادەنەواند. فارس بوون کوردییان نە دەزانی. ئەیووب لە ئەنجامی خوێندنەوەی باش فارسی فێر ببوو، قسەکانی دایکمی بۆ دەکردن بە فارسی. ئەیووب ڕووی لە ئێمە کردوو گوتی: «ئەو دوو برادەرە، لەودیو ڕاهاتوون، ناونیشانی منیان وەرگرتووە، لە نوێژ تەواو ببووم، لە دەرەوەی مزگەوت ناوی منیان هێنابوو، بانگیانکردم، ئەوانەی دەرەوەی مزگەوت، لێیان حاڵی نەدەبوون، چووم بە پیریانەوە، خۆمان بە یەکتری ناساند، ئەو خەڵکەی دەرەوەم تێگەیاند، ئەوانە میوانی منن.»

لە ڕێگەی دۆستێکمەوە هاتبوون، ناوی دۆستەکەی منیان هێنا، خۆشحاڵ بووم، ئەیووب سپاسی دایکمی کردوو دەستێکی برایانەی لە پشتمداو تێگەیشتم دڵخۆشە بە پێشوازی ئێمە.

بەهۆی خوێندن و خوێندنوەی کتێبە دینیەکان بە زمانی فارسی، ئەو بەرەی خۆی لە ئاوی دەر هێنابوو. جار جار گوێی لە گۆرانی فارسی دەگرت، جارێک پێمکوت: «بەشێک لە ئیسلامییە توندڕەوەکان دەڵێن گۆرانی و مۆسیقا حەرامە، بۆ خووت دەدەیتە مۆسیقا و گۆرانی؟»

خۆی شلوێ نەکرد چاوەکانی لە سەریەک دانان و نەرم سەری بڵیند کردوو گوتی: «بۆ دەبێ ئاسوودە بوونی ڕۆح بە مۆسیقا حەرامبێ؟! نا هەرگیز، هەر بابەتێک جوانی تێدابێ و چێژ بە ڕۆح ببەخشێ بە مەرجێ زیادەڕۆیی تێدا نەکرێ لای من حەرام نییە، کاتێ گوێ لە مۆسیقا دەگرم باڵ دەگرم و دەچم بۆ لای دروستکراوەکانی ئیلاهی سەرسام دەبم، وەک نوێژی ئەوین دەڕوانمە مۆسیقا، ئەوینم بۆ پاکی و میهرەبانی خودا، لە ڕیتم و نۆتەکانی مۆسیقادا دۆزیەوەتەوە، لە فڕین و نیشتنەوەی پەپوولەدا گوێی مۆسیقیم بە جۆش دێ، لە دەنگی تاڤگەکان و نەسیمی بەیانیاندا، گۆرانی و مۆسیقا دەڕژێ.»

عاشقبوونی ئەیووب بە خودا، کەشێکی جوانی ئەدەبی خوڵقاندبوو، ئیرەییم پێوە دەبرد، لە بینینی ئێمە دوو غەوارەکە دڵخۆشبوون، زۆریش لەبەر دڵان بوون. ڕیشێکی تەنک و باڵا بەرزو سپی پێست، ڕوومەتیان هەر لەسێوە لاسوورە دەچوو، دەتگوت، دەمێکە برادەری ئەیووبن، ئاکار و تایبەتمەندییان لەیەک دەچوو. دڵم لێیان خاوێنبوو، ئاخر زەمەنەکە زۆر خراپبوو، دەبوو باوەڕ بە هەموو کەس نەکەی، ئیتلاعاتی ئێرانی دەچوووە ناو ژیانی هەموو کەس، بۆی هەبوو خەڵکی لەوشێوەیە بنێرێتە ناو خێزانەکان، بۆ وەرگرتنی زانیاری و درووستکردنی مۆرەی خۆی.

ئێران سنوورەکانی کردبونەوە، دڵنیابوو لە سەرکەوتنەکانی لەوە نەدەترسا، ئێمە وەک باشوورییەکان هیچ کاریگەرییەکمان هەبێ، دەیزانی دوای وەدەرنانی ڕژێمی بەعس، کورد ئەو کاریگەرییەی نییە، بۆیە بێمنەت بوو.

ئەو دوو ئێرانیە ناوبانگی ئەیووبیان بیستبوو، نەزەرو دەستنووسەکانی ئەیووبیان بۆ باسکرابوو، گفتوگۆیان دەکرد، ئەوان لە یەکتری دەگەیشتن، منیش کەم کەم شتێک حاڵی دەبووم، بەهۆی ئەوەی جارجار ئەدەبیاتی کۆمۆنیستەکانی ئێرانم دەخوێندەوە. بەڵام دایکم وەک گوێزانی بۆ بژمێرن تەقەی سەری دەهات. ئەیووب خۆشەویستی دەورو بەری بوو، هەندیک توندڕەو ئەویان دەدزا، پێیانوابوو تێکچووە. ئەیووب دەیگوت: «کاتێک پێغەمبەر قسەی بۆ خەڵککردووە، بەردیان تیگرتووە تف بارانیانکردووە سەری موبارەکیان شکاندووە، بەڵام بەردەوام بووە، بە ڕۆحێکی جوان و خۆشحاڵییەوە پەیامی خۆی گەیاندووە.»

پێموابوو لە ڕووی بیرووباوەڕەوە ئەیووب و ئەو دوو ئێرانیە لێک دوورن، وەختێ گوێم گرت لە نەزەرو بۆچوونەکانیان کۆکبوون. ئەیوب مەیلی شیعەگەری تێدابوو، وابەستەبوو بە ئایدیاو بۆچوونەکانی ئیمامی عەلی، خۆشم وتەو پەیڕەوانی ئیمامی عەلیم خۆشدەویست، هاوڕێکمان هەبوو، پێیوابوو ئیمامی عەلی چەپێکی موسڵمانە. یەکێک لەوتەکانی ئیمامی عەلی دەڵێ: (گەر هەژاری مرۆڤ بایە دەمکوشت!) ئەیووب کەیفی بە ئێمە دەهات، ڕقی لە توندڕەوی دەبۆوە، هەندێک هێزی ئیسلامی هەبوون ئەو کەیفی پێنەدەهاتن، ئەوانیش ئەویان دەبوغزاند. ڕەوتی ئیسلامی بەهیزبوو لەناوچەکە، ململانێی توند هەبوو لەناو گرووپە ئیسلامییەکان، چەپ و کۆمۆنیستەکان بەربڵاوبوون، دەرەقەتی ئەو پەرگیری و دەستەڵاتی ئیسلامی سیاسی نەدەهاتن. بە هۆکاری ئەوەی

کۆمەڵگە لەبارتر و گونجاوترە بۆ گەشەکردنی بیری ئیسلامی، بەڵام سەرەڕای پەرش و بڵاوی چەپەکان، نەخش و کاریگەرییەکانیان ببوو بە هۆی نیگەرانی ئیسلامییەکان. کۆمۆنیستەکان لە هەڕەشەو تیرۆری نەیارەکانیان بە دوور نەبوون, لە لایەن ناسیۆنالیستەکانیشەوە هەڕەشەیان لە سەربوو، تیرۆرکردن و ڕاونانی چەپەکان، یەکێک بوو لە نیەت و خواستی ناسیۆنالیزم و ئیسلامییەکان، چەند کادیری بەرجەستە لە ناوچە جیاجیاکان تیرۆرکران و دۆسیەکەشیان بەلاڕێدا بردرا. بۆرژواکان و ناسیۆنالیستەکان و ئیسلامیەکان بەڕووکەش ناکۆکبوون، بەڵام لەبەرامبەر ترس و تۆقاندن و تیرۆری ئازادیخوازو چەپەکاندا کۆک بوون.

ئەو کێشمەکێشمە لە ماڵی ئێمەدا بوونی نەبوو، ئێمە ڕیسکی ئەو هێڵە خراپەمان، لە زەین و تێگەیشتنەکانی خۆمان دەرکردبوو، لە بەشێکی چالاکی و دانیشتنەکانی ئەیووبدا بەشدار دەبووم، زۆر جار پرسیارم بۆ درووست دەبوو، ئەو بابەتانەی باسدەکران، هەمەجۆر بوون، بە گوێرەی حاڵیبوونی خۆم، دەمڕوانییە بابەتەکان. هیچ کات نیگەرانیان لێ بەدی نەدەکرا، خۆمان ئەو کەشەمان درووستکردبوو، ئاگامان لە کارو کردەوەکانی یەکدیبوو، ئەوکاتەی ئەیووب دەدواو باسی لە جوانییەکانی خودا دەکرد، هەموو گیانم دەبوو بەگوێ، چێژم لە زانیارییەکانی وەردەگرت. کاتێک تەواو دەبوو لە قسەکانی چی سەرنجی هەمبوو لە لاپەڕەیەکم دەنووسی، ئەیووب حەزی لەو ئێشەم بوو، نەرم ڕوانین و پرسەکانی دەگەیاندن، لە گەرمەی باڵابوونی ئیسلامی سیاسی، باوەڕم بە

چەپ و ئازادیخوازی تۆکمەتر دەبوو. هەمیشە کارم بۆ ئەوە دەکرد، هزرین و وابەستەبوونم بە فەلسەفەی مارکسیزم تۆکمەتر بکەم، جمووجۆڵی ئیسلامییەکان، مەترسی و دڵەڕاوکێی دروستکردبوو، لە چێشتەنگاوێکی پایزیدا، چەند چەکدارێکی ئیسلامی ڕیشن و مەترسیدار، بە بازار وەربوون، هەڵیان کوتایە سەردووکانێکی مەشرووب فرۆش، پیاوێکی کوردی ئێزیدی لەسەربوو، چی شووشەی ناو دووکانەکەبوو شکا، دەنگی تەقەو سەدای ئازاری کرێکارەکە و شکان و، وێرانبوونی شووشەکان، جەنگی مەغلوبەی دروستکردبوو، شەقام لە گریانی شووشەو ڕژانی ئەو هەموو ڕۆحەدا، باهۆزی گریانەکانی دەچوو بۆ کەشکەلانی فەلەک، خەیاڵ و مەستبوونی هەتاوی چێشتەنگاو، لە ژێر چەکمە ڕەقەکانی ئەو وەحشی گەریەدا ئەنجن ئەنجن کرا، مرۆڤێکی ئێزیدی، لە ژێر ڕەحمەتی نێزەو شەقی چەند ڕیشنێکی چڵکن دەیناڵاند، لەو نێوەدا دەستێک نەبوو، نووکی نێزەکان و ڕووی تفەنگی چەکبەدەستەکانی بەربەریەت دوور بخاتەوە. ئەو ڕۆژە شەقامەکان، دیوارەگڵینەکان، جۆگەکان، بۆ ڕژان و شکانی شووشەکان بۆ مەستییەک دەگریان، بۆنی شەڕاب بەسەر ڕۆحی هەمواندا دەیچریکاند، تەمێکی ڕەش ئەو ناوەی لەترس هەڵکێشابوو. خەڵک زارەترەک ببوون، ئەو ڕووداوە بۆ ئەیووب بوو بە پرسیار. دەیگوت: «ئەوانە بۆچی بەناو خوداو دێنەوە ئەو کارە دەکەن؟ چەند کارێکی شەیتانانەو دوورە لە پەیامی خودا، کوشتن و تۆقاندن و کاری واقێزەون و نەشیاو، جگە لە دووژمنانی خودا، جگە لەوانەی تووشی نەخۆشی دەروونی بوون لە کەسی ژیرو لە خوا ترس ناوەشێتەوە.»

سێبەری ترس و تۆقاندن، بەهێزبوونی ئیسلامی سیاسی، ژیانی تەنگ و نا ڕەحەت کردبوو، کچان و ژنان، لەلایەن توندڕەوە کانەوە، تێزاب بە لاق و لەتەریاندا دەکرا، لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکان، دەکەوتنە ژێر توانج و هۆیها کێشان، سەرکێشی و مل نەدانی ئیسلامیەکان، نەهاتنەوەیان لەگەڵ نەزمی نوێی جیهان، خۆ نەگونجاندنیان بوو بە هۆی دروستبوونی شەڕێکی نابەرابەر. شەڕێکی درێژخایەنی لێکەوتەوە، خەڵکێکی زۆر بوو بە قوربانی، شاعر، مەلا، جوتیار، ژن و منداڵ، ماڵ نەبوو ئازار و ناڕەحەتی نەچێشتبێ بە دەست ئەو شەڕەوە، شەڕێکبوو سەگ ماخۆی خۆی نەدەناسیەوە، تیلە شاخ نەبوو شەڕی نەچووبێتێ، کەوتنی تەرم و سووکایەتی کردن بەتەرم، خۆفو ترسێکی گەورەی درووستکردبوو، قێزت لە بوونی مرۆڤ دەکردەوە، ناخۆشیەکان و بێ ئومێدی وەڵاتی خستە ڕۆخی وێرانبوون. مردن و زامداربوونی هەستی خەڵک، ژیان و گوزەرانی نابووت کردبوو. ئەو سەرکردە پیرەی ڕۆژنێک لە مینبەری مزگەوت، دژی بەعس و زوولم و زۆریەکانی دەنگی دلێربوو، ئەمڕۆ بەهۆی شلبوونی هەنگاوەکانی و شکستی هێزەکەی، کەوتۆتە دەستی چەند کورە گەرمیانییەک و شان و شەپیلکی داچۆڕاون و بە نا ئومێدیەکی زۆرەوە ناچارە ئەو زەمەنی بێدەستەڵاتییەی قەبووڵ بێ! بە ڕاگەیاندکارەکانی ڕا گەیاند: ئێمە شکستمانخوارد، لە دەنگی ترپە ماندووەکانی دڵم بێزارم، سەرو پرچی سپی و ڕیشم، هەزاران تووکم لێدەکەن و هەموو دەستنوێژەکانم فڕێدانە ناو تیکە شاخەکان و تەیرێکی پەڕاگاندەش ناچێتەوە سەریان. شەڕیکی قێزەون و نەفرەت

لێکراوبوو، تەرمەکان چوار دەستەکی فڕێدەدران، گوێم لە شکانی شەوێلاکی تەرمەکانبوو، کاتێک سەریان بەر شۆستەکان دەکەوت، دەستی دایکیانم دەبینی دەیان جار ئەو سەرو پرچەیان شانەکردووە، ڕوومەتیان لەسەرسینەی دڵخوازەکانیان داناوەو چاوەکانیان لە نیگای یاردا، گۆرانیان گوتووە

# بەشی هەژدە

یاقووب خەریکی خۆ کۆکردنەوە بوو, ئەو چەند ڕۆژە گەلێک پڕ کار بوو، سەرقاڵبوونی بەڕێکخستنی کتێبخانە، گەڕانەوەی بۆ ڕۆژانی نەخۆشخانە، یاداشتەکانی، نەخۆشخانە، لەگەڵ نەخۆشەکان دەردەدڵی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیگوت: زۆر جار دەمویست پێبکەنن، لەبەر خۆمەوە بە نەرمی گۆرانیم بۆ دەگوتن، شیعرم بۆ دەخوێندنەوە، ژنێکی بە تەمەن نەشتەرگەری بۆ کرابوو، دەچووم دەمێکی چاک لای دادەنیشتم و وەک کەسێکی نزیکی خۆم، دەتگوت دەمێکە دەیناسم، بانگی دەکردم، بۆ هەر کارێک پێویستی هەبا. کچێکی خۆی لەگەڵ خەوتوو بوو، دەیگوت: «تەنها ئەو تاقە کچەم ماوە، کوڕێکم لە شەڕی پشت ئاشان تێداچوو، کوڕێکیدیم بە نەخۆشیە پیسەکە (شێرپەنجە) خوا بردیەوە، بابی منداڵەکان خەریکی خەم و ئازاری خۆیەتی، خزم و کەس و کارم زۆرە بەڵام ئەوان لەبەر ژیان و دەردە سەری خۆیان، بە خەمی ئێمە ڕا ناگەن. کیژەکەی من بە منداڵی لە گەورەبچووکەی پێکراوە، هەر لێرە بڕۆینە دەرەوە کیژەکەم دەبەن و تەنیا لەگەڵ پیرە مێردەکەم دەمێنینەوە.....»

گوێم لە وشەی شەڕی براکان بوو، مووچوڕکی خەمباری و ئازارەکانی دارای هاوڕێم هەمووگیانی داگرتم، باوکی دارا، یەکێک بوو لەو فەرماندە ئازایەی لە بەرامبەر بەعس و

دووژمنانی گەلەکەی نموونە بوو، خاوەن کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو، دەگێڕنەوە لێی، هێزێکی گەورەی ڕژێم، بە تانک و تۆپ و پیادە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی زۆر قارەمانانە تێک دەشکێنێ، باڵانسی هێزی گۆڕی، تا ئێستاش ئەو چالایەکیە لە زەینی خەڵک و دۆست و دووژمندا بە شکۆداری ماوەتەوە. لە دەیان چالاکی و ڕووبەڕوو بوونەوەدا نەخشێکی باڵای هەبووە. شەڕی براکان چۆتە ناو مێژوو، وەک پەڵەیەکی ڕەش بە ناوچاوانی دیل کوژەکانەوەیە، شەڕی براکان وەک مۆتەکە یەخەی خەڵکی کوردستانی بەر نەداوە، سەدەیەک خوێن لە لە نیشتیمانی براکان دەچۆڕێ، سەدەیەک پاوانخوازی و خۆسەپاندنی هێزی باڵا دەست، وەک جەللاد کەوتۆتە کوشت و بڕی نەیارەکانی، سەرانی پێکهاتە سیاسییەکانی گەلی کورد، ئەوەندەی خەریکی زامدارکردن و ڕشتنی خوێنی یەکتربوون، ئەوەندە بە پەرۆشی سەربەخۆیی و سەقامگیری ئاشتی و تەبایی نەبوون. باوکی دارا، لەگەڵ هاوڕێیەکی عەرەب، دەکەوێتە ناو بۆسەی نەیارەکانی، بەدیل دەگیرێن و چەک دەکرێن، دوای شکاندنی شکۆ سوکایەتی پێکردنیان، دەدرێنە بەر ڕێژنەی گوللە.

دەگێڕنەوە دوای بەدیلکوشتنی بابی دارا، پرسیار لە هاوڕێکەی دەکەن، ناوی خۆیی و خەڵکی چ شارێکی کوردستانە، لە وەڵامی قسەکانیدا دەزانن کە عەرەبە و خەڵکی یەکێک لەشارەکانی خوارووی عێراقە، پێیدەڵێن: تۆ دوو جار تاوانباری، یەکەمیانی عەرەبی و دووەمیان شیوعی، دەبێ دووجار سزابدرێی.

فەرماندەی هێزە سەرکەوتووەکە، ڕوو لە چەکدارەکانی دەکا، دڵێ چۆن بە ئازارە سەرف و سوونیان کەن. کەرەستەکانی وەک چەک و مەخزەن و تاقمی مەخزن و ڕادیۆو لایت و باقی شتەکانی ناو گیرفانیان دابەشی بکەن بەسەر خۆتاندا.

چیرۆکی ژنە پێشمەرگە کەش لە ناو خەڵک و هێزی پێشمەرگەی هەموو لایەنەکانیشدا دەنگی دایەوە، دوای شەڕێکی گران و دەستەو یەخە، دوای پێ برانی فیشەک، خۆی لە شاخەکە هەڵدە دێرێ و نایەوێ خۆی تەسلیمی هێزی سەرکەوتوو بکا، شەڕی براکان دوای ڕاپەڕینیش، بەهۆی مل نەدان و نەگەڕانەوە بۆ مافە نەتەوەیی و سەروەری نیشتیمان، برینەکانی قووڵترکردەوە، ئازار و زامەکانی گەل تا هەتایە سارێژ نابن، هەموو قەیرانەکان و بێ ئومێد و بێ ئینتیمای خەڵک، هۆکاری سەرەکی شەڕی براکانە.

لە نەخۆشخانە زەنگی هەموو چیرۆکەکان لە زەینمدا دەزرینگانەوە، دەمگوت: «خۆزگە توانیبام هەموو ئەوانەی لە نەخۆشخانە بوون نەجاتم دابان، دەبێ هێندەی چێژ لەو هاوکاریداهەیە, هیچ شتێکیدی هێندە چێژ بەخش بێ؟»

بۆ حسابی کتێبخانەو کڕین و فرۆشتنی کتێب، گرفتێکم نەبوو، بەڵام دارای هاوڕێم، هەروای پێ باش بوو، بەوردی چاو لە لیستی فرۆشتن و کڕین بکەم، خەریکبوو نیگەران بم، دارا دەستی گرتم, لێیتێگەیشتم مەبەستی گومان خەراپ ڕوانینی من نییە، دەیزانی من کێشەم حیساب و کیتاب نییە، گوتی:

«خوێندنەوەی تۆ بۆمن، لەخۆت باشتر دەزانم، بەڵام دەبێ حیساب بکەین.»

ئەو دۆستانەی دەهاتن بۆ کتێبخانە دڵخۆش بوون بەهاتنەوەم، دەیانگوت: (بیرمان کردبووی، هیوادارم خاڵت باش بێ، دەستخۆش کە ئەو چەند ڕۆژە لای خاڵت بووی دەزانین دڵی زۆر بە تۆ دەکرێتەوە.)

دەمێکبوو نەمدیبوون زۆر قسەوباسمانکرد، سەبارەت بەزۆرشت، ڕەخنەو گلەییمان زۆر بوو، ڕووم لە هاوڕێکانم کرد گوتم: «ئەو حاڵە بەقسە چاک نابێ، ئەوەی ئێمە دەیکەین ئاسنی سارد کوتانە، هەڕاڕبوونی ئەوانە لەوە دەرچووە بە قسەی ناو کتێب و ڕەخنەگرتن بێنەوە سەرخۆ.»

ئەوەندی هەستم لای ڕیحان بوو، هێندە نەمدەویست سەری خۆم بەکارێک ئەستوور بکەم نەتیجەیەکی دیاری نەبێ، دڵم دەیگوت: «تۆ چەند ڕۆژە سەرت بە ماڵی خاڵت دانەکردووە، خێرە ریحانت لە بیر کردووە؟» شەوێکیان ریحان هاتە خەونم و دەسماڵێکی ئاوریشمی لەسەر بوو دەتگوت پەری ئاسمانە، هێندە بۆنی خۆشبوو، بۆنی مێخەک هەناسەی ژوورەکەمی پڕکردبوو ئەو شەوە هەستم دەکرد لە بەهەشتم، شەوێکی پڕ ماچ و ڕامووسین بوو، کە بیر لەو شەوە دەکەمەوە خەریکە باڵ بگرم، ریحان دەیگوت: «ئەو ڕۆژانەی بێ تۆ بووم لەگەڵ ئاسمان قسەم دەکرد، بە نیگایەکت دەچوومە ناو ڕەنگەکان، دەمەوێ ئاوازێک بڕێژم، چی وشە هەیە لە سینگی ماچێکی شیرینی بدەم و نیگەرانیم بڕەوێنمەوە، ماڵێکم دەوێ لە خۆت، لە دەنگت، لە باوەشێکی پڕ لە میهر، لە ئێوارەیەکی زیویندا،

ببین بەو چیرۆکەی چێژی خوێندنەوەی بڕژێتە ماڵی هەموو ئەویندارانەوە.»

خەیاڵ و زەینی ماندووی خۆی خستە سەر تاقەکەی کتێبەکان بە نیگایەکی پڕ عیشقەوە یاقووب ڕووی لە کتێبەکان کردو گوتی: «ناهێڵم ئومێدەکانم بکەون و ڕەگی ئەو خەونە ئاوێتەی دڵی ریحانی دەکەم....»

کات دە ی سەر لە بەیانی بوو، خەیاڵم پەرت ببوو، ریحان و دایکی تیژ بەبەر دووکانەکەی مندا ڕەتبوون، ریحان سلاوی نەکرد، هیچ ئاوڕیشی نەدایەوە، لایخۆم بە هەزار شێوەم خوێندەوە. خەیاڵم بۆ زۆر شت دەچوو گوتم: «هەر دەڵێی ناشم ناسیێ، ئەی ئەوە نازانێ کەسێک هەیە لەو دووکانە ڕەنگە بێ ئەو نەتوانێ هەناسە بدا، نیگاکانی هەراسانی کردم، ویستم بڕۆم دەرگای جامخانەکە دابخەم و دوایان بکەوم، ڕێک ئەوساتە دوو دۆستی ئازیز سلاویان کردوو بە ژوور کەوتن. یەکترمان لە ئامێزگرت و دەمێکی چاک ئاوێزانی یەکتری بووین، ئەوان هەر خەریکی قسەکردن بوون و منیش ئاگام لە هیچ نەبوو، تەنها بیرم هەر لای ریحان و دایکی بوو. ئەوان بەدەم قسەکردنەوە چاویان بە کتێبەکاندا دەخشاند و منیش لەو شوێنە نەبووم کە ئەوان لێیبوون، دڵی من لە جەنگێکی بێ سەرکەوتندابوو....... خەمی ئەوەم بوو، وابزانێ لەبیرم کردووە، دەچوومەوە سەر بەڵێنەکانی بە نیگەرانییەوە، خۆم دەدواند، ئەو لەخوای دەویست لە درزێکەوە من ببینێ، دەیان جار دەیگوت: هەمیشە چاوم لە ڕێگەیە, دەرکەوتنت چی مەراق هەیە لەبیرم دەباتەوە، تینم بۆدێ کە کارەساتێک دێتە

پێش و دڵم هەر لای تۆیە، گەر تۆ لە کۆبوونەوەکان نیت نیگەران و بێ تاقەت دەبم، هەموان هەستم پێ دەکەن، زۆر جار توانجیشم لێدەدەن و بەسەر خۆمی ناهێنم، ئەو ڕۆژەی لەگەڵ هاوڕێیان ڕۆیشتی، نەمدەزانی پەنا بۆ کێ ببەم، تەنها دایکتم بەدەستەوە مابوو، چووم کەمێک خۆم ئاسوودە کرد و چی لە دڵمدابوو هەڵمڕشت. ئاخر خۆ سووتان هەر ئەوە نییە گڕبگری و دواجار بتکوژێ و کۆتایت پێبهێنێ، سووتانی من بۆ تۆ ئەو دۆزەخەیە لە زۆربەی کتێبە دینیەکان باسکراوە، واز لە باوەڕەکەم دەهێنم بەڵام ناتوانم واز لەتۆ بهێنم، شەوانە بە گۆرانییەکانی خالەقی و یەدوڵلای موحەمەدی دەخەوم، بۆچی ناوی ئەو دوو هونەرمەندە دێنم؟ ها دەتگوت: ئەوانە لەگەڵ ڕوح قسە دەکەن، ناخی تۆ دەبینن، هەستەکانت دەگوازنەوە، کێ هەیە مەست نەبێ بە گۆرانییەکانیان؟ هەموو جارێ دایکم دەڵێ تۆزێک دەنگی گۆرانیەکە کەم بکە، هەر ئەوەندەیە شەڕ بە دایکم نافرۆشم، ئاخر دڵی من وا خەرێکە لە سێنەم دەردەچێ و بێ پەنا نازانێ بۆ چ هێلانەیەک ئۆغربکا، بە دایکم دەگوت: (بە سەرچاو خانم) دەیزانی نیگەرانم، دەیزانی دڵم دەکوڵێ، دەهات بۆلام (لەبەر خۆت وادەڵێم، هێندە خۆت بێ تاقەت مەکە). دەیویست فەرامۆشیم بۆ بێنێ، زۆرجار لەگەڵ گۆرانیەکە دەیگوتەوە بۆ ئەوەی من واهەست بکەم .دایکیشم وا هاوبەشیم دەکا. یاقوب هاتەوەبیری ئەوڕۆژەی گوتی: «تۆ تەنها هی دایکت نی تکایە ئاگات لە خۆت بێ، بەشی ئێمەشت پێوەیە.»

هەر دەمگوت و دەمگوتەوە، بۆچی ڕووی لە دووکانەکەم نەکرد؟ خۆ گەر بەڵێنی بە کەسێکیدیکە دابێ، لە خۆم نابوورم، دەبێ باجی ئەو کەمتەرخەمییەی خۆم بدەم، ڕاست دەکا، ئەوەتا خۆشەویستی کەی وایە؟ چەند ڕۆژە هەر سەرم لێ وەسوێ نەناون، نەچووم لە دایکیشم نەپرسیوە، خۆ دایکی منی لەگەڵ کوڕەکەی خۆی جیاناکاتەوە. دەیان جار خۆی بەقوربان کردووم و دەیگوت: «کە ڕۆژێک نات بینم تووشی خەمۆکی دەبم، پێمخۆشە تا چووی بۆ دووکان بەلای دایکی خۆت دابێی.»

ریحان نا حەقی ناگرم، دەزانم وا بیر دەکاتەوە دەڵێ، تەنها بۆ دەست گەرمکردنەوەیەتی، دەنا چییە خۆ دایکم و کاکیشم لارییان نییە لە خۆشەویستیمان، دەی بۆچی خۆی دوور دەگرێ؟ دڵی من قەت ناڵێ ریحان دۆستێکی دیکەی گرتووە، قەت گومانی خراپ ناکەم، ئاخر لە دڵی خۆمەوە دەڕوانم، جونکە ناتوانم جگە لە ریحان کەسیدیکە بێتە ناو ژیانی من، بۆیە ریحانیش هەمان تێگەیشتنی هەیە، جاڕس بووم هێندەی خۆم بێنم و ببەم، سەرم ئەستوور ببوو، وەختەکە درەنگ بوو، دووکانم داخست و هێندە سەرم لێتێکچوو بوو کلیلەکانم لە بیر کرد، کلیلێکیش بەدارا بوو، ئەویش لە ماڵ نەبوو گەر نیوەڕۆ نەهاتبایەوە دەبوو قفڵی دووکانەکەم شکاندبا، بەهەر حاڵ ڕێگەی ماڵم گرتە بەر، بەبەر دەرگەی ماڵی ریحاندا ڕۆیشتم، لەچاوی چۆلەکانیش دیار بوو هیچ شتێک وەک خۆی نەماوە، ئاراستەی فڕینیان و جریوەکانیان بۆمن جێگەی سەرنج بوون، دار تووەکەی بەر ماڵیان لە جووڵە کەوتبوو،

کزە بایەکیشی نە دەهات، ڕۆژانی زوو سەمای درەختەکانی ئەو ناوە، غەرقی نەغمە و شایی بوون، ئەمرۆ نە من گۆرانیم پێماوە نە سرووشت، نەمن دەتوانم بخوێنم نە باڵندە.

ویستم لە دەرگەی ماڵی ریحان بدەم و بڵێم بۆ نانی نیوەڕۆ لێرە دەبم، بەڵام ئەختو چارم کرد دڕدۆنگی و شڵەژانم نەیهێشت وابکەم، کەس بەدەرەوە نەبوو جگە لە خۆم و چۆلەکەکان، ڕۆیشتم تا ماڵی خۆمان گیر نەبووم.
کەوتمە بەر تێڕوانینی دایکم، ئەو بە ڕەنگ پەڕیوی و بێ حەواسی من، زانی دڵم شتێکی دی دەڵێ، هیچی نەگوت تەنا ئاهێکی هەڵکێشاو دەستی بۆ لچکی سەر سەری بردوو گوتی: «ئەو خواردنانەم لە بەر ئێوە لێناوە، نەڵێن برسیمان نییە، هەموو ئەوشتانە دێنەڕێ، تێدەپەڕن و ئەسەریان نامێنێ، وەرن نانەکەتان بخۆن........»

هیچ ئیشتیای نان خواردنم نەبوو، دەتگوت گاز لە گۆشتی خۆم دەگرم، بەڵام نەمویست زەوقی ماڵەوە تێکبدەم، هێواش هێواش دەستم پێکردوو لەگەڵ دایکم و ئەیووب لە نان خواردن بوومەوە، یارمەتیم لێ خواستن و گوتم: «دەچم لە ژوورەکەی ئەودیو پشوویەک دەدەم.»

پاڵکەوتم ویستم بە پاڵکەوتنەوە ڕۆژنامە بخوێنمەوە، چاوم بە بابەتەکانیدا گێڕا، چوومە سەر لاپەڕەی شیعر، چەند شیعرێکی ناسکی تێدابوو، لەگەڵ شرۆڤەیەک لەسەر شیعری دوای ڕاپەڕین، کرۆکی بابەتەکەم هەڵێنجا، شێعر دوای ئازادی، ئەرک و ماف و گرینگییەکانی بۆ بەرەو پێشچوونی زمان و پاراستنی فەرهەنگی ڕەسەنایەتی نەتەوە. خۆم هێندە نەزەر

تەنگ و ناسیۆنالیست و توووند نەبووم، بەڵام تێگەیشتنم بۆ زمان و کولتووری نەتەوەکەم، پاراستنی و بەرەو پێشبردنی وەک ئەرکێکی مرۆیی و گشتگیریم سەیر دەکرد. ڕۆژنامەکەم خستە سەر تاقەی ژوورەکەو ویستم بخەوم، چەندی کردم نەمتوانی، خۆنیشاندانی ریحان وەک بەرەنگاریەکی کۆمەڵایەتی و فڕێدانی پەیامێکی ئاگرین بوو بۆ حاڵی کردنم، دەمگوت: «دەی بۆ لە بیر خۆتی دەبەیتەوە، ئەی نەمگوت، دەچم تاڤگەیەکت بۆ دروست دەکەم لە سپێدەکانی پایز و لە دوا پەیڤی ئێواران و لە ڕوناهی دڵی دایکت و لە ئارامگرتنی کانی.»

هەر بۆ وشەیەک دەگەڕام دڵنەوای خۆم و ڕەوینەوەی ئەو ڕووداوەی پێ هێور بکەمەوە، پەیامی ریحان ڕێڕەوی هەموو کارەکانی پێگۆڕیم. بەبەرچاومدا ڕووداوەکان ڕیتمی خۆیان تێکدابوو، ڕەوشی کارکردنم بۆ ئایدیۆلۆژیا بێ ڕووناکی بوو، بۆ ژیان برەو پێدان بە کارەکەم لە شکان و کەوتندابوو، دەمەویست کەس نەبینم و ڕووم لە هەموو کەس وەردەگێڕا، زۆر قسەی توووندم لەگەڵ ئەیووب دەکرد و بەسەریدا دەمشیراند، دڵەڕاوکێ و نیگەرانیم خەریکە وێرانم بکا، دەمبینی کتێبەکانم فەرامۆش کردبوون و خوێندنەوەم تووڕ هەڵدابوو.

دەمبینی دایکم بە ترسەوە دەیدواندم نەیدەوێرا گلەییم لێبکا، بە حەزەرەوە بانگی دەکردم نان بخۆم، دەمبینی خەڵک بە جۆرێک باسم دەکەن وەک دێوەزمەیەک و مرۆیەکی بەزیو وەک شەیتانێک دوور لە بەها جوانەکان، دوور لە نەریتی خێزان و دەمبینی دەست بۆ هەر شتێک دەبەم لێم ڕادەکا،

بێزار دەبووم ڕامدەکردە سەر گۆڕەستان و هانام دەبردە بەر گۆڕەکەی دکتور رەسووڵ، بە دوای گۆڕی باوکمدا دەگەڕام، بێ خەبەر لەوەی باوکم بێ گۆڕە هاوارم دەکرد، ئەوانەی لەسەر گۆڕەستان بۆ سەردانی گۆڕی ئازیزانیان هاتبوون بە چاوی ڕق و بێ بەزەییانە دەیانڕوانی. چی شووشەی شکاوی ئێوارە مەستەکانی دەرودەشت هەبوو دەچوون بە قوڕگمدا، دەمم دەخستە سەر پەرداخە شەڕابەکە وەک ئاگر ڕوحی دەسووتاندم، هاوارم دەکرد، بانگم دەدا، سەڵاوەتم لێدەدا، شەوانە لەسەر گۆڕەستان دەخەوتم، لە بەر پێی مردووەکان نوێژم دەکرد و بۆ سێبەری ریحانم دەڕوانی، بۆ هەستانەوەی دکتور دەمقیژاند، جنێوم دەدا بە چی سیستەم و فەرهەنگ هەیە، تووڕە، ناشیرین، سووک، ڕیسوا، قێزەون، دەمدی دایکم لە ژێر منارەکەی مزگەوت دەستەکانی بڵند کردوون و نزا بۆ لە ناوچوونم دەکا، دەیگوت: «دەک ڕۆڵە خوا لەکۆڵ منت بکاتەوە چەند شەرمەزارت کردووم.» ئەو حاڵەتانەم هەمووی بینی، کەوتم و ویستم هەڵبستمەوە دەنگێک گوتی: (دەبێ ڕێگە نەدەی خۆشەویستی ناشیرین بکەی.)

ئەو دەنگە، لە زۆر شوێن کۆمەکی کردووم، دەستی گرتووم بۆ بەردەوامبوونم لە عیشق، بۆ ناسینی ژیان، بۆ خۆ خەریککردنم بە دونیای تازە، نەمتوانی گوێی لێنەگرم، ئەو دەنگە شەوێکی نووتەک لەسەر یەکلایکردنەوەی ڕێگەکەم، دەستی گرتم دووری خستمەوە لە تۆفان، پێی گوتم: «ڕۆیشتنێکی بێ بەرنامە دەڕۆی، ئەو جێگەی ملی ڕێگەت بۆ گرتووە پڕە لە جەنگاوەری ڕەش، پڕە لە مردنی خۆڕایی،

لێرەوە بوەستە، با پێت بڵێم، سپیبوونی ڕیشم، ئاماژەیە بۆ خۆڵقاندنی سەکۆیەکی بەرز، بۆ دەنگ بڵندکردنی شۆڕشی برسیەکان، ناهێڵم بخەوی، دێم ڕەنگی ڕێگەکانت پێدەڵێم، ئەوشوێنانەت بۆ دەست نیشان دەکەم، کە هیچ کات بێ ئومێد نابی، ناهێڵێ کتێب و نووسین و خوێندنەوە لە بیر بکەی.»

ئەو دەنگە لەڕێگەی قوتابخانە کەوتم و پشت ملی گرتم و پێی گوتم: «بەردەوام بە لە ڕۆیشتن، لە هەر کوێیەک کەوتی و بێ ئومێد بووی، بانگم بکەو دێم.»

گوتم: «دەنگە دەنگکردن لەگەڵ ئەو دەنگە دەمباتەوە بۆ خورافیات، بۆ جەنگی ململانێی چینەکان.»

زاتم نەکرد بدوێم و دەربڕینێکی ناقۆلا دەر ببرم، ڕۆژانێک بوو، خەوم بە ڕووکاری ئەو دەنگەوە دەبینی، ئاخر نزام دەکرد ڕۆژێک ئەو دەنگە بێت و بەدەستی دایکم چایەک بخواتەوە، تەمەننای ئەوەم دەکرد، پێمبڵێ کوڕی خۆم، وەک زەنگی کلێساکان و وەک بانگی ئیمان و وەک گاتاکان و وەک ڕۆناهی مارکس، دەمەوێ قۆڵی لێهەڵماڵین، با تەخت و تاراجی برسیەتی وەپێچین. بست بەبست دێم و دەستمان بەخۆماندا بەر نادەینەوە، هەرگیز شیوەنی ژنان و قەڵغانی میهرەبانیان لە بیر ناکەین.»

پەیام و دەنگە بڵێندەکەی سەمەدی چەرموو بۆ ئەو حاڵەتەم ڕسکی گۆڕان و بینینەوەی خەونەکانم بوو.

# بەشی نۆزدە

دڕدۆنگی و بیکردنەوەی زۆر، یاقووبی تەپ و ماندووی کردبوو, تا دەهات سەری لە ژێر باری خەم ئەستوورتر دەبوو، نەدەپرژایە سەرخۆی. لە دەفتەری ڕۆژانە نووسیبووی: (ڕۆژانەش بە بەرچاومەوە حاڵەتی زۆر قێزەون و ناخۆشم دەبینی، ئەو پیاوەی ڕۆژێک هات بۆ دووکانەکەم بۆ ئەوەی گەر کارێکم پێشکبێ ئاگاداری بکەم. لە کۆڵانێک بەرچاوم کەوت، زۆر شڵەژابوو، بە پەلە سڵاوێکی کرد و تێپەڕی، بانگم کرد کاکە لەگەڵ تۆمە، ئاوڕی نەدایەوە، خەیاڵم بۆ مردنی هاوسەرەکەی چوو. بەڕاکردن بە دوای کەوتم نەیگەیشتمێ لێم بزر بوو، لەکۆڵانەکە ژنێکم بینی لێم پرسی: «زەحمەت نەبێ ئێستا پیاوێک لێرەوە ڕۆیشت نەتزانی بۆ کوێ چوو؟» گوتی: «کەسم نەبینی، گەر بە کۆڵانەکەی دیکەدا ڕۆیشتبێ.»

گوتم: «ئەو پیاوە بۆیە دوای کەوتووم، دەمەوێ بیدۆزمەوە، کارێکی زەروورم پێیە دەڵنیابە بۆ هیچ کارێکی خراپ بەدوای نەکەوتووم.» لەڕووکاری ژنەم دەخوێندەوە ڕاستیم پێ نالێ، ئاخر خۆمن، نە چەکێکم پێیە نە هێندەش بەهێزم دەرەقەتی پیاوێکی ئاوا بێم. گەر ئەو پیاوەی بەرچاو کەوتبێ گومانم نییە ئەو بیرکردنەوەی نابێ، من کەسێکی داڵە گۆشت تەنیا چەند چڵە ئێسقانێکم، هەموو جارێ گوێم لە دایکم دەبوو دەیگوت:

«خۆزگە کەمێک گۆشتت پێوە دەبوو بەخوای کەس لە تۆ جوانتر نییە.»

دەمگوت: «دایە دەڵێن ژیشک بێچووی خۆی پێ لە هەموو شتێک نەرم و نۆڵترە، هەر لە بەرچاوی تۆ وا جوانم، دەنا ئەوەتا خۆ گۆشتم بەپەراسوانەوە نییە.»

دوای نەشتەرگەری ڕیخۆڵ کوێرە، کەمێک بەژنم پڕ بوو، دەنا وەک قالۆری وابووم، زۆر جار لەگەڵ دارای هاوڕێم کە پیاسەمان دەکردو ڕەشەبایەکی بەهێزی هاتبا دەستی یەکتریمان دەگرت، تا ڕەشەبایەکە ڕای نەدابایـن، ئاخر ئەوە بووم چۆن ئەو ژنە پێیوایە من دەمەوێ کارێکی خراپ بەسەر ئەو پیاوە بهێنم بۆ نا, خۆ من ماوەیەکی زۆر خۆم وەزن نەکردووە، کێ دەڵێ کەسێکی بە هێز و بەخۆوە دیار نیم، بۆچوونێکی سەیرم هەبوو، تا ئەو ساتەی پەیوەندیشم بە هاوڕێیانەوە کردووە هەر خۆم بە منداڵ و بچووک دەزانی، شەرمم لە کەسانی لە خۆم گەورەتر دەکرد.

لە کۆبوونەوەکان شتەکانم زۆر ورد و باش دەنووسی، بەڵام دەربڕینم باش نەبوو، نەمدەتوانی لە سەر کاغەز نەبێ قسە بکەم، خۆم دەخستە ژێر ڕەخنە، ئازاری خۆم دەدا. ئاخر خۆ لەوە گەورەتر نابی، شەرم لە چی دەکەی، ئەو خەڵکە هیچی لە تۆ زیاتر نییە دەڵێی ئاوقاتە، گوێم لە دایکم بووە گەر کەسێک زۆر وریا با، دەیگوت: (دەڵێی ئارەسووە) ئەو ژنە زۆر گوێی بە پرسیارەکانی من نەدا، تیژ ڕۆیشت، ئەوە بۆ من بوو بە خەمێکی دی، هیچ ڕێزی بۆ من دانەنا، هەر نەبا دەبوو وەڵامێک منی دابایەوە. جارێکیان لە دانیشتنێکدا گوێم لە

کەسایەتییەکی سیاسی بوو، باسی لە کتێبێک دەکرد، ناوی کتێبەکە (میر) بوو لە نووسینی مایکاڤیلی بوو، وەک ئێستام لە بیرە، دەیگوت سەرۆک نابێ بچێتە ناو خەڵک، تا شکۆی دانەبەزێ، تا خۆفی هەبێ و بەزێپک بێ، کە مدوێ بێ. ئەو ژنە زۆر ڕفتاری هاوشێوەی کتێبەکەی میری کرد، بەسەرۆکی گرووپێک دەچوو، دەیویست ناچارم بکاو دوای بکەوم ئاوڕدانەوەی جۆرێک بوو، غایلەی خراپم بەدڵ داهات، ئەو ژنە وەک سەرۆک پەلکێشی کردم، زۆر قورس و سەنگین دەدوا، گوتی: «گەر دەتەوێ تێبگەی بەدوام بکەوە، چی نهێنی ژیان هەیە دەتوانی لە منی وەربگری.» بیرم کردەوە دەکرێ ئەو حاڵەتە بە هەند وەربگرم، کێ دەڵێ نابێتە هاوکارێکی باش بۆ ناسینی ئەو پیاوە، ڕاستە بە پەرۆشەوەم بۆ حاڵی ئەو پیاوە بەڵام ڕەنگە ڕاستی و دروستی ئەو مەسەلەیە لای ئەو ژنە بێ، ئەوە ڕێکەوتێکی سەیرە. خۆ من باوەڕم بە خورفیات و نووشتە و گشتەک نییە، لێ ئەو حاڵەتەم وەک جادوو دێتە بەرچاو، ژنێک لە شێوەی سەرکردەیەکی ژنان و بەرپرسێکی کۆمەڵایەتی هەڵسوکەوت دەکات. هەر بە یەک پەنجە ئاماژەی بۆ کردم بچم بەدوایدا، پەلکێشیکردم، خەریکبوو ملم بشکێ هەڵەنگوتم و سەرسمێکم برد، دەتگوت یەخترمەم، بێ هیچ مەبەستیک هۆگری خۆی کردم، بەدوایدا ڕۆیشتم لە بەر خۆیەوە دەدوا.

زەرفێکی ڕەشی بەدەستەوە بوو، پانتۆڵێکی کوردی پیاوانەی لەبەردابوو، پرچەکانی لە دواوە بەستبوو لە ڕۆیشتنیدا لە ئەسپێکی ڕەسەن دەچوو پرچەکانی وەک یاڵی ئەسپ

دەجووڵانەوە، ڕێگەی گرتبوو تاو ناتاوێک ئاوڕێکی دەدایەوە. زۆر جار بیستبووم لە ناو پێشمەرگە کۆمۆنیستەکاندا ژنان بەرگی پیاوانیان دەپۆشن و مەمکەکانیان وەک دوو نارنجۆک بەسەر سینگیانەوە دەلارێنەوە، بە نیگایەکی گەرم، بە حەوسەلەیەکی پڕ لە جوانییەوە، بانگی کردم و گوتی: «ناوم مەلەکە، خەڵکی ئێرە نیم، لێرە لەودیو بازاڕەکەوە دەژیم، حەز دەکەم بێیتە ماڵەوە قسە بکەین.»

دەنگم گڕبوو، خۆفێک لێم نیشت و کەمێک هەنگاوەکانم شل بوون و بە سەر سورمانەوە سەیرم کرد و گوتم: «ڕەنگە نەتوانم بێم بۆ ماڵەکەتان، تۆ ژنێکی نەناسراو، چۆن گەنجێکی وەک من بێت بۆ ماڵەکەتان؟» زەردەخەنەیەکی هاتێ و ڕاما، لە چاویم خوێندەوە دەبێ چی بێ گەنجێک یا ڕەگەزی بەرامبەر وەک دوو هاوڕێ قسە بکەن و ئاریشەو کێشەو گرفتەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگا دەردەشە بکەین، ژنێک لە چاوەکانیدا چەندان خۆزگەو دیدی جوانی هەبوو، بەڵام وەختێک کۆمەڵگا ئامادە نەبێ، تێکەڵاو بوون و بەیەکەوە بوون نەنگی بێ، ئەو خواست و تێگەیشتنانە دەکوژرێن، ژیان وەک تەونی جاڵجاڵووکەی لێدێ، شتەکان ناچنەوە سەر یەک، خەون و خەیاڵە باشەکان دەچنە پەراوێزەوە، خاوبوونەوەی هەنگاوەکان و سارد بوونەوەی مرۆڤەکان دەبێتە ڤایرۆسێک و سەرجەم کۆمەڵگە دەتەنێ. گوتم: «ئاخر ئەی کەسێک لەگەڵ تۆ ناژیێ؟»

پێکەنی گوتی: «با، جا چ کێشەیەک هەیە، تۆ بەدوای پیاوێک کەوتی و پرسیارت لەمن کرد، لەوەیە بتوانم بۆ سۆراخی ئەو

پیاوه هاوکارت بم، بۆ دۆزینەوەی پشتیوانت بم، چیم پێبکرێ ڕێگەکەت نیشان بدەم، من تۆ دەناسم و دەزانم چ کارێکیش دەکەی، هەر لەڕوانگەی کارەکەتەوە تۆم هەڵبژاردووە، چەند ڕۆژی دی بەو کۆڵانە دا هاتوومەتەوە تا بتبینم، ڕێکنەکەوتووە، ئەمڕۆ فرسەتێکی باشبوو ویستم قسە بکەین ڕۆژێکیش هاتم بۆ کتێبخانەکەتان برادەرەکەت لە دووکان بوو، تۆ چۆن دەمخوێنیتەوە ئارەزووی خۆتە، بەڵام من پەیامێکی مرۆیی بەرزم پێیە، دەمەوێ بیگەیەنم بە کەسانێک لە ماناو گرنگی ئەو پەیامە تێدەگەن، تۆ دۆستی کۆمۆنیستەکانی، منیش سەردەمانێک لەو هێڵە کارم کردووە، سەروکارم لەگەڵ کتێب خوێندنەوەو نووسینە، کاری ڕۆژنامەوانی دەکەم، هێشتا هۆگر و دڵخوازی ئەو دید و ڕوانگە کۆمۆنیست و چەپگەرایەم، دەمەوێ لێت نزیکبم.»

یاقووب بە ناو هێنانی چەپ و کۆمۆنیزم و کتێب و خوێندەوە، ئاراستەی تێگەیشتنەکانی گۆڕا، خۆی و ناخی خۆی خوێندەوە، سەرزەنشتی خۆی کرد، بۆچی تێگەیشتنی خراپم هەبوو بۆ ئەو ژنە؟ دیارە هێشتا هەرزەکار و بێ ئاگام لە کۆششی مرۆڤە چالاکەکان، گومانی تێدا نیە دەبێ بە خۆم دابچمەوە، سەیرکە چەند جوان و ئازایانە دەدوێ، ئەو وەک ژنێک لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو، لە دەورو بەرێکی گوماناوی قۆڵی لێهەڵکردووە, ئەوەتا من خەریکە دەکەومە گومانی خراپ و بێ بنەما.

یاقووب سەری هەڵبڕی گوتی: «دێم بەڵام ئێستا نا، ڕۆژێکی دی دێم قسە دەکەین، پێدەچێ من و تۆ بتوانێن کارێک بکەین

بۆ ئاسوودەیی، بەڵام پرسیارێکم هەیە، ئایا چۆن دەتوانی ئەو پیاوەم بۆ بدۆزیتەوە؟ تۆ نەتبینیوە، نایناسی، تەنها سەرم لەوە دەرناچێ، ئەو دۆزینەوەی تۆ وەک پەرجوویەک دەچێ، بەهەر حاڵ دێمەوە لات.»

خۆم گیرنەکرد ڕۆیشتم بۆ دووکان، دارا دووکانەکەی کردبۆوە، سڵاوم کرد, باوەشم پێداکردوو گوتم باشبوو هاتیتەوە کلیلی دووکانەکەم جێمابوو، هەرباش بوو خۆم بزر نەکردووە. دارا تیلەچاوێکی دامێ و گوتی: «کە دووکانەکەم کردەوە شڵەژان و ناڕێکیەکم بینی، دڵم زۆر شتی دەگوت، هیوادارم کارێکی نەخوازراو نەهاتبێتەپێش.»

تەواو سەرقاڵیەکەیم بۆ گێڕایەوە نیگەرانبوو، گوتی: «گۆڕانکارییەکان خێران، ڕیحان نابێ بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی کردبێ.»

لەو بارەیەوە زۆر قسەمانکرد، لە خاڵێکدا ڕاوەستاین کە دەبێ ڕیحان حەتمەن کێشەیەکی هەبێ. ڕیحان حەزی لە هونەری تابلۆو تێکەڵکردنی ڕەنگەکان بوو، سەرقاڵی دۆزینەوەی هەڵکۆڵین و بە دوا داچوونی زانیاری کۆکردنەوەی پایەو تایبەتمەندیەکانی هونەرو ئەدەبیات بوو، دەمگوت: «ژیرانە دەیەوێ هەڵسو کەوت بکا، وەک من سەرچیخ بۆ عیشق ناڕوانێ، ئاخر من دەم و چەمم نییە، هێندە هۆگر و وابەستەی ڕیحان بووم لێمبووە بە نەنگی، پێشەنگایەکی هونەری کرابۆوە بەیانییەکە نەمتوانی بچم دوای نیوەڕۆکە چووم، سەیری تابلۆکانم کرد، ڕەنگ ئاویتە بە خەیاڵ و تێگەیشتنی مرۆ دۆستی و هونەرمەندانە داگیری کردم. چوومە سەر

مێژی نووسینی یاداشتەکان، چەند سەرە قەڵە مێکم نووسی، تەماشایەکی نووسینەکانی پێش خۆم کرد، نووسینی ڕیحانم بەرچاو کەوت (ئەو ژیانەی بۆی دەگەڕێم، لەناو دێڕەکانی شیعردا، لەناو ڕەنگ و سیمای درەخت و هەڵکۆڵینی بەردەکاندا، لە دڵێکی شکاو، لە ڕێگەیەکی ونبوودا، دەمەوێ چارەڕەشی ئەو ڕەنگانە بنووسمەوە لە بیابانی دڵێکی تینوودا خەریکی مردنن.»

هەستم بە نیگەرانی ڕیحان کرد، ناو دێڕەکانی ڕیحان خەمم تێدا بینی، خۆ منیش هە ڕوا بە دوای شکانی خۆمدا دەگەڕێم. ڕووم لە دارا کردو گوتم: «نووسنێکی ڕیحانم خوێندەوە، پڕبوو لە نا ئومێدی، عاشقبوونی بە ڕەنگ و تابلۆکان ئێمەی خستۆتە دەرەوەی عەشقەوە.»

دارا گوتی: «مەرج نیە بەو جۆرە بێ، ڕەنگە عیشقی تۆ و ڕەنگ و تابلۆکانی ئاوێتەی یەکتر کردبێ، هەر کەسێک هۆگری شیعر و هونەر بوو ناکرێ عاشق نەبێ، هەڵس و کەوتیشی دەگۆڕێ.»

نەمدەزانی چۆن باوەڕ بەوە بکەم ڕیحان گرفتێکی نییە شتەکان هەر وەک خۆیانن.

بیرم لەو ماچە دەکردەوە، یەکەم جار بوو ڕیحان گوتی تەنها ماچیکت دەدەمێ و هەستمکرد دوای نەخۆشکەوتنم و نەشتەرگەری ڕیخۆڵە کوێرەم بۆکرا، بەزەیی پێمدا هاتۆتەوە، خرۆشابووم، لە خۆمەوە دەستەکانم دەجووڵاندن و دەبزرکام، دڵم زۆر خۆشبوو، پێمگوت: «شیعرێک لە دایکبوو، شیعر بوو

بە هەتوان، بوو بە هەستانەوەم و جوانیتان دەهۆنمەوە، ئاوی ژیان و ئاسوودەیی دەخۆمەوە، بۆ ماچێکت بەسەر لوغم و ئاگردا دەپەڕمەوە.«

زۆر قووڵ چووبوومە نا یاداشتەکان، بەمن با کەس قسەی لەگەڵ نەکردبام، لێک لێک داراش دەیدواندم و دەیویست تێمبگەێنێ کە بەلای بیری خراپ دا مەچۆ، ئەوانەی عاشق دەبن دەچنە جیهانێکی تایبەتەوە، شێت بووبووم، چاوم هیچ شتێکی نەدەبینی، کتێبخانە و کار و کاسبیم لە بەرچاو کەوتبوو، دەمویست بە دارا بڵێم: گەر بتوانی دووکانەکە بەڕێوە ببەی خۆت هەڵیبگرەوە، چیم پێکرا یارمەتیشت دەدەم، دڵنیابە پشتت تێناکەم هەر ئەو کەسەی جاران دەبم، لەڕووم نەهات چونکە دارا نەک هەر هاوڕێم بوو، لە برا دڵسۆزتر بوو، شەو و نیوەشەو ئیشم پێی با، منگەی نە بوو، لە خۆبردوو بوو، دەیان جار کە سەرەتای پەیوەندیمانبوو لەگەڵ ڕیحان، دارا دەچوو نامەکانی دەگەیاندن، هۆگر بوونیشی بۆ کتێبخانەکەش هەر لەبەر هاوڕێیەتی من بوو، بۆیە زاتی ئەوەم نەکرد ئەو پێشنیارەی بۆ بکەم، لێ هێندە سەرم لەخۆم ئاڵۆزکردبوو خۆم لە خۆم نەدەگەیشتم، مەلەک و سۆراخی ئەو پیاوەش، بەشێک لە زەینی داگیر کردبووم هەڵیدەپێچام، ڕۆیشتنم بۆ ئێران لە سەری خۆم دەرکرد، لەو لایەوە دایکم ئاسوودە کردبوو، ئەیووبیش هەر منگەمنگی بوو، ئەدرەسی تەواوی لەو دوو فارسە وەرگرتبوو، دەیگوت: »دەچم دەخوێنم، لێرە کەس پێناگا، پارەی ئێوەشم ناوێ، ئەو

دۆستانەم خوالێیان ڕازی بێ هەموو ئاسانکارییەکیان بۆکردووم.«

دایکم ڕۆحی لە قەلبیدا نەمابوو، وەک گیسکی هەیاسی لێهاتبوو، تامن کەڵکەڵەی چوونم بۆ ئێران لە سەریدابوو ئەو دایکە قوڕبەسەرەی من چاوی وشک نەبوونەوە، شەوێک بە دڵێکی ئاسوودەوە خەوی لێنەکەوتووە. هەموو ئەو شتانە دەبوو هەڵوەستەیان لەسەر بکرێ، گومانی تێدا نییە ئاریشەکان و ڕووداوەکان دەکرێ شرۆڤە بکرێن و دەیان وێناو تابلۆیان بۆ بکێشرێ. دەی وەرە و سۆراخی ئەو پیاوە و چوونی ئەیووب بۆ خوێندن ۆ شێتبوونی من و ڕێنمایەکانی داراو ئەو هەموو عەزابەی عیشق، هاتنی دوو ئێرانیەکان بۆ لای ئەیووب، جەمسەری بابەتەکەن، چەند ڕۆژم پێچوون تا خۆم خڕکردەوە، بیرێک لە مەلەک بکەمەوە، ئەو پیاوەی بووە بە خەم، ناتوانم وازی لێبێنم، هەر دەبێ بیدۆزمەوە ئەو دنیایە سەرەو ژوور بکەم، بزربوونی ئەو پیاوە نەنگییە، ئەو پیاوە خێزانەکەی تووشی شێرپەنجە بووە، بە دوای کاردا دەگەڕێ، ئەو جگە لە من کەسێکیدیکەی شک نە بردووە، دەگەڕێم تا سەرە داوێکی لێهەڵدەکڕێنم، ئەو بابەتە گرنگ و هەستیارە، لێرە پشت بە ئایدیۆلۆژیا دەبەستم، ئەوەی خوێندوومە و بیستوومە، خزمەت و دستگرتنی کەسانی پێداویستی تایبەتە، وانەو دەرسەکانی خوێندوومن خۆ بەستنەوەیە بە کرۆک و ئاریشەکانی ئەو پیاوە. ئەوە کاری مەبدەئی منە هاوکاری و قوربانی بۆ خەڵک، دەی بابەتی لەوە گرنگترو هەستتیارتر

هەیە؟ وێنەو جووڵەی ئەو پیاوەم بۆ دارا باسکرد، بەلایەوە غەریب نەبوو, گوتی: «ئەو پیاوەم بینیوە.»

تۆزێک ڕاما، گوتی: «ئەو پیاوەم دیتووە، سوور و سپی، کەڵەگەت، چاوشین و برۆ ئەستوور، کە وشەی شینی لە زار هاتە دەر، سەراپا هەست و بیرکردنەوەم بوو بە ڕیحان، شین لەلای ڕیحان، زۆر پیرۆزبوو، دەیگوت: «حەزدەکەم کفنەکەشم شین بێ، ماڵەکەم شین بێ، کراسی بووکێنیم شین بێ.»

داوای دەسماڵێکی شینی لێکردبووم، دەیگوت: «دەمەوێ بزانم زەوق و سەلیقەت چۆنە.»

ئەوەم زۆر پێخۆشبوو، هەستم کرد خاوەنداریەتی ڕیحان دەکەم، خەریکە بەرپرسیارەتیەکم کەوتۆتە سەرشان، ڕیحان وەک خەمخۆر و کەسێکی نزیک تەماشم دەکا، ئەوەتا دەیەوێ بۆچوونی من بزانێ، دەیەوێ بە خواستی من یا باشتر بڵێم، بۆچوونی منیشی لەسەر بێ، ئەو بەها دانانە بۆ من جۆرێک بوو لە دڵخۆشی هەستکردن بوو بە خۆشەویستی ڕیحان. گوێم لە دارا گرتبوو، هەموو ئەندامەکانی جەستەم ببوون بەگوێ. دەیگوت: «ئەو پیاوە دەبینمەوە، بێخەم بە، بەڵام سەبرم لێبگرە، ئەوە ئیشی من بێ.»

زۆر ئاسوودەبووم و گوتم: «ئاخر زۆر بە ڕاستیمە دەبێ ئەو بدۆزمەو.» دارا تۆزێک ڕاما، گوتی: «بیرم کەوتەوە لەو ڕۆژانەدا تۆ لێرە نەبووی، هات و ڕێزی زۆری هەبوو بۆت، گوتی بە هاوڕێکەت بڵێ ئێمە چووینەوە کەرکوک، گەر هەوڵی

پەیداکرنی کاری داوە، با وازی لێبهێنێ، بە دڵپڕیەوە، گوتی هاوسەرەکەشم ئێوە خۆش، لە ململانەیەکی سەختی شێرپەنجە دابوو چیدی بەرگەی نەگرت.»

شۆک بووم دەستی دارام گرت، گوتم: «باشە کوڕی باش بۆچی ئەو هەواڵەت زووتر پێنەدەگوتم، دەزانی چەندە پەرۆشی ئەو بابەتەوەبووم؟» بیرم بۆ کوڕە مامەکەم چوو، لەو کاتەوە کە مامم قەهاری چەرموو بەو دڕندەیە لە شەوێکی سارد و سڕدا لە دۆڵێکی چۆڵ و پڕ مەترسیدا, ڕووتیان کردبۆوە و بە پشتێندەکەی خۆی لە دەوەنێکیان بەستبوو، تا گیانی دەرچوو بوو، دایکم بۆی گێڕاوینەوە، ئەوان چوونەتەوە کەرکوک، بە هۆی ئامۆژنم، پەیوەندیمان وەک پێویست نەبوو، بەڵام بڕیارمدا هەر بچم بەڵکو سۆراخێکی ئەو پیاوە بزانم، ئاخر خۆ کەرکوک گوندێکی بچووک نییە تا بتوانم ئەو پیاوە بدۆزمەوە؟ لە سەر سۆز و بڕیاری بێبنەما، دەمویست ئەو کارە بکەم. بڕیارەکەم ژیرانە نەبوو، بەڵام مەغدووریەت و ئازاری ئەو خێزانە هەراسانی کردبووم. خۆ سەدان خێزانی دیکە لەو شێوەیە لەدەورووبەری خۆم هەبوون، بەڵام ئەو حاڵەتەم وەک گرێیەک لە دڵمدا دروست ببوو. ڕەوشی کەرکوکیش هێندە لەبار نەبوو، ئەوانەی لە کەرکوک بوون، لەلایەن پیاوەکانی ڕژێم سووکایەتیان پێدەکرا. بەهیچ شیوەیەک دایکم ڕێگەی پێنەدام، ڕۆیشتنی ئەو ماڵە وەک بەردێکیان لە سەر دڵم دانابێ، دەی خاتوو مەلەک گوتی: «دەمەوێ هاوکاریت بکەم» تازە هیچ کارێکم بەو نەماوە، ڕەنگە ئەویش بۆخۆی سەر ئێشەیەک دروست بکا، بەڵام

بەڵێنم بەو ژنەدابوو بچمەوەلای، دەچم و باسی ڕۆیشتنی ئەو پیاوە ناکەم، بزانم چی ئاگا لێیە، سبەنەیەک دوای نانخواردن خۆم ئامادەکرد، دایکم گوتی: «فکری چوونە کەرکوک لە سەرت دەر بهێنە، گەر بە قسەم نەکەی شیری ئەو مەمکانەی خۆمت لێ حەرام دەکەم.»

قسەی دایکم هێڵی سوورە، ئەزموون و بیرکردنەوەی دایکم لە ئێمە باشتربوو، ئەو لەو سەری ڕاهاتبۆوە، زۆر جار دەیگوت: «گەنجەکان ژیرانە بیر ناکەنەوە، وە لە خەمی ئەوەش نین داخۆ دڵی دایک چیتێدایە.»

ئەو دایکەی ئێمە، نانێکی بە ئاسوودەیی نەخواردووە، تا بابم دەستی لە سیاسەت و کاری حیزبایەتی وەر دەدا، ئەوە خەفەت و دەردە سەرییەکانی بۆ دایکم کەم نە بوون، ئێستاش بە دەست ئێمەوە گیرۆدە بووە... فکرم کۆکردەوەو چووم چاویکم لە جلکەکانم کرد، چەند دڵۆپە عەترێکم بە کراسەکەم داکرد، بۆن و بەرامەم بڵاو کرد، دایکم زەردەیەکی هاتێ، تێگەیشتم خەیاڵی بۆ کوێ چووە، ئەوەندەی لاخۆشبوو کە بە خۆ داهاتباین و چووباین دنیای لێ ڕوون دەبۆوە. گوتی: «چل سوارەی غەیبی ئاگای لێتان بێ، بە خۆشی ڕۆژەکەت بەڕێبکەن، ئەوەندەم دەوێ دڵتان خۆشبێ.»

شانەیەکم بە سەرم داهێناو بیرم لە خاتوو مەلەک دەکردەوە، نابێ لە بەڵێنی خۆم ژەوان ببمەوە، تەمەن باقی بێ ئەمڕۆ دەبێ ببینم، ڕۆیشتم هەناسەم تەنگ ببوو، وەک لە دووم بن، ناسیاوێکم بینی گوتی: «کاکە خێرە وا مەشغوڵ دیاری؟»

دەستێکم بۆ بڵند کردوو، بە ئاماژە حاڵیم کرد شتێک نییە شایەنی باس بێ. سەری حاڵیبوونی لە قاند. غایلەی خراپم بە مێشک داهات، نزیک ئەو ماڵەبووم ئەو ڕۆژەی کە چووە ژوورەوە، گوتم بۆسەیەک نەبێ و درکی پێ نەکەم، نا بابە ئەو خەیاڵانانە لە سەر دەربکە، چیم تا بۆسەم بۆ دابنێن، بۆ هەموو شتێک دەبێ! خۆ دکتۆر جگە لە چاکەو کاری خێرخوازی کردەوەیەکی خراپی نەبوو، تیرۆرکرا بۆیە هیچ کات هێندە سادەنەبێ. ویستم تەقولبابی دەرگای ماڵی خاتوو مەلەک بکەم، چاوم لە ژێر پێی خۆم نەبوو، هەڵەنگووتم، تەختی ناوچاوانم بە دەرگاکە کەوت، بە هێزی سەرم دەرگاکە کرایەوە دەستەکانم دادان و کەوتمە ناو حەوشەی خاتوو مەلەک، کەسیان لە حەوشەکە نەبوو، بە دەنگی دەرگاو تەپەی کەوتنی من، خاتوو مەلەک هاتەدەر، ئەو هەر لە خۆر دەچوو، سەری کۆڵمەکانی لە کڵوکە سوورە دەچوون، ئەو شیعرانەی خوێندبوونمەوە وێنا و ڕیتم و تابلۆکانم لە نیگاو سرووتەکانی مەلەک دا بینین. وەک لێوەگانی ڕەنگی گەنمیان نیشان دەدا، دەستەکانی بەر خۆرەکە کەوتن هەزاران گۆرانی لە ڕوونی پێستیدا بەر گوێم دەکەوتن، تراکسودێکی تەسک و ئازای بەندەنی دیاربوو، کراسێکی قۆڵ کورتی پەمەیی، پێستێکی سەرنجڕاکێش، هێندە شیرینبوو حەزت دەکرد ئامبازی بی. خووم خەرا بوون، بەڵام هێندە شەرمەزار بووم، کەوتنەکەم بوو بە هۆی ئەوەی نەمتوانی هیچ دەر ببرم، دەستێکم بۆ ناوچاوانم برد هەستم بە تەڕاییەک کرد، هاواری کردمێ گوتی: «چ خێرتە کاکە ناوچاوانت خوێنی لێدێ؟»

وەختبوو نەمناسیتەوە، لێم هاتەپێش و گوتی: «ئەوە تۆی بۆچی تووشی ئەو حاڵەتە بووی؟»

مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە، ناوچاوانی خاوێن دەکردمەوە، هەندێک لەفاف و دیتۆلی هێنا، لەگەڵ خاوێنکردنەوەو تەداوی کرنی برینەکە قسەی دەکرد: «چەند ڕۆژە چاوەڕێت دەکەم، سۆراغت نەبوو، ویستم بێم بۆ کتێبخانەکەت لێ بیرم کردەوە نەدەگونجا.»

چاوێکم دایە ناو مەمکەکانی دەمم پڕبوو لە ئاو، کە نزیک دەکەوتەوە لێم، مەمکی لە شان و ملم دەخشاند، زۆرجار خۆی بەسەر شانی چەپمدا دادەدا، ورووژانکی ڕۆمانسی بۆ دروستکردبووم، بەڵام شەرم ناخی سووتاندم، دڵەکوتەم گرت و خەریکبوو قسەم دەپرژاندن، دەمگوت: «دەبێ ڕیحان ئاگای لەو حاڵەی من نەبێ؟» ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە ناخ و هەستی منی خوێندبێتەوە کە نیازم پیسەو ئەوەتا کەوتوومەتە ناو پرۆسەیەکی خیانەت و خەریکە هۆشم لە دەست دەدەم، تووشی شەڕێکی دۆڕاو بووم، گومانی تێدانییە ڕیحان باش منی خوێندۆتەوە، دڵنیام لەو ماچەش پەشیمان بۆتەوە ئێستا دەستی خۆی دەشکێنێتەوە، مەلەک بە هۆشیاریەوە کارەکەی خۆی دەکرد، ئەنگووستەکانی بەهێواشی لە ڕوومەتم دەخشاند، زۆرجار پەنجەی بەلێوم دەکەوت و ئەو لەفافانەی بەکاری دەهێنان دەیخستنە ناو ستڵێکی نایلۆن و بەدەم قسەکرنەوە پەنجەکانی بە پرچم دادەهێنا، دەیگوت: «بەداخەوە پێمناخۆش بوو ئاوات بەسەر هات، بە خەتای خۆمی دەزانم، نەمگوتبا سەرم بدە، تۆش تووشی ئەو حاڵەتە نەدەبووی،

بۆنێکی خۆشت لە خۆت داوە دەڵێی ژوانت هەیە، سێحری ئەو بۆنانە لەوەدایە سەرنجی بەرامبەرەکەت ڕا دەکێشێ، بۆن خەسڵەتێکی جوانی هەیە، مرۆڤ چەند شیرین بێ شیرینتری دەکا.»

ڕووم تێکرد و گوتم: «سپاس بۆ پەرۆشیتان، ئێوە سەنگین بە ماریفەتن، ئەوەتا دەمێکە خۆتان بە برینی ناوچاوانم خەریک دەکەن، تا ئەو ساتەی لەگەڵ ئێوەم هەست بە شەرمەزاری دەکەم، پرسیارێکم هەیە، دەتوانم بپرسم بەڕێزتان لەگەڵ کێ دەژین، دەمێکە من لێرەم جگە لەتۆ کەس نابینم؟» گوتی: «نا، تەنیا نیم، لەگەڵ دایکم دەژیم، وا لە ژوورەوەیە لە سەر قەرەوێڵەکەی خۆیەتی بۆ دوو ساڵ دەبێ جەڵتەی دەماغ لێیداوە، بابیشم لە ساڵی هەشتاو نۆ ڕژێم لە سێدارەی داوە، دوو براشم ئەنفالن، خاڵەکانم ئاگایان لێمانە، حەزدەکەی دایکم ببینی؟»

پەرۆشی ئەویش هاتە سەر پەرۆشییەکانی دیکە، وەک ئاوێکی ساردم بە لەشی دا بکەن، زەوق و سەلیقەم نەما، هاتمەوە سەر خاڵی سەرەتا، نیگام لە نیگای مەلەک ترازا، شۆڕبوومەوە بۆ ناو خەم و ئەندێشەکانی، گوتم: «ئەو هەموو جوانیە و دنیایەک خەمی قووڵ، گیرسانەوە بە نەخۆشێک و تەنیایی بوونێکی دوورو درێژ، ئای چەند مرۆڤێکی گەوەرەو پڕ هەستە!»

لە ترپەی دڵی مەلەک هێندە نزیکبووم، هەستم بە ماندووبوونێکی ڕۆحی و جەستەیی مەلەک دەکرد، تەواوی جەستەم ببوو بە گوێ، لە دووڕیانێکی سەخت دابووم،

بیرکردنەوەم ڕێگەی قوتاربوونمی نەدەدا، گێژاوێک لوولی دەدام، لەگەڵ خنکاندنی خۆمدا دەیان پرسی نیوەچڵم جێدەهێشت و نەمدەتوانی بگەڕێمەوە سەریان. بە دەنگێکی شەرمنانە گوتم: «حەزدەکەم، گەر بتوانم هاوکارییەکت بکەم خۆشحاڵ دەبم.»

چاوێک پڕ لە پرسیاری لێکردم فەرمووی ژوورەوەی لێکردم. دیتم ژنێک ڕۆحی لە جوانی کتێبەکان دەچۆ، پرچێکی سپی، سپی، ڕووناهی چاوەکانی شەوانی مانگەشەوان و سەمای ڕۆیشتنی گەنجییەتی و چاوەکانی مەلەکم تێدا خوێندنەوە، هۆشی زۆر باش بوو، مەلەک منی پێناساندوو دەستم ماچ کرد، ڕشتنی ڕۆندکەکانی وێرانی کردم، بە حاڵ توانی دەستم ڕابکێشێ و سەرم بۆی نەوی کردوو ماچی کرد، بینیم مەلەک پشتی لە من کردبوو لەگەڵ هەنسک و دڵپڕی خۆی هەڵدەبەزیەوە، دایکی مەلەک بە ئاماژەیەک بۆ برینی ناوچەوانم هەستم دەکرد نیگەرانەو دەیەوێ بپرسێ ئاخۆ بۆچی نێوچەوانم زامداربووە، مەلەک نەیوست فرمێسکەکانی ببینم و دایکی حاڵیکرد شتێکی وا ڕووی نەداوە سەری بەر دەرگاکە کەوتووە. گوتم: «هاوکارییەکتان پێویست بێ حەزدەکەم چیم پێبکرێ بیکەم، دەبێ بڕۆم کات درەنگبووە ڕەنگە هاوڕێکەم نیگەران بێ لە دواکەوتنم.»

دەستم بۆ دایکی مەلەک بڵندکرد، ماڵاوایم لێکرد و مەلەک گوتی: «دایە گیان ئێستا دەگەڕێمەوە.»

لە حەوشەی ماڵی مەلەک، بیرم کەوتەوە بۆچی هاتووم، شەرمم کرد پرسیاری ئەو پیاوە بکەم، لەبەر خۆمەوە

منگەمنگێکم کردوو، ئەوەی ئەمڕۆ بینیم زۆر خەیاڵی پەرتکردم ئەرکێکی دیکەی بۆ زیادکردم، دەکرێ زیاتر خۆم کۆبکەمەوە، سەرێکم بۆ لەقاندوو ماڵاوایم لێکردو گوتی: «دەبێ بێیتەوە بە هیوای دیدار.»

وام خۆ نیشاندا بێگومان سەر دەدەمەوە، پێشئەوەی لاقم بچنە دیوی دەرگای دەروە، گوتی: «کە هاتیتەوە پرس گەلێکیدیکە باس دەکەین وەڵامی پرسیاری ئەو ڕۆژشت دەدەمەوە، وریای خۆت بە ماڵاوا.»

# بەشی بیستەم

یاقووب لەگەڵ خۆیدا دەدواو دەیویست ئەو حاڵەتە زیاتر راڤە بکات، لە حاڵەتی ماندوو بوونێکی دەروونیدا بوو، پێیوابوو ئەو تێکەڵاو بوونە:

ئاخر بۆ دەبێ سەر بدەمەوە؟ هێشتا کۆمەڵگەی ئێمە بەو ئاقارە نەگەیشتووە، ژن و پیاو بەو شێوەیە هاورێ بن! ڕۆژێک لە ڕۆژان بەر حاڵەتێکی نەخوازراو بکەوم، کێ باوەڕم پێدەکا ئەو هاوڕێیەتیەی ئێمە لە چوارچێوەی هاوڕێیەتیدا ماوە، حاڵەتێکیدیکەی بەخۆوە نەگرتووە، هەر ئەو حاڵەتەی شکانی سەرم، ئەوەندەی نەمابوو حەزێکم بۆ دروست بێ، ئەوە کەم و کوڕی خۆمە، وا پێویست دەکا، خۆم پەروەردە بکەم، خەیانەت بە ڕیحان خەیانەتە بە خۆم. خۆ ئەو جارانەی دەمەوێ شێعرێکی ناسک لە کتێبەکان بخوازم و بە نامەیەک بینێرم بۆ ڕیحان، وشەکان نابینمەوە بۆ جوانی و ئەوینی ئەو بیانچنم، وەک قردێلەیەکی شین، شیعر بە پرچەکانی هەڵبواسم، وەک چارشێوێکی شین لەگەڵ وشە فڕیوەکانی یاخی، بەسەر شانیەوە بنیشم، بە نیگای ئەودا سەرکەوم و لەسەر گۆی مەمکی چەپی سروودی نێونەتەوەیی بخوێنم، لە سەر گۆی مەمکی ڕاستی، ڕاستی دڵی خۆمی لێبنووسم. چیرۆکێک دەبێ، لەسەر باڵی فریشتەیەک دەینووسم و تا زامەکانی زەمەنی نامرادیمان تێپەڕێنێ و پەیامی دڵخۆشیمان

بەرێتەوە بۆ ئاسمان. بابی ڕیحان و بابی من و خاڵم، لە کۆمەڵەیەکی جوتیاریدابوون، ڕیحان وەک یادگاریەکی بابی لای دایکی و برایەکەی زۆر تایبەتە، شکان و بێ حورمەتی پێکردنی سووکایەتی کردنە بە شکۆ و جوانیەکانی ئەو خێزانە. حەمە ڕیحان لە زیندان بەربوو دوای ساڵێک ڕیحان لە دایک بوو، هێندە حەزی لەوەبوو منداڵێکیان پەیدا ببێ کچ بێ. دڵخۆش بوو ئاواتەکەی هاتە دی، لە خۆشەویستی نازناوی خۆی ناوی لێنا (ڕیحان) ڕۆژێکیان خاڵم بانگی کردم و لای خۆی داینیشاندم وگوتی: «دەمەوێ کەمێک باسی ژیانی خۆمانت بۆ بکەم، ئەو ڕۆژانەی پێویستیمان بە حەواجی ماڵی هەبا، بچین بۆ شار، دەبوو پێ لە جەرگی خۆمان بنێین، ئاغا و پیاوەکانی، ماڵیان لە سەر ڕێگەی گوندەکەی ئێمەبوو، سەگەکانیان ڕاهێنابوون، ئەو جوتیارانەی دەچن بۆ شار، بۆیان نیە بڕۆن تا سەگەکان پێیان هەڵنەمیزن، بۆمان نەبوو چغەیان لێبکەین، نابێ بەردیان تێبگرێن، نابێ لە بەر سەگەکان ڕابکەین، هەموو گیانمان گلاو دەبوو، پاتەکانمان پڕ دەبوون لە میز شلپە شلپی پێلاوەکانمان دەنگی دەدایەوە، پڕینچکی ناو پاتەکانمان بە دەم و چاومان دەکەوت، تا سەگەکان تەواو نەبووبان ئێمە نەماندەتوانی بستێک دوور بکەوینەوە، کە لە شار دەگەڕاینەوە دیسان ئاغاکان هەرشتێکمان لە شار کڕیبا، ئەوان باجی خۆیان وەردەگرت، گەر سەرپێچییمان کردبا شل و کوتیان دەکردین، دیسان دەبوو چووبایەنەوە بە قوڕە سوور خۆمان گلاو کردبایەوە، جوان خۆمان لە کانی هەڵکێشابا و خۆمان بسمیل کردبا، ئەوە ژیانی گوند نشینان بوو، دەستەلات و حکومەت، ئاغاکانی ئیزن دابوون چۆنیان ئارەزوو لێبێ ئاوا

بکەن، ئەوە ژیان و گوزەرانی ئیمەبوو، ئێمە چەند کەس لە گوندەکە ڕێککەوتین چارەسەرییەک بدۆزینەوە، بەڵام ئەستەم بوو، (الجمعیة التعاونیه الفلاحیه) کۆمەڵەی جوتیاری، ڕێکخراوێکبوو لە لایەن حیزبی شیوعیەوە پشتیوانی دەکرا، پەیوەندیمان بەو ڕێکخراوە کرد، چیمان پێکرابا بە نهێنی ئەنجاممان دەدا، هێزگەلێک هەبوون، چاویان بەرایی نەدا کەسانێک هەبن داکۆکی لە مافی خۆیان بکەن، ئەو ڕۆژەی بە ئاغاکانمان گوت نا، نا بوو بە گیانێکی زیندوو، بوو بە پرسیارێکی جەوهەری، بوو بە ئاوێنەیەکی ڕۆشن و هەموو نادادیەکانی تێدا بینرا، بوو بە سیبەرێک و پەنایەک بۆ پشوودان، بوو بەو هیزەی ڕاونانی سەگەکانی ئاغا، سەگەکان و ئاغاکان بوون بە مێژوویەکی ڕەش و لە زەین و بیرکردنەوەی ئێمەدا ناسڕێتەوە.

چەند ئاغایەکی ویژدان زیندوو ئەو زووڵمەیان پێ قەبووڵ نەدەکرا، خۆیان دوور دەگرت لە کاری وا قێزەون، تا خەڵکێکیان هەبوو لە ڕێزی حیزبی شیوعی، کۆک نەبوون لەگەڵ کردەوەی ئاغا زاڵمەکان.»

ئەو چیرۆکانەم دە هاتەوە یاد، بمبوورە ریحان هەندێک خەیاڵ لە تۆیان دابڕیم. دەگەڕێمەوە بۆ لای هەست و کەسایەتی ڕیحان، ئێمە هەردووکمان قوربانین. هەڵتەک هەڵتەک، ڕۆیشتم بۆ دووکان، دارا دیتی نێوچاوانم زامدار بووە، هەندیک پڕینچکە خوێن بە یەخەی کراسەکەمەوە بوون، نیگەران و سەرسام بوو، چاوێکی لێکردم و بە خەمباریەوە گوتی: «ئەوە چێ ڕوویداوە؟»

ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، زۆر سەرزەنشتی کردم، نەدەبوو بە تەنیا ڕۆیشتبای بۆ ئەو شوێنە، کەی ئەوە کاری تۆیە، بەمنت گوتبا بەیەکەوە دەچوین. دارا هیچ گومانی خراپی لە من نەبوو، دەیان جار بۆیان گێڕاومەتەوە بە کەسێکی داوێن پاک و ڕاستگۆ باسی منی کردووە، بۆیە پێیوابوو من جگە لەکاری باش، کاری خراپ ناکەم، حەزی دەکرد بۆ هەموو شوێنێک هاوڕێم بێ، ئەی گەر لە کونێکڕا چاوی لە چۆنیەتی پێشوازی کردنی و خۆخشاندن و خۆنزیککردنەوەی لە هەستەوەریەکانم، گەر دەتزانی لە چ ئۆخژنیەک و چ حاڵەتێکی ڕۆمانسی دابووم، گەر شەرم و ترس و دڵە ڕاوکێ نەبا، شەهوەتی لاویەتی خۆم دەرژاند و نەدەگەڕامەوە بۆ هیچ، ئەو حاڵەتەی منی زیندانی کرد، تەقیەم لە زۆر شت دەکرد، وروژان و دروستبوونی حەزێک بۆ باوەشێکی مەلەک، خەریکبوو دەیخزاندمە ناو خەیانەتێکی قیزەون، خەریکبوو یاد و یادگاریەکانی ڕیحان لە یاد بکەم. ئەو تەسلیمبوونە، لادانێکە لە پرەنسیپی چەپێک و کەسێک دا نییە خۆی بە داکۆکی کاری کەسانی بەشمەینەت و زەحمەتکێش بزانێ، ئەوەی ئەو ڕۆژە بۆ من هاتەپێش، ڕووی لە هەر کەسێک کردبا نەیدەتوانی خۆ ڕاگر بێ. ڕوومەتەکانی مەلەک لەبەر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە، ڕەونەق و ڕوونیەکەی هەموو کەس بۆی حەیران دەبوو، مەمکی هێندەی پرتەقاڵێک دەبوون، دەڵێن ئەو ژنانەی مەمکەکانیان گەورەن، هۆکارەکەی ئەوەیە زۆر لە لایەن دڵدارەکانیانەوە یاری بە مەمکەکانی کراوە، بەڵام هی مەلەک زۆر سەرنج ڕاکێش بوون وام دەخوێندەوە تا ئێستا دەستی کەسیان بەر نەکەوتووە. لە ڕۆیشتنیدا قیت و توونـد

دیار بوون، دووجار گۆی مەمکەکانی بەسینگم کەوتن، دەمویست، بە ددانەکانم ڕوومەتی بگرم، خۆم فڕێبدەمە ناو کراسەکەی، شەیتانێک هاتبێتە ناو کڵێشەمەوە، ئەو شەیتانم نەدەویست دەری بکەم، دەمویست بیدوێنم و بەیەکەوە باس لەو شەڕابەی بەهەشت بکەین، باس لەو پەریە نازدارە بکەین ئەوەتا لەبەر دەمم دایە. شەیتان زیاتر هانی دەدام نزیک ببم نەهێڵم لە دەستم بچێ، شەیتان بە هێواشی حاڵەتی ڕووتبوونەوەی مەلەکی بۆ باس دەکردم، وەک ئەوە وابوو مەلەک خۆی لەبەر ئاوێنەکە ڕووتکردبێتەوە، پرچەکانی بەردابنەوە تا سەرسمتی هاتبوونە خوارەوە، لە نێوان هەردووک مەمکیدا لوزەوی ئەو شەڕابەم بەرچاو دەکەوت، لەوێدا ڕقم لەو خەیاڵەم نەدەبۆوە، زۆر جاریش خەونەکانمی دەڕازاندەوە.

شەوێکیان لای ڕیحان بووم، دەمم لەناو دەمی ڕیحان، پڕ دەبوو لە گۆرانی، حەزم لێبوو ڕۆژ نەبێتەوە، دەمگوت: خودایە با لە ناو مەمکەکانیدا بمرم و تا ڕۆژی قال و بەلا، ڕیحان بە سیما جوانەکەیەوە، بە ستیانە شینەکەیەوە، بە چاوی خەواڵ و دەنگە نەرمەکەیەوە، پرچە خاوەکەی بەسەر سینگمی دادەهێناو دەیگوت: (ئێرە مەملەکەتی ڕۆح و مەنزڵگای ئاسوودەیی منە.) هەرچەند بە شەرمەوە دەمگوت: (ئەو خەون و شەیتانی بوونە، شەوەکانت لاخۆشتر دەکات، ئەو خەیاڵت دەداتێ، ئایا شەیتان هێندە قێزەونە ڕۆژانە لە نوێژەکاندا بە نەفرەتی دەکەین؟) ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێ، چێژوو خۆشی ئەو شەیتانی بوونە، پشتت پێ لە هەموو شتیک دەکا، ئەو

حاڵەتی ئۆرجازمبوون و ئاسوودەییە مرۆڤ لە خشتە دەبا، ئاخر تۆ دڵخوازێکت هەیەو خۆشت دەوێ و دەستت پێی ڕاناگا.

هەوڵەکانت ڕێکدەخەی، دەتەوێ تەنها چەند قسەیەکی دڵی خۆتی پێ بڵێی نەریت و چاوی عەیار ڕێگرن، خێڵ و عەشیرەت و بنەماڵە ڕێگرن، هەستێکت لا دروستبووە دەبێ وابەستەبی بەو پرەنسیپ و ویستانەی کۆمەڵگە، گوێم لە بەساڵاچوان دەبوو، یەکێک کارێکی چاک و جیاوازی دەکرد، دەیانگوت: (چەند شەیتانە، چۆن توانی ئەوە بکا!).

ئەو ڕۆژانەی حاڵەتێکی نەخوازراو دەهاتە پێش، ئەیووبی برام دەیگوت: «هیچ نییە شەیتانی بەلەعلنەت بکەن.»

هەڵوەستەیەکم دەکرد، پرسیارم بۆ دروست دەبوو (شەیتان خودا خەڵقی کردووە، ئەو گەر بێ فەرمانەکانی خودا هەر کارێک بکا، دەستەڵات و حیکمەتی خودا، دەتوانن شکست بەو کارە بهێنن، لێرەدا کۆک نیم، دەمەوێ ڕوونکردنەوەم بدەیتێ، بۆ مەگەر خاوەنی ئەو کەونە، بە هەموو بوونەوەریەکانیەوە دروستکەری خودا نین؟ شەیتان وەختێک دێت لەو هەموو بەدبەختیەدا، ئاسوودەییەک دەهێنێ بۆ دەبێ بە نەفرەتی بکەین؟ گەر گومانم هەبێ دەبی بمبووری.)

ئاخاوتنم بەو شێوەیە، ئەیووبی نیگەرانکرد، هەستم کرد ڕوومەتەکانی سووربوون، مووی سەری قرژبوون، بەتۆنێکی توند گوتی: «خەریکە پێهەڵدەبڕی، ئەو بابەتەی تۆ باسی دەکەی مەکرووهە لە دین وەر دەگەڕێی تکادەکەم.»

پەشیمان بووم تێگەیشتم واخەریکە درز دەکەوێتە ناو برایەتیمان، هیچ داوای لێبووردنم نەکرد هەڵە بووم، تەواو باوەڕم بەوە هەبوو کە گوتم بۆیە هەر وا بکەم پێویست ناکا داوای لێبووردن بکەم. پرسیار گەلێکی لەو شێوەیە هەراسانی کردووم، ئەوە هەر لای من ئەو گومان و پرسارانە دروست نەبوون، ڕۆژانە گفتوگۆو بۆچوونی لەو شێوەیە لە کتێبخانە بەردەوامبوو، چونکە جۆرەها کتێبی پڕ زانیاری و لە بابەتی کێشمەکێشی چینایەتی و بیروڕا لە دووکانەکەی ئێمە دابوو، خوێندنەوە بەردەوام و گفتوگۆکان کەشێکی لەو شێوەیەی دروستکردبوو. دارا بەو حاڵەتەی کە لەبەر دەرگەی ماڵی مەلەک ڕوویدا، نیگەرانبوو، گوتی: «تکا دەکەم، گەر کەسێک زەبری لێداوی بابزانم.»

گوتم: «هیچ کات نامەوێ درۆ بکەم، چی ڕاستە ئەوەم بۆ تۆ گێڕاوەتەوە.» دارا ناحەقی نەبوو، ڕەوشی ناوچەکە باش نەبوو، ڕۆژ نەبوو پێکدادان و شەڕ و شۆڕ دروست نەبێ، هەرچەند ئێمە خۆمان دەپاراست، کارەکەی ئێمەش دوور و نزیک نەدەگونجا لەگەڵ کاری ئاژاوە، زۆر جار خاڵم ئامۆژگاری دەکردم، دەیگوت: «کتێب ئامرازێکە بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگە، ماڵێک خوێندەواری هەبێ و کتێبخانەی نەبێ، کەم و کوڕی و نەنگییە، بۆیە زۆر دەستخۆشیت پێدەڵێم کتێبت کردووە بەکاری ڕۆژانە. خوێندنەوەت.»

هاندان و پشتگیری خاڵم، وەک قەڵایەکی پتەو، وەک سەنگەرێکی تۆکمە، مکوڕتری دەکردم، مانەوەشم لەسەر کاری کتێبفرۆشتن، گومانی تێدانیە، ئەو پشتیوانییەی خاڵم

بوو. دەستم بۆکارێک نەدەبرد زیانی بۆ کۆمەڵگە هەبێ، بۆیە هەرگیز شەڕ و ئاژاوە کاری ئێمە نەبوو. پێشتر هەموو ڕووداوەکەم بۆ دارا باسکرد، بەڵام بەگومان و دڕدۆنگی لێیوەرگرتم، گوتم: «ریحان هیچ هەواڵی نییە،؟ گەر ریحان لەسەر ڕەقی ئەو کارەی بەردەوام بێ، دەبێ چارەسەری ئەو کیشەیە چۆن بێ؟»

دارا گوتی: «ئەو بابەتە پەلەی ناوێ.»

خەریکبوو دەنگم بەرز بێ، بەڵام زوو هەستم بە کەمی خۆم کرد، بۆچوونی دارا دروستە، ڕەنگە گرێیەک یا هۆکارێک هەبێ، ئەو ڕۆژەی لە کۆبوونەوەی هاوڕێیانش ئامادە نەبوو، برایەکەشی نەهاتبوو، نەمویست هیچ پرسیاریش بکەم، بەڵام یەکێک لەهاوڕێکان، گوتی: «ریحان و مەنسوری برای، گوتیان لەبەر هەندێک کاری پێویست ڕەنگە نەتوانین بەشداری کۆبوونەوەی پێنج شەممە بین، نامەکەی مەنسور و ریحانم خوێندەوە.»

بیرم بۆ زۆر شتی نەخوازراو چوو، هەوڵمدا بچم بۆ ماڵیان، بەڵام ددانم بەخۆم داگرت، ویستم وا ئاسان نەچمەوە بەر دەمی، ئەو عەزابی من دەدا، چۆن دەتوانێ لە شکان و برینداربوونی دڵی مندا هێندە غەددار بێ؟ من هێندە خۆڕاگر نیم، وا جەرگم جەرگی دەخواتەوە، خەو و خۆراکم نەماوە، چ جێتم لە جێیان نین، زۆر جار لەبەر خۆمەوە دەڵێم: لەوەیە ریحان بمخاتە ژێر تاقیکردنەوە، پێدەچێ چاودێریم بکا، ئەو سەنگین و خاوەنی خۆیەتی کەس کاریگەری لە سەر نییە، بۆیە دڵسۆزی و بێگەردی ریحان لای من کۆتایی پێهاتووە،

گەر شتێکی نەخوازراویش ڕوویدابێ دایکم دەیزانی و باسی دەکرد. دارا حەوسەلەو بیرکردنەوەی لە من باشترە، هێشتا لە زۆر شتدا هەرزەکارم، زۆر پەلە دەکەم، سیکەدانەم تەنگە، قسەیەکی دکتۆرم لە یادە دەیگوت: «یاخوا تۆ کارێکت نەبێ، دەڵێی لەسەر ئاو و ئاورانی.»

ئەوکاتەی دەمویست بەریحان بڵێم و ئاگاداری بکەم، هێندە قەلەق بووم، دەم و چاوم یەکپارچە ببوو بە زیپکە، چووم بۆلای دکتۆر هەندێک چارەسەری دامێ و گوتی: «دردۆنگی و بیرکرنەوەی زۆر و تەمەنی هەرزەیش ئەو حاڵەتە دروست دەکا، هەوڵبدە کەمێک خۆت دووربگری لەو حاڵەتە»

کەڵکەڵەی چوونم بۆ کەرکوک، بێ تاقەتی کردبووم، دارا زۆر دڵی بە من وەبوو، گوتی: «بە خت و خۆڕایی هەمووومان نیگەران دەکەی، دەبێ ئەو سەفەرەی کەرکوکیش لە مێشکت دەر بکەی، گەر ئەو پیاوە کاری بە تۆ بێ دێتەوە، خۆت ئاسوودەبکە.»

## بەشی بیست و یەك

یاقووب لەو گفتوگۆیەدابوو، سێبەرێک نزیکی دووکانەکەبوو، لە هارەی گۆبەرۆک هەڵکێشرابوو، تامی ئەو هەستکردنە لە هەنارێکی مێخۆشی پایز دەچوو، بەرامەی لە ڕیحانە کێوی خواستبوو، ئەو گوزەرەی لە شەبەقی مانگ پۆشیبوو، هەستت دەکرد سپێدەیەکی پڕ نەسیمی پێیەو دەیەوێ بڕژێ. وەک پلووسکی کوێستانەکان، وەک دەنگی قورینگەکانی ئاسمان، بە شاباڵی ئەوینەوە، بە چراوگی حەنینەوە، بە سرووشکی نەسیمەوە، بە سڵاوەتێکی پڕ سۆزەوە نیشت و نیگایەکی دایە کتێبەکان و بە زەردەخەنەیەکەوە هەستەکانی ڕۆنان و یاقووبی خستە هەژانەوە.

دارا واقی وڕما! ریحان وەک ئاسمانی شین و بە باوەشێک خۆرەوە، نیگاکانی دەداتە یاقووب. ئۆخژنی هات و بە سیمایەکی پڕ لە موحیبەتەوە ئاماژەی دایە یاقووب و ئەوە ریحان هات و هەستەکانی لەگەڵ هەستەکانی تۆدا یەکانگیرە، تۆ دەبێ خەمی ئەو ئەوینە بخۆی، هەوڵ بدە خۆت کۆ بکەیتەوە، هەستی مرۆڤایەتیت لە بەرزی دایە، بەڵام دڵی ریحان، خەون و خوولیای ریحان دەبی گرنگی پێبدەی.

سلاوی ریحان لەرزینێکی تێدابوو، هەستت بە ترس و دڵەڕاوکێی ریحان دەکرد، ژاکان و نیگەرانی لێدەخوێندرایەوە، سینگی پڕ لە قسەبوو، ددانی بەخۆی دادەگرت نامۆ نەکەوێتە

بەرچاویان. نیگەرانیەکانی ریحان قووڵتر بوون، ژینگەی کچێکی لە تۆغیان، ڕوومەتی پڕ لە شووعلە، لە دەورووبەرێکی نەوسن و بی ئاگا، وەک نێچیر هەوەس باز و مێباز و هەرزەی سێکس و خەیاڵی خاڵی بوونەوە بەلەکی ریحان بەرنادەن. ئاخر ریحان هەر لەو هێزە دەچوو پەرجوو ئاساو دەهری بوونی سێکس و ئەوینی بە جۆشتر دەکرد، ریحان نیگاکانی لە ماڵی جحێڵەکان جێدەهێشت و بەدەم وێنەکانیانەوە دەتریقایەوە، پێکەنینەکانی لە تابلۆکانیدا جێدەهێشت و ڕوانینی هەموو بینەرێک، تابلۆکانی حەنین و سەمبوولیەکانی مێینیەکی تینوویان تێدا دەخوێندەوە. لە ڕۆیشتن و پەیڤینیدا ئاوی سۆزو خەنی بوونی لێدەڕژا، سایەی دەرکەوتنەکانی لە سیوادێکی ڕۆشن دەچوون، بەرامەی شەونمەکانی لە دەست دابوو، هەر وەختێ قردێلە شینەکەی بەر خۆر دەکەوت، سەمایەک لە دڵی یاقووب دا بڵند دەبوو، خەونێک دادەگیرسا، دڵی یاقووب پڕ دەبوو لە گۆرانی، یاقووب لە پەیامی ئەوینێکی سووتاو، لە خنکاندنی بەردەوامی ڕێگاکاندا وەنەوزی دەدا، بە دیار کەوتنی نیگاکانەوە دەسووتا، ئاوڕێکی دایەوە چرقە لە پشتی هات، ماوەیەکە لە ناو عەزابێکی بێ ئاماندا دەخولێتەوە، لالووت بوونی ریحان و پەیدابوونی لەو ساتە وەختەدا، ماناو ڕەهەندی جیاجیای لێدەخوێندرێتەوە، لووتی بە لووتی ریحان کەوت و بە زەردەخەنەیەکی ترس ئامێز و درڕدۆنگیەوە گوتی:

«هاوڕێ ئەو هەموو جوانیە چییە لەو ساتە دڵتووندییەدا؟»

ریحان بە حەزەرەوە قسەی دەکرد و نیگایەکی دایە یاقووب و ڕووی وەرگێڕا, بۆلای دارا, بە ئاماژە تێیگەیاند، تووشی کارێکی خراپ بووە!؟

یاقووب بەوەی کە پرساری لە خۆی نەکردوو، لەگەڵ دارا قسە دەکا هیچ بوونێکی بۆ دانانێ، چاوی چوونە پشتە سەری، ڕەنگی دێنان و دەیبردن، دڵی دەلەرزی، دارا هەستی کرد هاوڕێکەی نیگەرانە، ویستی حاڵەتەکە ئاسایی بکا، گوتی: «شتێکی وا ڕووی نەداوە ناوچەوانی بەر سووچی ڕەفەی کتێبخانەکە کەوتووە، هەندێک چارەسەری سەرەتایی بۆکراوە، دەی ئەوە خۆی لێرەیە بۆ لە خۆی ناپرسی؟»

ریحان گوتی: «دەترسم ڕاستیم پێنەڵێ!»

یاقووب گوێی لە دوان و پەیڤینی داراو ریحان گرتبوو. بەڵام هێندە دڵتەنگ و نیگەرانبوو خەریکبوو لەپێستی خۆی بچێتە دەر، بیری کردەوە زۆر گوێی لە دایکی ببوو، کە دەیگوت ئارامگرتن کلیلی رەحمەتە. بەڵام هێندەی نەمابوو دڵ لە سینەی بێتە دەر و خۆی وەخۆ ناگرێ. بە نەرمی دەستی لە شانی ریحان دا، بەو مەبەستەی ڕوو بۆلای وەرسووڕێنێ، بەڵام ریحان بە نەقایلیەوە ڕووی تێدەکاو گوتی: «فەرموو بەڕێز، بۆیە پرسیارم لە هاوڕێکەت کرد دەمەوێ ڕاستی برینداربوونی ناو چاوانت بزانم.»

یاقووب کەوتە بیرکردنەوەی سەیر و گوماناوی، بۆچی ئەو بەو شێوەیە دەیەوێ عەزابم بدا؟ دەبێ کارێکی نەشیاوم کردبێ! یان ئەوەیە دەبێ ئەوەی مەلەکی بەجۆرێکیدی بیستبێ،

گەر وای هەستکردبێ دەستم لەگەڵ مەلەک تێکەڵکردووە ناحەقی ناگرم، ئاخر خۆ جگە لە خۆم و مەلەک کەس ئەو حاڵەتەی من و مەلەکی نەبینیوە, بیرکردنەوە و ڕوانینی ریحان بەهێزە، دڵی ئەو هەموو شتێک دەبینێ، گەر کەمێک خاوەن بەڵێن بام، نەدەبوو غایلەی خراپم بووبا، ئاخر ئەو کاتەی ماڵی مەلەک، هەموو جەستەم ببوو بە ڕۆمانسیەت و پانتۆڵ و دەرپێ کورتەکەم تەڕ تەڕ ببوو، بۆنی خیانەتم لێدەهات، پڕ ببووم لە درۆ، هەموو ئەو چەمک و وشە و ڕستانەی لە ئەوینی خۆم و ریحان‌دا بەیانم کردبوون، ئەو کاتەی ماڵی مەلەک هەمووی پێچەوانە ببۆنەوە.

ئەوەتا من بە ئایدیاو دیدێکی ڕادیکاڵ و پێشکەوتوخوازەوە، وەک چەپێک و داکۆکیکارێکی سەرسەخت لە چینەکەی خۆم، خۆم لە ریحان نزیکخستۆتەوە، ئەو ناسینی منی بەلاوە گرنگ بوو، ئەو منی لەگەڵ هونەرەکەی خۆی ئاوێتە کردبوو، لە نامەیەکدا بۆی نووسیبووم؛ وەختێک خەیاڵم بۆ کێشانی تابلۆیەک دەچێ دروست لە نیگای تۆوە دەست پێدەکەم، ئەو نیگایەی لە ئێوارەیەکدا بە دیار شیعرێکی تەڕ و گۆرانیەکی قووڵ، هاتە ناو هەستەکانم، پەلکێشت کردم و گوتم ماچێکت قەرزدارم، گوتم باوەشێکت بۆ دەکەم بە تابلۆ لێو ڕێژ بێ لە سەما، نابێ لێمدووربکەویەوە دەنا دەستەکانم هەڵدەوەرن، ڕەنگ و بارینی سروشکی تابلۆکانم دەبن بە تراویلکە هاوڕێ من زۆر لە خیانەت دەترسم.

جانتایەکەی لەشانی داگرت و پسوولەیەکی بانگهێشتنی دایە دەست دارا، گوتی: «خۆشحاڵ دەبم ئامادەبن لە پێشانگاکەمان، هاتنتان گرنگە.»

زۆرتر ئاراستەی قسەکانی ریحان ڕووی لە دارا بوو. یاقووب هەستی بە نامۆیی کرد، هەر ئەوەندەبوو نەکەوت، دڵی خێرا، خێرا لێی دەدا، ڕووی لە ریحان کرد و گوتی: «کچی باش ئەی من پێویست دەکا بێم؟»

ریحان سەرکەوتوانە و بە لە خۆ رازیبوونەوە گوتی: «ئەو پسوولەیە بۆ هەردووکتانە، بێگومان خۆشحاڵ دەبم، ئامادەبوونتان مکوڕترم دەکات، بە پشتیوانی ئێوە دەتوانم بەردەوام بم.»

ریحان عیشقی هونەر و ئەدەبیات زۆر کاری تێکردبوو، کاتێک هەرکەسێک پەیوەندی خۆشەویستی دروست دەبێ گومانی تێدا نییە پەنا بۆ شیعر دەبەن، هۆگری هۆنەرو گۆرانی دەبن، ڕەنگەکان تێکەڵ دەکەن و ڕوومەتی یار لە تابلۆدا نمایش دەکەی، عیشقی ریحان لەوە تێپەڕیبوو بگەڕێتەوە بۆ هەندێک بابەت، ئەو شەڕ لەگەڵ لەمپەرەکانی ئەوین دەکا، ناهێڵێ ئەو ڕەگە خورت و پر چێژە وشک بێ، ئەو ناهیلێ ڕەنگی تابلۆکانی ژیان ژەنگ هەڵێنن. ڕاستییەک بۆ ئەو دروست بووە دەیەوێ لەو ڕاستیەدا ئیش بکاو وێنەیەک لە ئۆخژنییەکانی بدات لە بەرۆکی ئەوین. ئاخر یاقووب، لەو هەموو ناڵینەی خۆی، بەو زام و ئازارەوە کوا فریای خڕکردنەوەو ڕێکخستنەوەی وێنەکان دەکەوێ! دەیەوێ لەو دووڕیانە دەربچێ، دەیەوێ ڕێگاکان تاقی بکاتەوە، بۆ ژیان

کۆشش دەکا، بۆ دەستەبەرکردنی ئەوین گیانی خۆی دەبەخشێ، پێ بە لووغم دادەنی بۆ گەیشتن بە دڵخوازەکەی.

یاقووب شەڕی لە گەڵ خۆیبوو، دەیویست ڕۆحی هەرزەیی لە ناخی خۆیدا بکوژی، ئەو ڕۆژەی خەریکبوو قایلبێ بۆ مەلەک، خەریکبوو بڕووخێ لە ژێر ڕووتبوونەوەی ژنێکدا، ئەو مەلەکی بە ڕووتی وێناکردبوو، خۆی لە چێژێکی هەرزەیدا مەڵاسدابوو، ئەندێشەکانی یاقووب، بڵاو بوون و ئەستەمبوون، ئەو وەک ئەوە وابوو نووشتەی لێکرابێ هەدادانی نەبوو، ئەو وێناو تابلۆیەی پیاوە غەریبەکەی لە بیر نەدچۆوە، خەم و بیرکردنەوەی بۆ ژنە نەخۆشەکە، قسەی پیاوەکە زۆر کاری تێکربوو، (دەمەوی بە ڕەنجی شانی خۆم بژیم، نانی شەرمەزاری ناخۆم، کارم دەوێ نەک دەست پانکرنەوە.)

یاقووب بۆ بنبڕکردنی هەژاری تێدەکۆشا، خەمی ئەوەیبوو دایکە ماندووەکەی پشوو بدا، تەبایی ماڵ و پەیوەندی خۆی و ئەیووبی برای بە بەرزی بهێڵێتەوە، خۆی خستبۆوە دۆخێکی خراپەوە، سەرەدەری لێدەرنەدەکرد، سەری گێژبوو، دەستی لە ڕەفەی کتێبکان بەربوو، خۆی بە دارا گرتەوە، چاوی لێبوو ریحان بە لووت بڵیندیەوە لە دووکانەکە چۆدەرەوە، هەموو سەرە داوەکانی لێتێکەڵبوون، نیگاکانی ڕژانە ژێر پێی ریحان، خۆی بە جانتا شانی ریحانەوە بینی، وەک عاشقێک خۆی خزاندبووە ژێر پرچەکانی لە دڵەوە باوەشێ لە قردێلە شینەکەی پرچیدابوو، ریحان ڕۆیشت و یاقووب کەوت.

دارا بە کەوتنی زۆر تێکچوو، هێندە پەرۆشی بوو، کەوتبووە ناو گێژواو، شڵەژا، دەستەکانی لێکدەهاڵان، مەترسی ئەوەی

هەبوو دایکی هەواڵی کەوتن و برینەکەی ناو چەوانی بزانێ بێ چەندوو چوون نۆبەی دڵ لێیدەدا.

دایکی ڕۆحی لە سەر سەری منداڵەکانی بوو، سۆزی دایە خەجێ، هەر بۆ منداڵەکانی خۆی نەبوو، بۆ منداڵی خەڵکیش میهرەبان و دڵسووتاو بوو، ژنێکی کورتە باڵا، کزولاواز، گۆشتی پێوە نەبوو، بەڵام شیرین و پرسۆز، کە نەزیلەو بەسەرهاتەکانی بۆ ژنەکانی گەڕەک دەگێڕایەوە، ژنەکان هەموو لەشیان دەبوو بەگوێ، تا ئێستا ژنێک لێی نیگەران نەبووە، دڵی بەوە خۆش دەبوو سەر لە ئێواران ژنەکانی گەرەکی بانگ دەکردن و هەموانی دەخستە دڵخۆشی و پێکەنین، چێژی لەو دانیشتنانە وەردەگرت، تا درەنگانی ئێوارە بەیەکەوە دەبوون، زۆر جار ژنەکان کێشەیان بۆ دروست دەبوو لەلایەن مێردەکانیانەوە، وەختێک دەیانگوت لای دایە خەجێ بووین و بە قسان گەرم داهاتبووین ئاگامان لە ماڵ و حاڵ نەماوە، پیاوەکان هیچ قسەیەکیان بۆ نەدەمایەوە، هێندە دایە خەجێیان خۆش دەویست کەس قسەی لە قسەی دا نەدەکرد.

پیاوەکان لە ڕیزی پیاوان دایاندەنا، ئەوەی ناسیبای وەک دایکی خۆیان تەماشایان دەکرد، دڵی لەگەڵ دڵی هەمواندا لێدەدا. دارا نەیدەتوانی چۆن ئەو حاڵەتەی یاقووب پەردەپۆش بکا، گەر بوورانەوەکەشی بشارێتەوە برینی ناو چاوانی ناشاردرێتەوە، ئەو لەزگەیە بەقەد دوو پەنجە دەبێ، هەر دەبێ حاڵەتەکە بەجۆرێک باس بکرێ دایکی بەلایەوە ئاسایی بێ.

دارا لەبیرکردنەوەی ئەوە دابوو بە شێوەیەکی جوان و ژیرانە ئەو حاڵەتەی یاقووب پەردەپۆش بکا، بەڵام ئەوەی بیرت بۆی ناچێ ئەوە دێتە پێش، خاڵی یاقووب دوای ئەوەی لەمەیدانی چەکفرۆشان بریندار‌بوو، ئەو چەک و تەقەمەنییەی لە ماڵی دابوون، بەسەری داکەوتبوونەوە ڕانەگوازرابوون، هێشتا قەرەوێڵەکەی لا نەبردبوو، چەند قوومبەلەیەک و سندووقێک فیشەک لە نزیک قەرەوێڵەکەی لە سندووقێکی سەربازی دابوون، چەند جار لای ماڵەوە باسی کردبوو دەبێ خەمێک لەو فیشەک و تەقەمەنیانە بخۆین، بەڵام پێیوابوو نابێ جگە لەخۆی کەسی دیکە ئەو کارە بکەن، هەمیشە ترسی ئەوەی هەبوو، با هۆکار نەبم کەسێک لەدەستی من زەرەر مەند نەبێ. پێیوابوو هەر شتێکی نەخوازراو بێتە پێش، هەر ملی خۆی بگرێتەوە، لە زۆر دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوەی خزماندا، دەیگوت: «دونیام قوونەکەو کردووە، بەشی خۆم ژیاوم، هێندەم ئیش بە ژیان نەماوە، تاجووچکان لەخۆم دادەبڕم، دەنا تەنها بەسەربەرزانە بمرم و شەرمەزار نەبم بۆ خێزانەکم باکم نییە.»

ئاخر ئەو ماوەیەی لە مەیدانی چەکفرۆشانبوو، چەندان حاڵەتی ناخۆش و دڵتەزێنی بینیبوو، چەندجار بە فیشەک لە دەست دەرچوون خەڵک زامداربووە خۆی یەکێک لەوانە بوو. جارێکیان قوومبەلەیەک لە دەست پیاوێکی کەرکوکیدا تەقییەوە بە خۆیەوە سێ کەسی کوشت و پێنج کەسیشی برینداركرد، ماوەیەک ئەو خەڵکەی مەیدانی هەموویان تووشی حەپەسان ببوون، دەیان حاڵەتی لەو شێوەیە دووبارە

دەبوونەوە، بۆیە بە هیچ شێوەیەک حەزی لێنەبوو نە منداڵەکانی نە یاقووبیش تخوونی ئەو شوێنە بکەون.

ئەو تەقەمەنییە سەری خۆی خوارد، دوای ئەوەی حەبی ئازار و دەرمانی پشوودانی خواردبوو چووبووە ناو خەوێکی قووڵ، دەیان خەوی دەربازبوون و دروستکردنی ژیانێکی نوێ و دامەزراندنی منداڵەکان و پەرۆشی و ئاگالێبوونی خوشکەتاقانەکەی و خەونی ڕەنگاو ڕەنگ، بێ ئاگا لەوەی سۆپاکە گڕ دەگرێ و خەبەری نابێتەوە، لە شیرن خەودا تەقەمەنییەکان دەتەقنەوە، بەڕێکەوت ئەو تەنیا لە ژوورەوە دەبێ، منداڵەکان لە ماڵ نەبوون، تەقینەوەکە ئەو گەڕەکەی بە دووکەڵ و ئاگر داپۆشی، هەموویان بەسەرماڵێکی سووتاوو کارەساتێکی لە بیر نەکراودا هاتنەوە ڕۆژێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، ئاپۆرای خەڵک ڕیزی بەستبوو، هەمووی لە چاوەڕوانی دامرکاندنەوەی ئاگرەکەدابوون، هەر بابا بوو تۆزیک خۆی پەنا گیربکا، ترسی ئەوە هەبوو تەقەمەنی لە ژوورەکە دامابێ. یەکێک لە پیاوەکان هاواری دەکرد: تکایە نزیک مەکەونەوە، هەرچی قەوماوە قەوماوە با لەوە خراپتر ڕوونەدا. دایە خەجێ بەڕاکرن ڕایدەکرد، کە بینی بڵیسەی ئاگر لە پەنجەرەکان گرفەیەتی، ئەو حەشیمەتەی بینی چۆکی شکا و کەوت، تەنها نووزەیەکی لەبەردامابوو، دەنگی دەرنەدەهات، توانی دەستێکی بڵندبکاو بۆ بڵێسەی ئەو گڕە، ئاماژەیەک بوو ئەوە کاکی منە دەسووتێ! براکەم نە دەستم پێتڕادەگا نە دەنگ، تۆ نابێ بمری و جێمانبهێڵی، گومانی نەبوو تاقەبراکەی بە قەرەوێڵەکەیەوە بووە بە قەرەبرووت، چی ناو خانوەکەیە

خاپووربووە، مەرگی تاقە براکەی بەچاوی خۆی بینی، جارێکی تر منداڵەکانی هەتیو کەوتنەوە، چونکە هیچ کات منداڵەکانی هەستیان بە بێ بابی نەدەکرد. هەمیشە دەیگوت: «کاکە تاچاوم لە تۆ بێ، خۆم پێ شاژنە، خوایە مەرگم ڕەپێش مەرگت بکەوێ»

ئاخر تا بەرەی کوردستانی بەچەند تانکەری ئاوەوە گەیشتە شوێنی ڕووداوەکە، خانوو ناو ماڵ و خاڵی یاقووبش کڵوکۆیان دامرد. هەموو خەڵک دەستیان بەخۆیاندا بەردابوونەوە، هەمووی تووشی حەپەسان ببوون، ئێمە گەیشتین بەسەر مەرگی پیاوێکی نوورانی و لەهۆش چوونی دایە خەجێ و گریان و لە خۆدانی کوڕو کچەکانی خاڵی یاقووب و کەوتنی ئەیووب بەسەر دایکیداو فووغانی خاڵۆژنە زیننەت و فاتیمەی کچەخاڵی یاقووبدا، وەک ڕۆژی حەشروابوو، دڵتەزێن و پڕ ئازاربوو، یاقووب حەپەسا، واقی وڕما! وەک کابووسێک هەموو گیانی داگرت وزمانی لە زاریدا گرمۆڵە بوو. بەحاڵ توانی خۆی بگەیەنەتە دایکی و ئەیووبی برای، کەوت و تیلەنیگایەکی دایە خەڵکەکە و تێیگەیشتن دەیەوێ بیگرن و نەهێڵن بکەوێ، خەڵکەکە دەرۆستی ئەو کارەساتە نەهاتن، نەتوانرا بەسەر هەموو ئەو کارەساتەدا زاڵبن، دارا پڕ بە گەرووی هاواری کرد: «تکایە یارمەتی، ئەوانە بگەیەنینە نەخۆشخانە حاڵیان باش نییە!»

مەترسی تەقینەوەی دیکە هەر هەبوو، بەڵام خەڵکەکە بەگشتی نەیانتوانی چیدی خۆیان ڕابگرن لەنێو دووکەڵ و ئاگردا، بەسەر سەلکە بزووت و گرشەو هاڵاوی بەتینی بڵیسەکاندا

خۆیان بۆ ژووری مەلا عوسمان دەکوتا، مخابن، هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو، کەس نەیدەتوانی یەک خولەک لە ژوورەوە بمێنێ، ئەوەی لەو ماڵەدابووبێ بووە بەسووتماک، چی زیرِوحە لەو ئاگرەدا گیانی لە بەردا نەماوە.

تا ئاگرەکە تەواو خامۆش بوو، ئاوێکی زۆر بەسەر ئاگرەکەداکرا، هەندێک شوێن دووکەڵی هەرمابوو، زۆر زەحمەت تەرمی سووتاوی مەلا عوسمان یان دەرهێنا، بۆنی بارووت و بۆن چەقەوێری برژانی لاشەی مەلاعوسمان و بۆن کرِووزی ئەو شتانەی لە موو خووری درووست کرابوون لەگەڵ بۆسۆی جلک و بەرگ تێکەڵی یەکتری بوبوون، بۆنێکی قورس و چەوری یەکجار ناخۆشی لێ دەهات مرۆڤی قرِدەکرد، کۆخەو پشمین و هەناسەتەنگی ورەی خەڵکەکەی دانەبەزاند، بەڵام هەموویان خۆیان پێکەمتەرخەم بوو، لەخۆیان راندەبینی دەرەقەتی ئەو ئاگرە کڵپە سەندووە بێن، هەموویان بە داخەوەبوون کە نەیانتوانی مەلاعوسمان رزگار بکەن. ئەو رۆژە وەک مۆتەکە دڵی دانیشتوانی ئۆردووگای تەنگکردبوو، کەس کونی دەدڵیدا نەبوو، لە هەموو ماڵێک پرسە هەبوو، مردوو شۆرەکە دەیگوت: جگە لە ئیسک و پرووسک و کاسەی سەری مەلا عووسمان هیچی دیکەمان چەنگنەکەوتەوە، مەلای مزگەوت گوتی: « ئەو پیاوە شووشتنی ناوێ، کفنی کەن و نوێژی لە سەر دەکەین و دەیشارینەوە، کەسێک لەو دونیایە بەئاگر بسووتێ، لای پەروەردگار بەخشراوە.»

ئەیوب دۆش دامابوو، بەدیار کۆتەڵی لاشەیەکی سووتاو، خەیاڵی لای دایک و یاقووب، گەورەیی کارەساتەکە و بوونی ئەو هەموو برینانە تەواو هەرەسی پێهێنابوو. پرسەی مەلا عووسمان، قەرەباڵغییەکەی لەوەی دانەبوو، لە شارە دوورەکانیش، دەستە، دەستە دەهاتن، لافیتەی ماتەمینی هەموو حیزبەکان بە دیواری مزگەوتەوە هەڵواسرابوون, مەلا عوسمان کۆنە شیوعی بوو، لای خەڵکی ناوچەکە شیوعی بوونی مەلا عووسمان ببوو بە پرسیار! بەشێک لە ئیسلامیە توندڕەوەکان دەیانگوت: (هەر کەسێک ببێ بە شیوعی دروست نییە دۆستایەتی بکەی، وە تا بۆت بکرێ خۆی لێدوور بگری، خواردنی ماڵی شیوعیەکان دەبێ وەک غەنیمەت بیخۆی.)

بەڵام وەختێک پەرۆشی خەڵک بۆ ئەو کارەساتەی بەسەر ماڵی مەلا عووسمانداهات، ئەو ڕوانینەی ئیسلامییەکانی دوورخستەوە، لە پرسەکەیدا چەندان مەلای خۆبەخش، تا دانی ئێوارە، قوورئانیان دەخوێندوو کەس نەبوو زمانی خراپەی لە مەلا عوسمانی بکوتێ، باس باسی چاکەو دڵخاوێنی و ڕاستگۆیی و خێرۆمەندی مەلا عوسمانی بوو. جگە لەوەی مردنی مەلا عوسمان بەو شێوەیە خەمێکی قووڵ و کارەساتێکبوو زۆر زەحمەت بوو لە زەینی خەڵک دەر بچێ، پەرۆشی بۆ ئەوانەی لەهۆش خۆیان چوو بوون خەڵکەکەی نیگەرانکردبوو، تا چەند ڕۆژیش دوای پرسە، هەر لە نەخۆشخانە بوون. دارا و منداڵەکانی مەلا عوسمان، پێیەکیان لە خەستەخانە بوو، پێیەکیشیان لای میوان و پرسەی بابیان

بوو، ئەوان هیچ ماڵ و حاڵیان نەمابوو، میوانەکان و حاوانەوەیان لە ماڵی دایە خەجێ بوو. ئەیووب چاک ملی دابۆیە بەرێ، خۆشی فاتیحای دەخوێند، هەرچەند زۆر باوەڕیشی بە فاتیحا خوێندن نەبوو، باری شانی زۆر گران ببوو بەڵام چۆکی دانەدا، بۆ بەڕێوە بردنی پرسەی خاڵی، لەو تەنیایی و خەڵوەتەی هەیبوو هاتبۆدەر.

# بەشی بیست و دوو

ئەیووب بۆ یەکەم جاریبوو بەرپرسیاریێتی ماڵ و میوانداری وەربگرێ، هەمیشە یاقووب ئەو ئەرکانەی بە ئەستۆی خۆی گرتبوو. سەرسام بوو بە مشوورخۆری و لە خۆبوردەیی برابچووکە کەی، ئەو لەگەڵ تەمەنی خۆی نەڕۆیشتبوو، وەک پیاوێکی کامڵ، وەک گەورەی خێزان دەر دەکەوت. ئەیووب پشتی لێکردبۆوە خەمی هیچ شتێکی ئەو ماڵەی نەدەخوارد، چی حەواجی ماڵێ هەبا خەمی یاقووب و دایکی بوو، هەمیشە سەرزەنشتی خۆی دەکرد، ئەو ئەرک و ماندووبوونەی ماڵ دەبوو ئەوبا، بەلام جووڵەو بەرپرسایەتی و پەرۆشی یاقووب، بواری نەدەدا کەس ئەو ئەرکە بخاتە ملی خۆی، زیاتر هەستی بە خەمخۆری و گورج و گۆڵییەکانی یاقووب کرد.

ئاخر قەوم و قیلە هەمیشە مێژووی دەردە سەرییەکان دەگێڕنەوە.

ئەیووب و یاقووب، مێژووی دایک و بابی خۆیان دەزانی، بۆیە بەسەر بڵندی لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەنگیان دلێربوو.

ئەیووب دەگەرایەوە بۆ هەموو ئەو دەردەسەرییانەی بەسەر خێزانەکەیاندا هاتووە، ئەو چەند ڕۆژەی پرسەی خاڵی، پەرۆشی و نیگەرانی خەڵک بە گشتی بۆی ببوو بە پرسیار! شەرمەزار نەبوو لە مێژووی خێزانەکەی، حەمدو سەنای دەکردوو سپاسگوزاربوو، لە کۆتایی پرسەکەدا، نەرم و

لەسەرەخۆ بەهەستێکی پڕ حەزینەوە قسەی بۆ دەور و پشتی خۆی کردوو، سوپاسی هەموانی کرد, هێندە جوان پێناسەی خاڵی کرد، کە خاڵی جیاوازی پێنەکردوون لەگەڵ منداڵەکانی خۆی و بی بابییان پێوە دیار نەبووە. جێمان مەهێڵن و نزاو پاڕانەوەش بۆ دایکم و یاقووب بکەن. ئەیوب دەبوو هەندێک جار سەری لە پرسەی ژنانیش دابا، خەمی پێداویستی مشووری پێداویستییەکان بخوا، هەر جارێ خۆی نیشانی خاڵۆژنی دەدا، خاڵۆژنی لە بانگێی دەدا، ڕیحان و فاتیمەش بە چاوی پڕ گریان و ڕشتنی فرمیسکەکانیان ئەیوبیان دەخستە حاڵەتی خەم و گریانەوە، چەند دەیهەویست بەسەر خۆیدا زاڵ بێ نەیدەتوانی، ریحان شەرمی دەکرد هەواڵی یاقووب بپرسێ، بەلام ئەیوب بە دڵێکی پڕو دەنگێکی نووساو، ڕووی لە ژنەکان کردوو گووتی: «تکا دەکەم بەهێزبن، کارەساتەکە گەورەیە، برینەکە قووڵە، ئەوەتە ئەوانیش هەر لە نەخۆشخانەن، لەبەر خوا بپاڕێنەوە بەسەلامەتی بگەڕێنەوە، هەردووکیان حاڵیان باش نییە، تا ئێستا هەر لە ژێر چاودێری دکتۆر دانە.»

ریحان دڵی کەوتە خوورپەو بە نیگەرانییەوە لە ناو خۆیدا دەگریا، گوتی: «ڕێگە دەدەن بچم سەریان لێبدەم، سبەی دوای نیوەڕۆ لەگەڵ دایکم دەچین، من خەریکە دڵم لە لێدان دەکەوێ.»

ئەیوب باوەشی بە خاڵۆژنە زینەتی داکردوو بە گریانەوە گوتی: «پێمخۆشە سەریان لێبدەن، یاقووب کەمێک لە دایکم باشترە، بەلام دکتۆر ڕێگەی نەدا بگەڕێنەوە، چەند جار لە نەخۆشخانە بووراوەتەوە، دارای هاوڕێی دەیگوت، لە

کتێبخانەش پێشئەوەی ئەو کارەساتە ڕووبدات بووراوەتەوە، ڕێگەتان دەدەن.»

ریحان ئاهێکی هاتەوەبەر بە بیستنی ناوی یاقووب کە حاڵی باشترە، بەڵام نیگەرانیەکە کەم نەبوو، ریحان دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی یاقووبی پشتگوێ خستبوو، دەیویست هەر چۆنێک بێ قەرەبووی بکاتەوە و واز لەو یارییە بهێنێ، ئەو یارییە کووشندەیە، دڵنیام ئەو ڕۆژەی ڕووم لێی نەبوو بە دەم و چاویەوە دیاربوو، هەستمکرد ڕەنگی زەردبوو، ڕوومەتەکانی لەبەرچاوم تڵخ ببوون، لەرزین لە تۆنی دەنگیدا هەبوو، گوێم پێنەدا، بەڵام دڵم لای جێهشتبوو، هەموو چرکەیەک بیرم لایبوو، دڵم بەوە خۆشبوو دێت بۆ پێشەنگاکەو ڕەنگ و پەڕە مووچی ڕۆحی من دەبینێ، بەژن و قەدی شیرینی خۆی لە دیوە شاراوەکانی تابلۆکاندا دەناسێتەوە، دڵنیام دەبینێ ئەو باوەڕەی بەیەکەوە کاری بۆ دەکەین، چۆن لە هۆڵی نمایشی پێشەنگاکەدا ڕووناکی دەدا، دەمویست بزانێ عیشقی ئەو چ دونیایەکی خووڵقاندووە، دەمویست بزانێ ئەوە هەر لە خەیاڵی نووسینەوەی ئەودام، هەموو تابلۆکان لە ڕۆحی ئەودا سەما دەکەن و تێکستی ئەو ماچەی لە پایزدا بەخشیم و لە گۆرانی کۆترەکانەوە گوێم لێبوو بیستمەوە.

ئێوارەی ڕوژی پێنج شەممە، ریحان و دایکی دەچوون بۆ نەخۆشخانە، پێش ئەوەی بڕۆن بۆ سەردانی نەخۆشەکان، ریحان ڕاوێژی بەدایکی کرد، گوتی: (دایە مانتۆ شینەکەم لەبەربکەم و قردێلەی شینیش لە پرچم بدەم.) دایکی بەدەم خۆ ئامادەکردنەوە، عەباکەی لەناو جلکەکانی دەرهێناو

لچکەڕەشەکەی توond لە ناوچاوانی بەست و ڕووی لەریحان کرد، گوتی: «پێمباشە مانتۆ ڕەشەکە بپۆشی و بۆ پرچیشت کێشە نییە، خۆت دەزانی کارەساتی سووتانی مەلا عوسمان هێندە بچووک نییە، دەبێ هەوڵ بدەی خەڵک بە چاوێکی دیکە سەیرمان نەکەن، مردنی ئەو پیاوە پرسەی هەموومانە، یەکە خۆشەویستی بابت بوو، برادەری زیندان و گیانی بە گیانی یەکتری بوون، خەڵک عەیبەمان دەڵێن.»

دایکی ڕاستی دەکرد، خەڵکی زارو زمانیان ڕاناوەستێ، ترسی لەوە هەبوو، نەیارەکانیان تۆمەتیشیان بۆ دروست بکەن، هەموو جارێ دایکی ریحان ئەو قسەیەی دەگوتەوە، نابێ پێش داب و نەریتی خەڵک بکەوی، چاوی خەڵکیت دێتە سەر، خۆ ئەو خەڵکەی تۆمەتی نا بەجێیان بۆ هەڵدەبەستن، زۆربەیان ڕاست نین و زارانگاون، بۆیە دەبێ خۆت بپارێزی دەناکەس ناتپارێزێ.

هەموو ئەو ژنانەی لەو سەر دەمەدا، مێردەکانیان سەر و کاریان هەبوو لەگەڵ (الجمعیه التعاونیه الفلاحیه) کراوەتر و قسەزانتربوون، هۆکارەکەش ئەوە بوو کۆڕ و کۆبوونەوەکان لە ماڵەکان دەکران، ئەو سەردەمە کادیرە جوتیارییەکان، هەوڵیان دەدا خێزان و خزم و دەور و بەریشیان لە ژێر چەپۆکی ئاغاو بیری تاریکی دەر بهێنن.

ریحان سەرێکی ڕەزامەندی بۆ دایکی لەقاند، لەوە حاڵی بوو دەبێ چۆن دەور و پشتی خۆی ببینێ، مرڤ ژیرانە هەڵس و کەوت نەکا دەبێتە جێگەی پرسار، ریحان بەڕۆیشتنەوە، ئەو چەند ڕۆژ پەناگیریەی لە یاقووب، هەمووی بۆ دایکی باسکرد،

بە دڵپڕیەوە دەنگی گۆڕابوو، قسەکانی پچڕ پچڕ بوون، بە دەم و چاویەوە دیار بوو نیگەرانی و خەمەقووڵەکانی ریحانی وێرانکردبوو، دڵەکوتە و خەمۆکی نەیدەهێشت بخەوی، ریحان لە شیعرێکی تەواو نەکراو دەچوو، وەک درختێکی بیابان و دەریاچەیەکی وشک و کێڵگەیەکی بێروون وابوو، ئەو لەگەڵ خەتاکانی خۆیدا لە شەڕدابوو، بە دوای ژێر خۆڵکردنی ئەو یارییانەوە بوو کە تێیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئاخرئاگری (عەزاب)ی عیشق بەردەیتە گیانی چیاکانیش دەیکا بە قەرەبرووت، ئەی عیشقی مووسا کێوی تووری نەکرد بەکل؟ ئاخر تین و تاقەتی ڕووناکییەکانی تیشکی ئەوینێکی سووتاو، ناکرێ ناخت هەڵنەوەرێنێ و چی گەڵای ئومێد هەیە نەیخاتە دەم ڕەشەبا، گوتی: «دایە من خەریکە هەڵدەوەرم، گەر نیگاکانی یاقووب نەبێ گەشبوونەوەم لەدەست دەرچووە.»

دایکی سەردەمانێک بەو ئەوینەدا گوزەری کردووە، لە هەست و سووتانی ریحان حاڵی ببوو، دەورانێک بابی ریحان لە تۆغیانی خۆی دابوو، سمێڵ ڕەشێکی قنج و خوشکی خۆی بۆی حەیران دەبوو، نە بخۆی نە بکەی هەر تەماشای بکەی، بەژن زراف و تاقێ کەڵەگەت، دەم و چاوێکی گەنمی، کاتێ جلکە مرادخانییەکەی دەپۆشی، شیرین و لەبەر دڵان، گفت و لفتی خۆش، لە شایی و ڕەشبەڵەکی گوندەکان، سەرچۆپی هەر لە خۆی جوانبوو، کچ و کاڵ و ژنەکانی گوند، کەیفیان بە حەمەڕیحانی دەهات، دەگێڕنەوە بۆنی پشتێندەکەی ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیشت، وەختێک ڕیحانەو گوڵە پایزە مەوسیمیان بوو هەمیشە ژێر پشتێند و گیرفانی کراسەکەی پڕی ڕیحانەو

گوڵە پایزەبوو، دەیانگوت پیاوە بۆنخۆشەکە سەرچۆپی لێ جوانە، بەشێک لە گەنجەکانی گوند ئیرەییان بە حەمە ڕیحان دەبرد، ئاخر کچانی گوندو دەور و بەری گوندەکەی خەونیان بە باوەشی دەبینی، خۆیان بۆ لە گوڵێ دەدا، دایکی، ریحان لەکن دەستە خوشکەکانی خۆی دەیگوت: «کچینە من یاری خۆم گرداوە، حەمەڕیحانی نادەم بەکەس.» حەمەڕیحان دوای گەڕانەوەی لە زیندان، دوای لە دەشتچوونی سەمەدی چەرمووی هاوڕێی نەخۆشییەکی پێوە نووسا، دەم چاوی چرچ و لۆچ بوون، تووکی بەسەریەوە نەما، موو بە برۆکانی وەنەما، برژانگ و ڕیش و سمێڵیشی هەڵوەرین، هەرچی خەڵکی ناوچەکەبوو دەیانگوت: ( هەبێ و نەبێ، دەرمان داویان کردووە، بۆچی ئەو پیاوە جوان و بەژن زراڤە وا پووکایەوە؟)

دایکی چاوێکی لە ریحان کردوو تێیڕاما! پێیگوت: «کچی خۆم پشتیوانت دەبم، تۆ دەبینم جەرگم بە ئازار دەکەوێ، بەڵام هەر لە دایە خۆت بکەوێ، کارێک نەکەین تووشی عەیبە وسەر نەویکردن بین، ڕووداوێک بۆ کچی خۆم دەگێڕمەوە، چەند مانگێک بابی ڕەحمەتیت وەفاتی کردبوو، ڕۆژێک زەماوەندی یەکێک لە دۆستەکانی بابت بوو، نەمدەویست خۆم بگۆڕم و جلکی ڕەنگاو ڕنگ لەبەر بکەم، دەمگوت تا هەتایە ڕەشپۆش دەبم، بە زۆری زۆرداری بەتۆبزی، خزمان و دۆستەکانی بابت، گوتیان دۆستایەتی لەگەڵ مردوو ناگیرێ، دەستە جلکێکی ڕەنگاو ڕەنگیان بۆ هیانم، تا جلکەکانم پۆشین ئاو لەچاوەکانم بڕا، ناخم هەمووی هەڵتەکی. لەو زەماوەندە، کێ

دۆستی بابت بوو، لە وێ بوون، دایە خەجێ بەدیتنی من ڕەنگی پەڕی، وامهەستکرد زۆر نیگەرانە، نزیکببوومەوە لێی گوتی: (هەی لەمنت نەکەوێ، هیچ کات ئاوام تۆ نە نا سیوە، خێرە بۆ کێ وات خۆ تاس و لووس کردووە

ڕاستی دەکرد، وەک دەڵێن کفنی بابت زەرد نەببوو، دەرکەوتنم بەو شێوەیە بۆ کەسە دڵسۆزەکانم جێگەی نیگەرانی و گومان بوو، بۆئەوەی خەڵک بە چاوی گومان سەیرمان نەکەن، جلکێکی ئاسایی لەبەر بکە. ڕۆڵە گیان ئامۆژگارییەکانی دایە خەجێ، وەک نەخشی سەر بەردن، وەک ئەڵقیەک لەگوێم کرد، عومرم بەو عەیامە گەیشتوو بی ئەو دەستم دەئاوێ نەناوە، گوێ ڕایێلی بووم، نایشارمەوە ئەو کارەساتەی سووتانی مەلا عوسمان و لە هۆشچوونی خێزانەکەیان ئەو حاڵەی یاقووب تەزاندوومی، ڕەنگە بۆ هەتاهەتایە لە بیرم نەچێتەوە.»

ریحان لە خەیاڵی خۆیدا، هەموو ئەو قسانەی بۆ پێشانگاکەی ئامادە کردبوون چۆن پێشوازی لە میوانەکانی بکا، چۆن بە پیر یاقووب و هاوڕێکانیەوە بچێ، دەستی لە ئەژنۆی خۆی دەدا حەیف! بۆچی بۆ بەختی من و سارێژبوونی هەستە برینداریەکانی یاقووب ئەو ڕووداوە ناخۆشانە دێنە پێش، ئاخر نەمن دەتوانم ئەوەندە هێوربیم و نەیاقبوویش بەرگەی ئەو هەموو عەزابە دەگرێ، من دەمەویست کارێک بکەم لەڕێی تابلۆکانمەوە سووتان و ئەوینی خۆم بنووسمەوە، دەمویست بڵێم: هەناسەکەم، ئەوە منم ساتەکانم کۆ دەکەمەوە دەیانکەم بە قەسیدەیەکی نەنووسراو، دەیانکەم بە ئاوێزەو بەسەر ڕەنگی تابلۆکاندا دەیڕژێنم، دواجار لە ئاوێنەیەکی ڕووندا

دەینەخشێنم و وێنەی دڵی تۆ دەکێشم، ئاخر خۆ من شەوانە بەدەست پەڕە مووچ و ڕەنگەکانەوە گۆرانی بۆ تۆ دەڵێم، چاوم دەبڕمە سەر میلی کاتژمێرەکەم و پێی دەڵێم هەڵەشە مەبە، هێشتا نەمتوانیوە خودا لە خۆم ڕازی بکەم، خودا ڕوومەتی یاقووب جێناهێڵێ، خودا سرووشی ڕەنگەکانی داوەتە دەستم و ئایەتێکی داوە بە پەنجەکانم، هەستی کردووم بەکانی، هیوا لە هزرمدا هەڵدەقولێ، ئەو پێم دەڵێ: شیرینترین تابلۆ چاوەکانی ئەون، پێم دەڵێ: کۆلکەزێڕینە بخەرە دەسەسڕەیەک و بە بۆنی مێخەک بیڕشێنەو وەک نووشتەیەک بیدە لە شانی یاقووب، خودا کتێبەکانی خۆی داوە بە ڕۆحم، وەک ئاوی حەیات سەراپا لەشی تابلۆکانی پێدەشۆم، بە هەناسەی پایزدا دەینێرمەوە بۆ باخچەکان، لە شیعرێکدا چی جوانی یار هەیە دەیهۆنمەوە.

ریحان دەیویست وەک بووکی یەکشەوە سەر لەسوێی نەخۆشەکان بنێ، بچێ و دەستی یاقووب بگرێ و پێی بڵێ: «ئەوە من بووم، وەک تیراوەیەک ئەوینم دەردەدار کرد و پشتی ئومێدەکانم شکاند، چەمی خەیاڵەکانم بۆگەن کرد، خۆری نیگاکانم ڕاونا، هاتووم لانەکەم وێرانبووە و لە سووچێکی دڵی خۆتدا جێم بکەوە، دەزانم ئەو عەزاب و کەوتن و شکانی تۆ، نەبوونی پلانێکی ژیرانە بوو، بمبوورە هەناسەکەم خۆشم دەوێی.»

# بەشی بیست و سێ

ریحان و دایکی، چوون بۆ گەراج تەنا جێبێکی لێ بوو، سوار بوون، سەیارەکە جێبێکی کەچە و هەڵوەشاو بوو، تەقە و ڕەقەی زۆر بوو، دەنگی تەسجیلەکەشی هێندە زۆر بوو کەس گوێی لەکەس نەبوو، گۆرانییەکە،

گۆرانیەکی شادبوو، ریحان دوو جار نقورچی لەرانی دایکی گرت تا ئاگاداری شوفێرەکە بکا دەنگی تەسجیلەکە زۆرە، ریحانی حاڵی کرد، گرفتێکی گەورە نییە، ددان بە خۆتدا بگرە، سەرنشینەکان هەندیکیان حەزییان بەو گۆرانییە دەهات، یەکێکیان لە پێشەوە سواربیوو دەستی بۆ دووگمەی تەسجیلەکە برد، دەنگی زیاتر کرد، چوار موکەبەرەی تێدابوو، پیاوێکی بە تەمەن، لەناوەڕاسێ سوار ببوو دەنگی بەرز کردەوە گوتی: « ئەرێ کاکە کەمێک دەنگی تەسجیلەکە کەم بکە خەریک خۆم لە جامەکە فرێ دەمە خوارەوە، خۆ بزنت سوار نەکردوون.»

شوفێرەکە لە ئاوێنەی جێبەکە سەیری پیاوەکەی کرد، بە خۆیدا شکایەوە، هەستی بە شەرمەزاری کرد، تەسجیلەکەی کوژاندەوە، وەک ئاوێکی بە ئاگری دابکەی هەمووی قەرەقووپ دانیشتن و بێدەنگ، پیاوە بە تەمەنەکە، بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: «بزانن چەند خۆشە، کاکی شوفێر

توخوا لێم نیگەران مەبە، خۆت دەزانی تەمەنی ئێمە مانان چۆتە سەر و بێ تەحەمول بووین.»

دەنگە دەنگ دروستبوو، هەریەکەو لەبەر خۆیەوە قسەیەکی فڕێ دەدا. شوفێرەکە گوتی: «نا مامە گیان، بڕوات بێ خۆم هەر حەزم لە دەنگی بڵێند نییە، بەتایبەت ئەو گۆرانیانەش، گەر تەنیام دوو کاسێتم لایە، مەزهەری خالەقی، تەنها خالەقی پێدەکەم، ئەو کاسێتە هی گەنجێک بوو جێماوە، دەڵێم بەڵکو بە ڕێکەوت بیدۆزمەوە بیدەمەوە دەستخۆی، من خەجاڵەتی هەمووتانم.»

ریحان و دایکی، بە بیستنی ناوی خالەقی، تیلە چاویان دایە یەکتر، هەمیشە تەسجیلەکەی ماڵەوەیان، کاسێتێکی خالەقی لە سەر بوو، یاقووب بۆ ریحانی کردبووە دیاری، ئەو کاتانەی ریحان تەنیا دەبوو لە ماڵەوە، تەسجیلەکەی پێدەکرد و لەگەڵ خالەقی دەیگوتەوە. گەیشتنە ناو شارو پیاوە پیرەکە هەستێکی جوان و خاوەن ماریفەتێکی بەرز بوو، ئامبازی شوفێرەکە بوو دەستی لە مل کرد و باوەشی پێداکرد، گوتی: «لە مامی خۆت توورە مەبە، هەر لەبەر خۆم نەبوو کەسانیدیکەش بەو دەنگە بەرزە نیگەرانبوون، ئەوە پیشەی خۆمە زۆر خۆم لەشتی لاوەکی هەڵدەقورتێنم، دەمەوێ لە جیاتی خەڵکی دیکەش قسە بکەم، ڕەنگە خەسڵەتێکی باش نەبێ، بەڵام دڵنیام گەنجەکان ڕێز لە کەسی بەساڵاچوو دەگرن، جەواب دەنگی ناکەن، گەردنم ئازاد بکە.»

ئەو ڕووداوانەی دێنە پێش، ڕێکەوتێکی جوانن، هاوکاری باشن بۆ بەردەوامی، بەشێک لەو ڕووداوانە ڕێگەت بۆ والا

دەکەن، دەتبەنەوە سەر زەینی ئەدگار و ئەو کارانەی ڕۆژانە بەشداربوون لە مێژووی تۆدا، هەر وێناکردنێک، ساتە ونبووەکان و کەوتنی ئەو قسانەت بیر دەخاتەوە، چیرۆکەکان دێنەوە قسەی خۆیان دەکەن، تایبەتمەندی شوفێری جێبەکە، جیاوازتر بوو لەو کارەکتەرەی خوێنەر چاوەڕوانی دەکرد، بەشەرمەزارییەوە ڕووی لەریحان و دایکی کرد، گوتی: «بمبەخشن ئێوەشم نیگەران کرد»

ڕاستییەکەی من ناتوانم چیرۆکەکە بە نیوەچڵی جێبهێڵم و یان بمەوێ کارەکتەرەکان تووشی نائومێدی بکەم، هێشتا یاقووب گەنجەو دەیان خۆزگەو بریای هەیە،

ریحان بەدیار ڕەنگ و پەڕە مووچەکەیەوە هەزاران تابلۆی دڵخوازەکەی کێشاوە و شکاندوونی و نەیتوانیوە، گوزارشت لە سووتانی دڵی خۆی بکات، چەندان جار برژانگ و برۆکانی کێشاون و سکێچی ئاماژەکانی لێبڵاو بوون، ئەو خالقەی هێڵکاری و ڕەنگەکانی خستوونەتە پەنایەک، دەیەوێ دەنگەکان بەیەکتری بناسێنێ، لە شێوەی گۆرانی جیهانێک بخووڵقێنێ، دەیەوێ ڕۆمانەکە بەردەوامی پێبدا, پاڵەوانی رۆمانەکەم خۆشدەوێ، گەر نەتوانم ریحانی لێ نزیک بخەمەوە خالقێکی شکەست و سەر لێشێواوم، ئەرکی ئەو خالقە ئاگا لێبوونیەتی لە ڕوانین و تێگەیشتنەکان ژنێکی چاوشین و پێستێکی سپی و شێوە پەری نیشانی یاقووب داوە، بە پەنجە ڕوونەکانی و بسکی ئاڵۆسکاوی و ڕۆحێکی شیرینەوە، ناو چاوانی یاقووبی سارێژ دەکرد. ناکرێ ڕەونەقی مەلەک ئەو ناوە ڕۆشەن نەکا،

ئەو خالقە، شەیتانی خستۆتە ناو لەشی یاقووب، بە ئیشتیاوە مەلەک دەخاتە ناو دڵی خۆیەوە، من یاقووبی لە بەر خاتری تەواو بوونی ڕووداوەکە کۆتایی پێناهێنم، یاقووب هێشتا لەهەموو ناڕەحەتییەکانیدا بابی خۆی دەبینێ و بە پێی ڕێنماییەکانی بابی کار دەکاو عیشق دەکا، لە ڕۆحی بابی مووتوربە کراوە، وەجاخ و ڕیشەی ئەوینێکی خاوینی هەڵگرتووە.

ئەو چیرۆکانە خەون نین و خەیاڵی شاعیرێک نینە بتوانی دەستکاری مۆسیقا و وێناکانی بکەی. حەمە ڕیحان، گەر باسی زیندان دەگێڕێتەوە، لە شوێنی خۆتەوە دەترسی مووچڕک بە جەستەت دادێ، کتێبێکم خوێندەوە، لە زمانی حەمە ڕێحانەوە، دەڵێ: (ساڵێکی ڕەبەق، دەست و پێم، بە زنجیری ئاسن بەسترابوونەوە، بێ پێخەف لە سەر زەوی دەخەوتم، زەویەکی شێدار، قالۆچەو جرو جانەوەر، مشک و دەیان دەعبای سەیر جەستەمیان ڕزاندبوو، نەمان دەتوانی لەسەر چیچکان دابنیشین، ئەو کاتانەی وەک لە هۆش چوونێک لە هۆش خۆمان دەچووین، کە بە هۆش خۆمان دەهاتینەوە، وەک شێتان ڕادەچڵەکین و خوێن لە دەست و پەنجەکانمان دەچۆڕان، بەسەر دەمدا بەر دەبووینەوە، پاسەوانەکان بە شەللاقەکانیانەوە بە ژووری زیندان دەکەوتن و ئازای بەندەنیان ڕەش و شین دەکردین و هەزاران جار دایک و بابیان دەگاین!) ناکرێ و نابی ڕۆڵی حەمە ڕیحان فەرامۆش بکرێ!

ریحان و دایکی نزیکی نەخۆشخانەکەبوون، بەردەمی نەخۆشخانە، بە ئاپۆرای خەڵک تەنرابوو، بەشی زۆری بۆ سەردانی نەخۆش هاتبوون، پاسەوانی بەردەم نەخۆشخانەکە، خەڵکەکەی بە پاڵ دەخستنە دەرەوە، هەزار جنێو بە پوولێک بوو، کەس ئاگای لەکەس نەبوو، خەڵکەکە توورە و نیگەران بوون، یەکێک لە دوورەوە دەیشیراند، دەیگوت: (لێیان راپەرن خۆ ئەوانە لە بەعس ئازاتر نین، با بە مەرەد پیاوەکانی بەعسیان ببەین)

پاسەوانەکە، بانگی پاسەوانەکانی ژوورەکەی کردوو گوتی: «وەرن ئەو سەگبابەی بگرن ئەوە تابووری پێنجەمە، دەیەوێ پشێوی و ئاڵۆزی درووست بکا.»

ڕووی لە خەڵکەکەش کرد: «برەک لە سەرەخۆ بن، بەسەرە هەمووتان دەکەینە ژوور.»

هەندێک قسەی منەتبار و خۆ هەڵکێشانی کرد و خەڵکەکە هێوربۆوە، ریحان بە ڕێزەوە ڕووی لە پاسەوانەکە کرد، تێیگەیاند ئێمە هاتووین سەردانی نەخۆشەکانمان بکەین، ئێمە کەس و کاری ئەو پیاوەین ئاگر لە ماڵەکەی بەربوو خۆیشی سووتا کلۆکۆی دامرد. پاسەوانەکە، ئەو هەواڵەی بیستبوو ڕۆژنامەش بڵاوی کردبۆوە، یاقووبیشی دەناسی و گوتی: «دەزانم، یاقووب لە نزیکەوە دەناسم، کەمێک هاوکاریم بکەن، هێواش بن، هەموان ئیزن دەدەم، ئەو کارەساتە بۆ هەموومان ناخۆش بوو.»

ریحان بە ناوی یاقووب شاگەشکە دەبوو، ئەوەندەی نەمابوو، دەنگی بڵیند بکا بڵێ یاقووب دڵخوازی خۆمە، لە چاوانی ڕا دەخوێندرایەوە کە چەندە پەشیمانە، ئەو هەموو عەزابەی یاقووبی داوە، ئێستا حاڵی دەبێ کە زیانی بەو خۆشەویستیە گەیاندووە، وەک تابلۆکێشێک و هونەرمەندێکی لاو، سەری لەسەر کتێبەکان بوو، هەناسەیەک بوو بۆ ئەو، ئەگەر بیەوێ پەڕەمووچی دەستی لاربکاتەوە ڕەنگەکان بە دیوێکیدا نمایش دەبن، ئاراستەی هزراندن و ئاسۆکان مەرامەکان ئاڵۆز دەکەن. چەند جار پرسیار خۆی بۆ لە گەرووی هەڵداویشت، بە پاسەوانەکە بڵێ: (چۆن یاقووبی من دەناسی، ئایە لە باوەڕ و بیرکردنەوەشدا وەک یەکن؟)

دایکی هەستی بە دڵەڕاوکێ و شڵەژانی کردبوو، ڕووی تێکردوو گوتی: «کچم باش نایەیتە بەرچاوم، گەر شتێک بووە با بزانم، کەسێک قسەیەکی ناخۆشی پێنەگوتووی؟»

بەو پرسیارەی دایکی ڕاما، چاوێکی لە پێش خۆی کرد، دەستێکی بە پرچی داهێناو گوتی: «حاڵەتێکی ناخۆشم تووشبوو، هیچ نییە تێدەپەڕێ، ئەو پیاوە یاقووب دەناسێ، پێدەچێ وەک ئێمە بیربکاتەوە، خەریکبوو زۆر سادە و خۆماڵیانە قسەی دڵی خۆمی لا باس بکەم.»

دایکی بە چاوێکی پڕ پرسارەوە، لێی ڕاما، پێیگوت: «هەروا ئاسان بەو وەختە کەمەوە دەتویست چی لە دڵت دایە، لای کەسێکی باس بکەی نە دیو و نەناس، خراپ خەریکە تێکبچی، تا زیاتر هەڵگری پەیامی شاراوەی ناو هەستەکانت بی، سەنگین و ئاسوودەتر دەبی.»

بەو قسانەی دایکی بە خۆی داشکایەوە، بیری لە و حاڵەی خۆیکردەوە، گەر بەردەوامبێ ڕەنگە ببێت بە خوویەکی خراپ و تووشی بێ بە تووشی نەخۆشییەکی دەروونی، کەمێک باروو دۆخی نەخۆشخانە هێور بۆوە، پاسەوانەکە، یەک، یەک، خەڵکەکەی دەخستنە ژوورەوە، چوونە ژوورو، پرسیاریانکرد، یاقووب و دایە خەجێیان دۆزیەوە، حاڵی باش نەبوو، یاقووب باشتر بوو، وەختێک چاوی بە ریحان کەوت، وەک فیلمێک تەواوی یادەوەرییەکانی هاتەوەیاد، ئەو بەو ئازارە ڕازیبوو، بەو شەڕە هەستی ئەوینی بەهێزتر و درەوشاوەتر بوو، بەڵام ئازارەکان بەیەکەوە هاتن، ورووژمی ئەو بەسەردادانە، لە تاقەو قەوامی ژیانی یاقووب بەهێزتربوون، خەم و خۆ دوورخسنەوەی ڕیحان، ڕژان و هەستی خرۆشاوی مەلەک و ڕۆیشتنی ئەو پیاوە بە بێدەنگی و خەمی خێزانە نەخۆشەکەی، برین و لە دەستچوونی دکتۆر و سووتانی ماڵی خاڵی و مردنی خاڵی تاقەت پڕووکێنن، ئەو ڕووداوانە ئاسان نین، یاقووب ئەو خۆ ڕاگرییەی، سەرچاوەکەی سرووشی لە چاوی عیشقەوەیە، لەبیر و باوەڕەکەیەتی، لێ وەختێک دڵخوازەکەی دێ دڵی لە سەر یاقووب لابیا، گەر وەک شانۆگەرییەکیش بێ بۆ یاقووب دەردێکی کووشەندەیە.

نەخۆشخانە یەکی دی نەدەبرد، پێشتر هەموو ئەوانەی مۆڵەتیان وەرگرتبوو سەردانی نەخۆشەکانیان بکەن نابێ لە چەند خولەکێک زیاتر بمێننەوە، پاسەوانەکان، یەک یەک ژوورەکان دەگەڕان، بوو بە غەڵبە غەڵب و هات و هاوار، زۆر لەوانەی بۆ سەردان هاتبوون بە تۆبزی و بە پاڵ دەیانخستنە

دەرەوە، دەبوو بە غەڵبەغەڵب و شەڕە قسە ناچار پاسەوانەکان دەنگیان بڵند دەکرد، نۆرە گەیشتە ئەو ژوورەی یاقووب و دایکی لێخەوتبوون، ئەو پاسەوانەی لە دەرەوە خەڵکەکەی دخستە ژوورەوە، وەک تەواوی ئەو خەڵکە سەردانی یاقووب و دایکی کرد، ئاماژەیەکی دا بە یاقووب و گوتی: «هاوڕێم بەجێت دێڵم، با ئەوانەش کە هاتوون بۆلات بڕۆن دوای کەمێکی دیکە دکتۆر دێ، هەر کارێکت هەبوو هەر.»

حاڵەتێکی ئۆخژنی و دڵنەوایی بۆ یاقووب درووست ببوو، نەیدەویست وا زوو بڕۆن و جێی بهێڵن، ئەو تازە خەریکبوو برینەکانی قەتماغەیان دەگرت، بەدیار هاتنی ئەو ترووسکەیەوەبوو، لەو سەردانەدا ئاوێتەی تابلۆکان و هاتنەوەی نووسینەکانی دەفتەری یادگارییەکان بوو، هەموو خەیاڵەکانی کۆ دەکردنەوە، شکان و ئازەرەکانی دەخستنە ناو پرێسکەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ، ئەو بە گریانێکی خۆیدا لە بەیانییەکی تەڵخدا ناردنی بۆ پێشانگاکە، دەیویست خەیاڵی مەکۆ بکات، لە ڕیزی تابلۆکانی ڕیحاندا دیوارەکە بلەرزێنێ، دەیویست شانی ئەو کێوە نەوی بکا کە هەنگاوەکانی شل کردوون، ئاخر زەمەن چەند دەتوانێ ئەو کۆڵە دانەنێت و تا دەگاتە لووتکە! دەفتەری پێشانگاکە، ئەو ڕستەو وشانەی بۆ دەگێڕایەوە، نیگاو شرۆڤەکانی خۆری بۆ دەگێڕایەوە، یاقووب وایمەزەندە کردبوو، هەموان دەردی دڵی ئەو بۆ ڕیحان دەنووسن، تابلۆکانیش ئاماژەی دەدەنێ هەتاوی خەونەکانت لێڵ مەکە. یاقووب بە نیگەرانییەوە گوتی: «نەدەکرا

کەمێکیدیکەش مابانەوە؟» پاسەوانەکەی هاوڕێی یاقووب تێچاوێکی دایە یاقووب و گوتی: « ئەمڕۆ با بەسبێ، ڕۆژێکیدی قەرەبووی دەکەینەوە، با بڕۆین کاتی سەردانی نەخۆش وا تەواو دەبێ.»

ریحان و دایکی نزیکی نەخۆشەکە بوونەوە، دایە خەجێ بە بینینی ئەوان، فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتەخوار، ئەوانەی لە ژوورەکە بوون، بەو حاڵەتەی دایکی ڕیحان و دایکی یاقووب نیگەران و دڵتەنگبوون.

## بەشی بیست و چوار

یاقووب کەوتەوە ئەو حاڵەتەی کە خەریکە بکەوێ، خەریکە دەست و پێی لێکگرێدەدرێن، نا ئومێد دەبێ، وەک پێشووتریش ڕووی وەرگێڕا، گوێی زرینگانەوە، هەر هێندە پێڕاگەیشت سپاسی پاسەوانە ناسراوەکەی بکا، دەم و چاوی سوور هەڵگەڕان، لەبەر خۆیەوە کەوتە قسە کردن.

بابە گیان، ئەو چەند ڕۆژە جێتنەهێشتووم، گەر دەستی تۆ نەبا ئەو شکانە وێرانی دەکردم، ئەوەتا بە هێزی دەستەکانی تۆ بە پێوەم، ئاگام لێیە چۆن هەڵسووڕ و داسووڕ بە دایکم دەکەیت، ناهێڵێ جێمبهێڵێ، ئاخر خۆ دایکم زەحمەتە بەرگەی کۆچی تاقە براکەی بگرێ، ئەوە تۆی خۆت خستۆتە ژێر شانەکانی و ناهێڵی بکەوێ، تۆ هێشتا ئەو جەنگە جێناهێڵی، هێشتا دەتەوێ ڕێنمایی و دڵنەوایمان بی، ڕاستە وەختی ئەوەی نەبوو تۆ برۆیت و نەتبینینەوە، خۆ دایکم هەر دەڵێ: «بابی ئێوە نەمردووە هاکا ڕۆژێک بە ژوورکەوت و بە لاوک و حەیرانەوە، بە سەربڵندی و پێکەنینەوە، بە شایی و لۆغانەوە باوەشمان پێدادەکا و لە کۆڵ گریان و دڵەڕاوکێمان دەکاتەوە.»

دەزانم دەگەڕێیتەوە بۆیە ناکەوم.

یاقووب کە دەکەوتە ئەو حاڵەتەوە، تەنها چەند فرمێسکێکی ئۆخژنی دەڕشت، بە دەنگێکی نەرم دەپەیڤی. هەمووی چەند

ڕۆژێکە مەلا عوسمانی خالّی بە ئاگری ماڵەکەی سووتا، برینێکە تا بڵێی قووڵە، نەک هەر بۆ یاقووب، تەواوی دەوروبەر تووشی شۆک ببوون، بەڵام دەستپێکردنی خەم و زامداربوونی یاقووب، لە پشتگوێخستن و ساردی ریحان سەری هەڵدا، سەردانی ریحان لەو ساتە هەستیارەدا، لە وەختێکی گونجاودا، خەریکە گریّ و کۆسپەکان لادەبا، ژیان ئەو مەملەکەتەی خستبۆوە پەراوێزەوە، دەرکەوتنی خۆرێکی نویّ، ئەو دەنگە کپ و نووساوانە جۆش دەداتەوە، خانە نووستووەکان خەبەر دەکاتەوە، چەندجار ئەوین بریندارییّ بە سەمایەکی نەرمی هەتاو ساڕێژدەبیّ، برینەکان وەک تیکی سەربانەکان بە ڕێژنە بارانێکی زۆر پڕ دەبنەوە. لەگەڵ دایکی ڕۆیشت و نیگایەکی دایە یاقووب، لە گەرمەی کەڵەکەبووی ئازار و خەمی قووڵ و دڕدۆنگیدا چاوێکی داگرت، ڕەنگی برین لێنیشتووی یاقووب، ڕوومەتەکانی سوور بوون، ڕەونەقی درەوشانەوەکەی دەبیندرا، ئەو وەک سێبووری و ڕووناهی دەڕژایە ناو ڕۆحی یاقووب.

ئەوان ڕۆیشتن بەڵام زۆر شت جێما، هاتنی بە مۆرکردنی پەیامێکی دڵنشین، چاوێکی پڕ لە دڵنەوایی، سپاردنی ئۆخەیەکی ئاسوودەیی، لە بەر. دەرگای نەخۆشخانە، پاسەوانەکان سەرقاڵی ئۆتۆمۆبیلێک بوون، بە خێرای دەرگای نەخۆشخانە خرایە سەرپشت، بە پەلە کارمەندەکانی فریاکەوتن بەڕاکردن هاتن بۆ حەوشەی نەخۆشخانە، خێرا ژنێکی بە ساڵاچوویان خستە سەر(نەقالە) تەنها کچێک لەگەڵ شۆفێرەکە هاوکاری ژنە بەساڵاچووەکە بوون، یاقووب لای

دایکی بوو، وەختێ گوێی لە دەنگە دەنگەکە بوو، چاوی لە هاتووچۆی خەڵکەکەبوو، ترسی ڕێنیشت نەبادا شتێکی نەخوازراو ڕوویدابێ، ئەوان ئێستا ڕۆیشتن، هەر لە وەختی ڕۆیشتنی ریحان و دایکیدا ئەو حاڵەتە ڕوویدا، ئیزنی لە دایکی وەرگرت، دایکی هۆشی هەبوو ئەیوبیش لەو کاتەدا گەیشت، بینی یاقووب ئاچووغ و سەر هەستره دڵی خۆش بوو، دایکی و یاقووب بە بینینی ئەیوب شاگەشکەبوون بەڵام یاقووب دڵی هەر لای ریحان بوو لەوە دەترسا ئەو حاڵەتەی لە حەوشەی نەخۆشخانەکە هاتۆتەپێش پەیوەندی بەوانەوەبێ، یارمەتی لە ئەیوب وەرگرت چاوێکت لە دایکم بێ دەچم بزانم چی ڕوویداوە، ئەیوب بەو جووڵە و بەرپرسیاریەتیەی یاقووب کەیفخۆشبوو.

کێ لەگەڵ ئەو نەخۆشەیە؟ شوفێرەکە گوتی: «کچەکەی لە گەڵییەتی» شوفێرەکە گوتی: «وەرە خاتوو مەلەک بزانە پزیشک چیدەڵێ سەبارەت بە حاڵی دایکت.»

یاقووب گوێی لەناوی مەلەک بوو، هەموو گیانی وەسەر ئارەقە گەڕا، شەرم دایگرت، نابێ بگەڕێتەوە، ناگەڕێتەوە مەلەک بە هەموو یادگارییەکانییەوە دێتە بەردەمی، ئەو ئێستا لەگەڵ ڕۆحی خۆی بەڵێنی داوە ژیان بداتەوە بەرخۆی، ورووژان و ئەو هەست و سۆزەی لە مێشکێکی هەرزەییدا خرۆشابوو تراویلکەیەکی بۆمن دروستکرد، دەی ئەوە یاسای سرووشتە دەبێ ئامانجی خۆی بپێکێ، بیرمە مەلەک گوتی: «کە گەڕایتەوە وەڵامی پرسیارەکەت دەدەمەوە.»

ئەوە دەزانم ژیان بەدوامدا دەگەڕێ، ڕەنگە بەو هەموو کێشە پڕئازارانە دەرەقەتی شەڕی ژیان نەیەم، بەڵام دەزانم گەر ئەوە مەلەک بێ و دایکی بێ، هیچ گومانی تێدا نییە پێویستی بە من دەبێ، ڕەنگە ئەو حاڵەتەی خێزانەکەمانی زانیبێ، چۆن نەیزانیوە بۆ کەس هەیە بەو کارەساتەی نەزانیبێ، ڕۆژنامەش هەواڵەکەی بڵاوکردۆتەوە. یاقووب نزیکتربوو، مەلەک قۆڵەکانی هەڵکردبوون، بە تیشێرتێکی ڕەنگ گەنمی، پانتۆڵێکی پیاوانە، پرچەکانی لە دواوە گرێدابوو هۆڵی فریاکەوتن شەوقی دەدا، ڕیک چاوی لە چاوی یاقووب هەڵەنگوت، بە بەر چاوی هەموانەوە دەیویست باوەش بە یاقووب دابکات، یاقووب بە بینینی تووشی حاڵەتێکی ناخۆش بوو، سۆزو دڵسۆزی بۆ هاوڕێیەتی مەلەک لە کوڵبوو، گریا، فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتەخوار، مەلەک گوتی: «بمبوورە لەو ڕۆژەی تۆ ڕۆیشتی، جێتهێشتین، دایکم حاڵی باش نییە، ئەو ڕووداوەی ئێوەشم بیست، هەواڵەکەم لە ڕۆژنامە خوێندەوە، نەمتوانی دایکم جێبهێڵم، زانیویشمە لێرە لەگەڵ دایکت خەوتوون، حاڵی هەردووکتان باش نەبووە، ئێستا دایکت چۆنە؟»

بە لای یاقووبەوە سەیر نەبوو چۆن مەلەک ئاگای لە هەموو شتێکە، گوتی: «خەریکە بەرەو باشی دەچین، بەڵام دایکم هێشتا هەواڵی مردنی براکەی نازانێ، گەر بزانێ دڵنیام بۆ هەتا هەتایە دەڕوات و جێمان دێڵێ، ئەی حاڵی دایکی تۆ چۆنە؟»

» باش نییە، دایکم دەمرێ، ئیدی من تەنیا دەمێنمەوە، نازانم ڕاپۆرتی پزیشکی ئەمڕۆش چیم پێدەڵێ.»

یاقووب بە وشەی مردن دڵی گوشرا ڕەنگێکی هێناو ڕەنگێکی برد، ئەو هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە دایکی بمرێ ژیان چ مانایەکی نامێنێ، نابێ دایکم بمرێ. مەلەک بە بینینی فرمێسکەکانی یاقووب دڵەکوتەی گرت و دەستێکی بە پەنجەرەکەوەگرت، خۆی بەهێزکرد نەکەوێ، ئەو عومرێکە لەو گێژاوەدایە، کەوتنی واتا تەواوبوونی، واتا دەستبەردانی لە ئومێدەکانی، ئەو پەرۆشییەکانی قووڵ و نەبڕاوەن، بەڵام ئومێدەکانیشی بڵندن، لای مەلەک مردن بابەتێکی سرووشتییە، دەبێ مرۆڤ خۆی لەگەڵ ڕابێنێ، تەنیایش ڕاهاتنە، هیچ شتێک نییە لەسەرەتاوە ئەستەم نەبێ بەڵام کاتێک ڕژایتە ناو قووڵاییکەی دەریچەیەک دەدۆزیتەوە بۆ دەربازبوون. نیگای دیوارەکانیش لەسەر ئاخاوتن و جووڵە و ئەتەکێتی مەلەک بوون، نەرم و هێواش سەرنجی دەور و بەری ڕاکێشا، وەک کادیرێکی پرۆفە پێکراو. یاقووب هەستی ڕاگرت تا مەلەک لە قسەکانی تەواو بوو. گوتی: «دەمەوێ دایکت ببینم، با لەسەر دڵم نەبێ بەگرێ.»

بە چاو ئاماژەیەکی بۆ کردو فەرموو دایکم وا لە هاڵی فریاکەوتنە، هاڵەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، چەند حاڵەتی بریندار‌بوون و پێکدادانی ئۆتۆمبیل و نەخۆشی جۆراو جۆری تێدابوو، نزیکی قەرەوێڵەکەی دایکی مەلەک بوو، بینی حاڵی خراپەو ئۆکسجینی لەسەرە، بەحاڵ چاوەکان دەجووڵان، هێشتا ئەو خۆڕاگرییەی لێدەخوێندرایەوە، چووە لای و سەری ماچکرد، گوتی: «دایە دەمناسیتەوە؟»

گوێکانی باش بوون دەنگەکەی لا غەریب نەبوو، سەری بۆ لەقاند و حاڵیکرد کە دەیناسێ، یاقووب بە شەرمەوە فرمێسکەکانی لەسەر چاوی لابردن، ویستی مەلەک و دەور و بەری هەستی پێنەکەن. مەلەک لەوە گەیشت کەسایەتی یاقووب، دەرهاویشتەی خانەوادەیەکی زەحمەتکێش و چەوساوەن، خەریکبوو بەرگەی سۆزی خرۆشاوی یاقووب نەگرێ، بە هەڵسوکەوتێکی زیرەکانە دەستێکی لە پشتی دا گوتی: «سپاس بۆ هەستی دڵسۆزیتان، ئەو چەند ڕۆژە دایکم تەنانەت چاویشی هەڵنەهێناوە، بە بیستنی دەنگی ئێوە، بینیم چاوەکانی کردنەوە، ئاخر ئەوە بۆ سێبووری من یەکجار بەنرخە، بچۆوە بۆ لای دایکت با ئەوانیش نیگەران نەبن، ئاگامان لەیەک دەبێ.»

حاڵی هەموو نەخۆشەکانی خەستەخانە خراپ بوون، داو و دەرمان کەم بوو، تەنها چەند ناونیشانێکی داو و دەرمان هەبوون لە خەستەخانە، دەبوو چووبایت لەدەرەوە بە دەستیان بهێنی، بۆ ئەوانەی دەستکورت بوون زەحمەت بوو. یاقووب سەرەڕای ئەوەی ئەو هەموو کارەساتە ڕووی تێکردبووە، دەبوو خەمی پەیداکردنی داو و دەرمانیشی خواردبا، دارای هاوڕێی حاڵی لەو باشتر نەبوو بەڵام ئەو وەک برایەک مشوری هەموو پێداویستییەکانی دەخوارد،

کە لای دایکی مەلەک ڕۆیشت و چۆە لای دایکی، دارای هاوڕێی لەگەڵ ئەیوبی برای قسەوباسیان گەرم بوو، ئەیوب دەیگوت: «دڵنیام لە دڵسۆزیتان، ئێوە برایەتیتان زۆر خۆشە،

ئەوەی ئێوە دەیکەن لای ئێمە بەڕێزەوە تەماشا دەکرێ، لای خوا ون نابێ.

ئەو چەند ڕۆژە گەر تۆمان نەبا کێ هێندە بە پەرۆشە بۆ دایکم و یاقووب! تۆ لە ئیش و کاری خۆت گرتۆتەوە کۆڵی سەر شانی ئێمەت سووک کردووە. »

دارا گوتی: «ئەرکی خۆمە، دەبێ زیاتریش ئاگام لە بنەماڵەی ئێوەبێ، گەر جار جارەش دەرۆمەوە ناچارم، هەندێک کار و پێداویستی دووکانەکەشمان دەبێ جێ بە جێ بکەم دووکانەکەشمان هاوڕێیەکی خۆمان بە ڕێوەی دەبا تا ئەو حاڵەتەی دایکت و یاقووب تێ دەپەڕێ، دڵنیابە ئێرە جێ ناهێڵم.»

یاقووب بینی دارا گەڕاوەتەوە دڵخۆش بوو، دارا بە باشتربوونی حاڵی یاقووب زۆر خۆشحاڵ بوو، ڕووی تێکردوو گوتی: «دەرمانەکانیشم هەمووی هێناوە بێخەمبە، دەزانی چەندە دڵخۆشم ڕەنگ و ڕووت خۆشترە، دەمێکە هاتووم، درەنگ هاتیەوە، لە کوێ بووی؟»

گوتی: «دایکی ئەو هاوڕێیەم حاڵی باش نییە چووم لێی بپرسم.»

بە ئاماژە حاڵی کرد گە دواتر قسە دەکەین، نەیدەویست ئەیوب بە مەسەلەی خۆی و مەلەک بزانێ، نەکاتەکەی گونجاو بوو نە ئەو بابەتەش بۆ ئەیوب گرنگ بوو. دارا چاوێکی دایە دایکی یاقووب، نزیکبۆوە لێی، گوتی: «دایە باشتری؟»

ئەو چەند ڕۆژبوو تەندروستی زۆر خراپ بوو، زەحمەت چاوەکانی دەکردنەوە، بەڵام بە بیستنی دەنگی دارا، سیلەی چاوی دایە کوڕەکان و توانی سەری بلەقێنێ، فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتنەخوار، ئەیوب چاوەکانی سڕین، بە دەنگێکی خەمناک، بێ ئومێدی ڕۆحی ئەیوبی تەنیبوو، بەڵام وەک ئیمانداریک، بڕوا بوون بە قەزاو قەدەر، خۆی لە ژێر ئەو خەمە گەوریە ڕاهێنابوو، گوتی: «دایە خۆم، ئەوە دارای برادەری یاقووب، لە ئێمە زیاتر بە پەرۆشە، ئەو چەند ڕۆژە جێی نەهێشتووین مەگەر ئیشی زەرووری بۆ هاتبێتەپێش.»

دایکی زمانی پڕپڕ بوو لە قسە، ئەو چەند بە خووڵق و خۆ بوو بەڵام جەخار دەربڕینێکی نییە، تەنها توانی بە ئاماژە سۆزی خۆی نیشان بدا. دارا زەرفێکی دا بە یاقووب، گوتی: «هاوڕێیان ئەوەیان بۆتۆ داناوە، گوتیان چووین سەردانیشمان کردووە بەڵام جارێ هەر ئەوەندەمان لە دەست دایە.»

ئەیوب ڕوانی یاقووب زەرفەکەی خستە گیرفانی و ئەو پەیوەندی و هاوڕێیەتی ئەوانی لاجوان بوو، هەر وابوو لە ناو خەڵکیش ببوو بە قسە، دەیانگوت: «ئەو پیرە زۆر بە پەرۆشی یەکترن. تەزوویەکی بە لەشی هەر یەکێکیان دابێت جێی ناهێڵن، گەورەو بچووک لەدەوری کۆ دەبنەوە، نانێکیان هەبێ لەتی دەکەن.»

ئاخر شەوانی نەخۆشخانە، شەوانی پڕ ئازار و دەردەسەرین، ئیدارەکردن و مانەوە لای نەخۆش ددان بە خۆداگرتنی دەوێ. دارا هەموو شەوەکان تا درەنگ، لای یاقووب دەمایەوە، ئازار

و ناڵەی نەخۆشەکانی ئاوێتەی ڕۆحی کردبوو. یاقووب ئەوەندەی بە بوونی دارا خۆشحاڵ بوو، هیچ شتێک هێندەی ئاسوودەی نەدەکرد. دەکەوتە ناو ئەو ساتە ناخۆشانەی لە نەخۆشخانە بینیونی، بە دیار ئازارەکانەوە لە ناخەوە دەگریا، شۆڕ ببۆوە ناو مردن، مردنی ئەو هەناسانەی شەو لە مردووەکان جێ دەمان، دەبزرکا دەیگوت: ئێرە بۆگەنی کردووە. بۆنی مردن خەریکە کاسم دەکا، ساتەکانی ئێرە بە ئازارن، دەنگی گریان و ڕۆڕۆ وەک ژەهر دەڕژێتە سەر ئومێدەکان، کەشێکی ناقۆڵا، وێرانبوونی خستۆتە ناو هەستەکانم ناتوانم بڕ بکەم، وێراناگەین ڕابکەین، نا ئومێدی خەڵک پێیەکانی زنجیر کردووین، کەمتر توانیومانە تروسکایی لێکبنێین، ئەوانەی لای نەخۆشەکانیان بوون، کاتێک نەخۆشەکە گیانی دەدا، دەستەکانیان لەگۆ دەکەوتن، هاوارو ناڵەی کەس و کاری نەخۆش، نەخۆشخانەیان دە زەواق نابوو، کارمەندەکان، لە سادەیی و بێ ئەزموونیان بێ دەستەڵات بوون هیچیان لە دەست نەدەهات، زۆر جار لەگەڵ کەس و کاری مردووەکان دەگریان، پاسەوانەکان بێ تاقەت و بێ حەواس هیچ دڵیان بە ئەرک و کارەکانیان خۆش نەبوو، ئەو بڕە پارەیەی لە بری پاسەوانی وەریان دەگرت بەشی ژیان و بەڕێوەبردنی ژیان نەبوو، نەفرەتیان لە حاڵی خۆیان دەکرد. هەموو شتێک خراپ دەڕوا. ئەوەی خوڵقاوە بۆژیان بەر ئەو دەوربەرەی ئێمە ناکەوێ.

ژینگەی نەخۆشخانە بە ژەهرێکی کوشندە داپۆشراوە و داگیرکراوە، لە نیشتیمانێکی نەخۆش دەچێ، لە درەختێکی

ڕووتاوەی بەر ڕەشەبای پایز و هەرەسێکی گەورە دەچن. تەوێڵی خەڵکەکە مۆری نا ئومێدی پێوە بوو، دڵم بەکام وێنە و تابلۆکان خۆشبێ، کاتێک نیگاکان پڕن لە دڕدۆنگی و تاریکی. ئەو چەند شەوە من و مردن لە جەنگی دەستەو یەخەدابووین، ئەو چیرۆکانەی مردن بۆ خۆم دەگێڕمەوە، لە دوا جار دەیانکەم بە کتێبێکی قەبارە بچووک، ئاخر ناتوانم گەورەیی ئازارەکان لە کتێبی گەورەدا بنووسم، کتێبەگەورەکان ئازادن و ئازاری ئێمەی تێدانییە، کتێبەکانی گیرفان، دەتوانین بیانپارێزین، کتێبە بچووکەکان یاری لەگەڵ ڕۆحمان دەکەن زۆر ئۆخژنیمان پێدەبەخشن.

ئەو چەند شەوە غرووریەتی ڕۆحی نەگریسی مرۆڤایەتیم بینی ئەوان بە برینی ئێمە پێدەکەنن، سووژنی ژەنگاوی دەخەنە چاوی گەلانی بەشمەینەت، بینیم مرۆڤایەتی غافڵ گیرە، ناچێتەوە سەر ڕەسەنایەتی و بەدوای سیستەمی پاوانخوازیوەیە. بینیم ئەهریمەنەکان وێرانبوون چوونەتە ناو هەموو مانیفستۆکانەوە، زامی نیشتیمانیان بۆگەن کردووە، دەنگی ناڵینەکان گوێی شەیتانەکانیان کەڕ نەکرد، ترس و شەکەتی و مردنیان کردۆتە دیاری، لەو ساتانەی هەناسەکانی دایکم توونـد دەبوون، دونیام لێوێک دەهات، دیقەتم لە ڕوانینی دایکمدا نقووم دەبوون، دایکم لە ژێر باڵە پەستۆی مردندا خەریکی گیانسپاردن بوو، بەدیار ( ملک الموت) وە گیری خواردووە، دەیەوێ بگاتەوە بە تراویلکەکان و ببێت بەو چیرۆکەی تا کۆتایی لە فرمێسکەکانمدا جاویدان دەبن. دەنگی مردنەکان، دەنگدانەوەیەکی ترسناکی دروستکردبوو هەر لە

ساڵەکانی تاعوون دەچوو، شەڕی ناو نەخۆشخانە شەڕی یەکلایکردنەوەبوو، دەستەو یەخەبوو، کەس نەبوو پڕینچکی ئازارەکانی مردنی پێنەکەوتبێ، مرن ئەو چەند شەوە، ژیانی لە زۆران ستاندەوە.

# بەشی بیست و پێنج

دەبوو ئەو ڕووداوانەی شەو لە بیربکەم، ناکرێ بێ ئومێدی واتلێبکا دەستان لە کراسی بێنیەدەر. زۆر گوێم لە کەسانی بەساڵاچوو بووە دەیانگوت: ژیان تاقیکردنەوەیە، ئەوانەی دەبن بەخاوەنی سروشت، هەیمەنەو دەستەڵاتیان بە سەر درووستکراوەکان ڕادەگا، خاوەن ئیرادە و سەرکەوتنە بەسەر کۆسپەکاندا، کلیلی ئاسوودەیی لە دەست ئەوانەدایە ناکەون. بیرم لە مەلەک دەکردەوە، بێ پشتیوان و بێکەس و تاق و تەنیا، بەرگەی ئەو نارەحەتییە دەگرێ، سەرەڕای زەحمەتیەکانی ژیان، هێشتا لە جوانیدا تاقانەیە، من بەرگە ناگرم پڕ بە چاوم تەماشای بکەم، گرێبەستێکی ئەخلاقیم لەگەڵ ریحان مۆر کردووە کە کەڵکەڵەی مەلەک و چی ژنی دونیایە لە بیر خۆم ببەمەوە، چونکە ریحان وەک خوێن بەدڵم ڕادەگا، نیگاو ڕوانینی تەختی هەستەکانمی لەرزاند، چیرۆکی دڵی خۆی لای من جێهێشتووە، حەرام زادە دەبم خیانەت بە هەستەکانی ریحان بکەم، ئەو بۆمن هەموو شتێکە، دەتوانێ ڕاستم بکاتەوە، لەو ساتەی ئێستامدا هەستێکی خۆڕاگری بڵندی پێبەخشیوم، ئەوەتا دەیەوێ لە ئاڵۆزیەکان دەرم بکا، بمخاتە سەر ڕێڕەوی عیشق و بمگەڕێنێتەوە سەر ئەو نامانەی بە ئاوی ڕۆح نووسیونی، لێ هەستی خرۆشاوم هەموو بیرکردنەوەی ڕاگرتووم بەلای ئارەزووەکانم دادەخا، مەلەک ئەو شەو تەنیایەو دەچم، وەختی بێدەنگبوون و خەوتنی

نەخۆشەکان و درەنگانی شەو، ئەو بوونەوەری ناو ڕوح ختۆکەم دەدا، ڕێگەکانم بۆ دەکاتەوە، ئەمشەو دارا و ئەیوب ڕۆیشتوونەتەوە، خۆت و دایکت ماونەتەوە دایکیشت حاڵی باشترە، حەبێکی خەوی بدەیە با ئەمشەو پشووبدات، با ئەو چەند شەوەی بە ئازارەوە بەسەری بردووە هەندێک بحەسێتەوە، دکتۆریش ئاگاداری کردووی دەتوانی ئەو حەبەی پێبدەی لە کاتی پێویستدا، هەموو شتێک باش هاتۆتەپێش، جارێکی تر ئاوا هەڵناکەوێتەوە، تەماشاکە چەند سەیرە! کە ڕێکەوت نەبێ چییە؟ لەو کات و ساتەی تۆ لێرەی، مەلەک و دایکی هاتوون، ڕێویت بە پیروەهاتووە، دەڵێن جارێک دەرگەی بە خێرت لێدەکاتەوە کە فریای نەکەوتی جارێکی تر ئەو چانسەت لەدەست دەچێت. دەمی دەڵێی نووقڵە، ماچێکی ئەمشەو زیندووت دەکاتەوە، دەی بچۆ دەمی بخە ناو مەمکەکانی، ناودەمێکی گەرم، مەلەک، هەمیشە بۆنبڕی لەناو جانتاکەیدایە، هەمووکات بۆنی بنێشتی سەهم لەناو دەمی دێ. ئەو ڕۆژەش کە هەناسەی نزیک دەکردەوە دەمویست گازێک لە دەستەکانی بگرم، ئارەزووم بوو سەرم بخەمە ناو مەمکەکانی، بە زمان سەر گۆی مەمکەکانی بلێسمەوە، توووند بیانمژم، بەسەرخۆمی دابەر بدەمەوە، بە ئەسپایی کراسە کوڕانیەکەی لەبەر داکەنم، دەستم بخەمە ناو پانتۆڵکەیەوە ئەو ناوە تەڕ تەڕ بکەم. خەیاڵم چاک کۆکردبۆوە، خۆم خستبوە ناو باوەشی و بەزمانم لێوەکانیم دەلستەوە، دەستێکم خستبوە ناو مەمکی و گۆیەکانیم دەمژی، کەس بەخەبەر نەبوو کراسەکەم لێداکەند و لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵم خست، چاوێکی لای قەرەوێڵەکەی دایکی بوو، دایکی هەناسەدانی زۆر ئاسایی

بوو ئەو بە ڕۆحی خۆی ئەو ژوانەی بۆ من و مەلەک ڕێکخستبوو، زۆر بە ئارەزووەوە ناو دەمی لەگەڵ دەکردم، توووند بە خۆیەوە دەیگوشیم، دەستی خستە ناو گەڵم بەهێزێکی زۆرەوە دەیگوشی و خۆی ڕووت ڕووت کردەوە، پا سەوانەکان خەوتوون، قایشی پشتێندەکەمی کردەوە زنجیرەکەی ترازاند، دەستی ڕاکێشام و ڕاچڵەکیم و بە هۆش خۆم هاتمەوە. گوتم خەریکبوو بەڵێنەکەم بشکێنم، گوتم نا، دەبێ ئەو حەزە بکوژم، ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی هاتوونەتە پێش، پیسی و بیرکردنەوەی خراپی منن.

کەسایەتیە نەوسنەکەی ناو ناخم، زیاتر پاڵی دەنام، خراپ کەوتبوومە ناو زەلکاو، دەمویست دەربچم و بیر لەکارێک نەکەمەوە لە کەسایەتیم بدا، بابم هەمیشە لەغەیبەوە پێم دەڵێ: کوڕی من نی، گەر ناپاکی بکەی، دەبێ ڕیگەی ڕاستەقینەی ژیان هەڵبژێری، مرۆڤ ئەو کاتە بەکەڵکە بۆ نیشتیمان و مرۆڤایەتی، کە هەستە خراپەکانی ناخی بکوژێ، خۆی خاوێن نەکاتەوە ناتوانێ کار بۆ خاوێنی بکا. خەریک بوو پەیامە غەیبەکانی بابم فەرامۆش دەکەم و بە دوای ئارەزووەکانم دەکەوم، ئا، چاوە ئەفسوونەکانی مەلەک ڕایکێشاوم و دەیان شانامە بۆ سرووتەکانی نیگای دەهۆنمەوە، ژیان ئەو فرسەتەی پێ بەخشیوم نابێ لە دەست خۆمی بدەم، مەلەک بەڵێنی پێ داوم کەسایەتی و ژیانی ئەو پیاوەم بۆ باس بکا، ئەو ڕۆژە گوتی: (دەتوانی سەرگوزەشتەی ئەو پیاوە لە من وەر بگری.)

ئەمشەو فرسەت هاتۆتەپێش ئاخر جارێکی تر کوا کات و ساتێکی وا دروست دەبێتەوە ئەو گرێیەی دڵیشم دەکرێتەوە ئاخر ناسینی ئەو پیاوە بۆم بووە بە مەسەلە، ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ بیرکردنەوەم بەردەوام دەبێ، خەریکە لە پێستی خۆم دێمە دەر، زۆر پێچەوانەی خۆم بیردەکەمەوە، واخەریکم ناتوانم بەسەر ئارەزووەکانمدا زاڵ بم، لە لایەکی دیکەوە دێم دەمەوێ بە کارێکی مرۆیی خەریک بم، ئەوەتا هەستێکی دیکەی ناخم پێم دەڵێ: ( ئەو پیاوە بدۆزە، ڕاستە ژنە نەخۆشەکەی مردووە بەڵام ئەوەندە کەسایەتییەکی جوانی هەبوو دەکرێ سوودی لێببینم.)

ئەو (پاردۆکسە) دژ بەیەکە خەریکە وێرانم دەکا، ئێستا چەند کەسایەتییەک لە من دا تەراتێن دەکەن، زەحمەت دەتوانم دەربازبم. نەرم نەرم دەستم دەخەمە ناو پرچەکانی مەلەک وەک شانەیەکی شاش، پرچەکانی بۆ دادێنم و هەردووک دەستم دەخەمە سەر ڕوومەتەکانی، بەرامبەری دەوەستم و چاوم دەبڕمە چاوەکانی، تا دەبم بەو گریانەی کە دڵدانەوەی شکان و نا ئومێدییەکان دەداتەوە، گردبوونەوەی دڵۆپە فرمێسکەکانی مەلەک بۆ دایکی، تابلۆیەکی هونەری بەرزی خوڵقاندبوو، هونەری و کارامەیی (ریحان) بە خوڵقانی فرمێسکەکانییەوە دیاربوو، سەیر شتەکانم باش لێ تێکەڵ بوون. زۆر جار هەموویان لە هۆڵی نەخۆشخانە دەبینم، ئەوەتا خاڵم بە شەدەیەکی ڕەش ڕەش، لە سەر کورسیە شکاوەکەی نەخۆشخانە دانیشتووە چاوەڕێی هەواڵێک دەکات، بابم بەسەر سەری داکمەوە وەستاوە، بە پیشتێندەکەی لێک. لێک،

فرمێسکەکانی دایکم دەسڕێت، ئەیوب لەو سەری ڕێڕەوەکەی هۆڵەکە کڵاوە سپیەکەی دەدرەوشایەوە، دەستەکانی بەرز کردبوونەوە بۆ خودا. ریحان و دایکی، بەهمەنی برای و حەمەڕیحان چاوەڕوانی ئێمە دەکەن. دارای هاوڕێم بە کۆمەڵێک پێداویستی نەخۆشخانەوە لە پەنا دەرمانخانەکە وەستاوە، ئاگای لە هەموو کات و ساتەکانی منەو چرکە بە چرکە خەریکی نووسینەوەی چیرۆکەکانی ئێمەیە. قەهاری چەرموو، هێشتا پووش و پەڵاشی ئەو شەوەی تێیدا مرد، بە برۆ گەوەرەکانیەوە تابلۆی ڕۆح دەرچوونی هێناوە، بە خاوو خێزانەوە هاتوون و دەیانەوێ لەگەڵ دایکم و بابم باسی ڕۆژانی ڕابردوو بکەن، ئامۆژنم بەهەردووک دەستی چاوەکانی خۆی داپۆشیوە نایەوێ بە هیچ شێوەیەک دایکم ببینێ. ئەو پیاوەی ژنەکەی نەخۆشی شێرپێنجەی هەبوو بە دەستێک پاڵی بە عارەبانەکەی ژنەکەیەوە دەنا، بە دەستە کەی دیکەشی دەرمانەکانی هەڵگرتبوون، هەر زوو پیاوەکەم ناسیەوە زوو زوو پەرچەمی سەرچاوی هاوسەرەکەی لادەدا، بەهەستێکی ئاگرینەوە ڕۆی تێکەڵی ئازارەکانی ببوو، پەنجەکۆڵەی نیشانەیەکی دیار بوو بۆ ناسینەوەی.

گوێم لە دەنگێکی نووساو بوو، تۆنی دەنگیم وەک ئاو و دۆ لەبەربوو، لە بستێک منداڵیەوە ئەو دەنگەم لێدانەبڕاوە لەگەڵم گەورە بووە، لە گەمەی منداڵی و لە خەونەکانم و لە باوەشەکانم و لە بانگ کردنەوەم، گوێم لەناوی خۆم دەبوو بەو دەنگە باڵم دەگرت، گوتی: (یاقووب وەرە ڕاستم بکەوە تا قسەیەکت بۆ بکەم، گوێ لە دایکی خۆت بگرە.)

خەنی بووم، دایکم چەند ڕۆژە دەنگی دەر نەهاتووە، بە پرتاو ئاوڕم لە دایکم دایەوە بینیم چاوەکانی داخستن و پشتێندەکەی بابم جێ مابوو لاسکی پشتێندەکە تەڕ تەڕ ببوو، دایکیشم توووند، توووند، پشتێندەکەی گرتبوو. دەستم خستە سەر ڕوومەتەکانی سارد، سارد، بوون، تەنیا مابوومەوە کەس لەدەوەرم نەمابوو کەوتمە ناو شەڕێکی دەستەو یەخە لەگەڵ خۆم، دایکم (خەجەی حاجی ئەسکەندەر) چیدی چاوەکانی هەڵ نەهێنانەوە.

سیکە سیکی کورسیەکە، مەلا عوسمانی پەست کردبوو، چەند جار خۆی دەجووڵاند، هەستێکی ناخۆشی لای هەموان دروست دەکرد، ئەوانەی ناو هۆڵەک گورگە ئاوڕێکیان دەدایەوە، نەفرەت لە چاوی دایکم دەڕژا، ئاخر نەخۆشخانەیەکی گەورەو گران، تا ئێستا کەرەستە کۆنەکانی پێش ڕاپەڕینن، تیاح دەنگێکی ئیزعاج و ناخۆشی جاڕسی هەیە، مەلا عوسمان هاتبوو دەستی دایکم بگرێت و چیدی بە ئازاری نەخۆشیەوە نەناڵێنێ، دەیان جار بەیەکەوە قسەیان دەکرد، دەیانگوت: (هیچمان بێ یەکترنەژین) دایکم لە سەر نوێژەکانی دەپاڕایەوە: (مەرگم ڕەپێش مەرگت بکەوێ.)

قەهاری چەرموو خێزانەکەیان عەیامێک بوو سۆراغی نەبوو، چووبۆە بۆ ناو قەوم و قیلەی، خەریکی خڕکردنەوەی ئەو یادو یادگاریانەی باب و باپیرانی بوو ئاخر برین و خوێنی وەچەی (حاجی حیسامەدینی چەرموو) و خێزانەکەیان، دەر بەدەر بوونیان و مێژووەکەی دەبێ بچێتە ناو ئەو کتێبەی

شانازیەکانی تێدا دەنووسرێتەوە، ڕاونان و ئەو غەدرەی لە چەرموویەکان کرا لە حەسەن و حوسێن نەکراوە.

هێشتا لاقی شوێنی ئەو حەبلەی پێوەیە کە لە شەوێکی ئەنگوستەچاو، ساردو سەرما، بە دەستێکی نادیار لە دۆڵێکی چۆڵ و هۆڵ پێی بەسترابوو، لەژێر تەعزیب و ئەشکەنجەدانی، گیانی سپاردبوو، خۆی بە دەستە سرپبووەکانی پووش و پەڵاشی لەخۆی دەتەکاند، جار ناجارێک مەچکەکانی دەگووشی، ڕووی لە ئاسمان دەکردوو دەیگوت: (خودایە سەد جار شوکر، چی تۆ بەسەرم بهێنی ئەویان جوانە، لە دوا جار هەموومان دێنە بەر قاپیەکەی تۆ، گەر تۆ حەقی ئێمە بستێنی.)

ئەیووب، تاو نا تاوێک کتێبەکەی دەکردەوە لە بەر خۆیەوە پرتە پرتێکی دەکرد و فووێکی بە دەو روو بەری خۆیدا دەکرد، بە بێدەنگی قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد، پشتێندەکەی شل دەبوو لۆیەکی دەکەوتە سەر کاشیەکانی هۆڵی نەخۆشخانەکە، لۆی پشتێندەکەی بەرز دەکردەوە دەیتەکاند، دەیگوت: (زۆر زەحمەتە ئەو کاشیانە خاوێن بن، دڵنیام پشتێندەکەم لە نوێژ چوو بوو، پەنا بە خوا لە کاتی تەنگانە و ناڕەحەتیەکاندا دەبێ خۆ ڕاگر بین، بۆ مەرگی دایکمان چۆن بتوانین بەسەر خۆماندا زاڵ بین، ئەو ناخۆشیانەی لە ڕێی خوداوە دێن دیاری بە نرخن، ئەیوب ماخوولانی بوو، هەدادانی نەبوو، دەهات و دەچوو، چاوی دەبڕیە هەموان حەزی لەوە بوو چی لە ناخی داهەیە لە بەردەم هەموان دەری ببڕێ، پەیامی کۆکراوەی ناخی بە ئامادەبوان بڵێ، ئەیووب ئەو ڕۆژەی بەلاوە جوان بوو، تەماشای دەکرد هەموویان ئامادەن، هەرچەند مەرگی

دایک جەرگ دەڕزێنێ بەڵام ئەو وای هەست دەکرد ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەیە، دەیگوت: ( سوبحانەڵلا بابم و خاڵم و دایکم و مامم و ئامۆزاکان و کەس و کارو دۆستەکانی بابم و دکتۆری بە غەدر کوژراو، زۆربەی هاوڕێکانم، چ کەشێکی قیامەتی دروست کردووە، هەموومان لە چاوەڕوانییەکی سەیر داین.)

خەمە گەورەکەی یاقووب، بۆ ئەو پیاوەی هات بۆ دووکانەکەی و یارمەتییەکەی لێوەرنەگرت، ئەوەتا خۆی و ژنە نەخۆشەکەی لە هۆڵی نەخۆشخانەکەیە، باس لە ژیانی خۆی و ئازەرەکانی بۆ مەلەک دەگێڕێتەوە، مەلەک دەفتەرێک و قەڵەمێکی پێیە گفتوو گۆیەکە دەنووسێتەوە، مەلەک لێک لێک سەری بۆ نەوی دەکات، گوێ بۆ ئازارەکانی ڕا دەگرێ، پیاوەکە ئاماژە بۆ پەنجە کۆڵەکەی دەکا و دەمێکی چاک ئەو گفتوو گۆیە بەردەوام دەبێ، گوێم لێ بوو پیاوەکە دەیگوت: ( دەگێڕنەوە ئێمە بنەماڵەیەکی جوولەکە بووین، تێکەڵاویمان هەبوو لەگەڵ خێزانی چەرمووەکان، باپیرە گەوەرەی ئێمە وەک دۆستێکی گیانی بە گیانی هۆگری ئەو بنەماڵەیە بوون، لە لایەن بەشێک لە کەسانی دەروون نەخۆش، سووکایەتیان بە باپیرە گەورەی ئێمەوە کردووە، گوایە ئێمەی جوولەکە چۆن دەبێ وابەستەی ڕێباز و ئەو ڕێڕەوە کۆمەڵایەتیە بین، خێزانی چەرموو، بێ جیاوازی، بێ هیچ بنەمایەکی دینی و ئایدیۆلۆژی و تائیفی خەڵکی ناوچەکەی خستبۆوە ژێر سێبەری دەستەڵاتی خۆی، دوای قەڵاچۆکردنی ئەو خێزانە گەورەیە، هەوڵی سڕینەوەی ئێمەش درا، لە گێڕانەوەی دەماو

دەم، ئەو ئازارەی خۆمانم خوێندۆتەوە، بۆیە لای خۆم بڕیارم دا، بە دوای ئەو مێژووە بکەوم دەمویست چی نەهێنی و دیوی شاراوەی ئەو ڕووداوە هەیە بیزانم، ئەو پەیوەندیە قووڵەی باپیرانم و خێزانی چەرموو بدۆزمەوە، بەدوای گومانەکان کەوتم، پرسیاری زۆرم دەکرد، کەمترین وەڵامی درووستم دەست دەکەوت، بەردەوام دەچووم بۆ کتێبخانەکان، بەدوای سەرچاوەدادەگەڕام، نەم دەوێرا بە ئاشکرا داوای سەرچاوەی مێژووی ئێمەو ئەو خێزانە بکەم.

ئێوارەیەکی درەنگ، چەند کەسێکی دەمامک دراو لە یەکێک لە شەقامەکانی کەرکوک، هاتنە پێشم و بەربینگیان پێ گرتم، چواردەوریان تەنیم، یەکێکیان هاتە پێشم و بەرۆکی گرتم، دوانی دیکە پەلاماریان دام و هەردووک دەستیان گرتم، بە پەڕۆیەکی ڕەش دەم و چاویان بەستم خەریک بوو هەردووک چاوم دەرپەڕن، بە شەق و زللە و مست پاڵیان نام بۆ کۆڵانێک، خستمیانە ناو ئۆتۆمبیلێک، ئازای بەندەنیان ڕەش و شین کردم، چەقۆیەکی زامدارم لە گیرفان دابوو دۆزیانەوە، بەگاڵتەو توانجەوە یەکێکیان کە سەردەستەیان بوو گوتی: «ها جەنابت چەقووکێشیشی وایە بۆ چەقۆیەکەت بەکار ناهێنی؟»

گوتم: «چەقووکێش نیم ئێوە چیتان لەمن دەوێ؟»

گوتی: «پێت دەڵێین چیدی خۆت بەو بابەتە سەرگەرم مەکە ئێمە دەمێکە چاودێرین بەسەرتەوە، ئاگامان لە هەموو جموجۆڵ و کارەکانتە، بۆ ئەوەی خۆشت و ئەوانەی وەک تۆش بیردەکەنەوە وانەیەکت فێردەکەین تا بۆ ئەبەد لە بیری نەکەن.»

بەسێ چوارکەس ئامبازم بوون، سواری سەرم بوون، دەست و پییان توونید بەستم، پەڕۆیەکیان خستە ناو دەمم، گوتیان: «بۆیە ناتکوژین تا تۆ ببی بە عیبرەت، بەو چەقۆیەی خۆت پەنجەی گەورت لێ دەکەینەوە بۆ هەتا هەتایە جوولەکە بوونت لەبیر بچێتەوە.»

دوای چەند ڕۆژ منیان بە چاو بەستراوی لای مزگەوتێک فڕێدا بوو، خێزانەکەم دەستی لە ژیانی من شووشتبوو، چەند مانگ چارەسەریم وەرگرت تا توانیم بێمەوە سەرخۆم، خێزانەکەمان پەرش و بڵاوە، هەر یەکەمان کەوتووینەتە قووژبنێکی ئەو دونیایە، شەجەرە و ژیانی ئێمەی جوولەکە خوێناویە مێژوو ناتوانێ بینووسێتەوە.)

بابم بۆی باس دەکردین تێکەڵاوی و ژن و ژنخوازیمان لەگەڵ چەرموویەکان زۆر بوو، ئێمە کوردستان بە نیشتیمانی خۆمان دەزانین، ئێمە خوێنمان تێکەڵی یەکتری بووە.

ڕیحان و دایکی و حەمە ڕیحانی باوکی و بەهمەنی کوڕیان، بە ئینجانەیەک گوڵی سوور، بە ڕەشە ڕیحانە هەر چوار دەوری ئینجانەکەیان پێ ڕازاندبۆوە، بۆنێکی خۆش هۆڵی نەخۆشخانەکەی پڕکردبوو، بۆن دەڕژا بەسەر ڕوومەتەکانی دایکمدا، جلکەکانی لە بخووری بەهەشت هەڵکێشرابوون، سەر قەرە وێڵەکەی ڕەونەقی دەدا، دەستی حەمە ڕیحان بەسەر شانی بابمدا سڵاوی خۆشەویستی دەنارد، پەیامی سووری بە گوێی ئامادەبواندا دەچرپاند، بەلەک و قۆڵەکاتی نیشانی خەڵکەکە دەدا، دەیگوت: (جگە لە زنجیرەکانی دەستمان هیچ شتێک لە دەست نادەین بەڵام جیهانێک بە دەست دێنین.)

ئەو وتەیە دەیان جار لە بۆنەی کرێکاری بەرەنگاربوونەوە گوێم لێی بووە، درەوشانەوەی مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیستە، بە دەسماڵە شینەکەی ڕوومەتەکانی بابی دەسڕی، ماندوو بوونی دەحەساندەوە، وەک پشتیوانییەکی بەهێز لەگەڵ بابی درووشمەکاتی دەگوتەوە، لە تابلۆیەکی ڕەنگیندا وێنەی ئاپۆراکەی کێشابوو، لە سووچێکی تابلۆکەدا دوو دەستی بڵیندی کێشا بوو ئەو شعر و باوەشانەی لە ژوانەکانمان جێمابوون خەنی بوونی ئەویندارێیان بەسەر تابلۆکەدا دەڕژا.

دکتۆر بە پرتاو ڕەت بوو، ئەو گلەییەکانی لەسە کورسیە شکاوەکەی نەخۆشخانە دانا، سینگی پڕ لە قسە بوو، لە دایکم نزیک بۆوە چەمیەوە دەستەکانی ماچ کردن و چاوی بە پشتێندەکەی بابم کەوت و پارچەیەکی لێ دادڕی و خستیە گیرفانی و غەیب بوو، لەشەقەی باڵی دا ڕۆیشت.

تەمێکی تاریک و تۆقێنەر ژوورەکەی داپۆشیبوو، ئەو هەموو گریان و هەناسە بڕکێی دایکم کەوتنی تا هەتاهەتایی تراویلکەیەکی دایە ئومێدەکانم، لە پڕ دەنگی گریانێکی حەزین و مات هاتە بەرگوێم، لەرزیم، چاوەکانم تیژ بڕیبوونە دایکم، سەدان چیرۆکی دەردەسەری و ماندووبوون و سووتان و تلانەوەی ڕۆحی دایکم لە ژوور سەریدا دەخۆلانەوە. جارێکیان خاڵم بۆی گێڕامەوە، دایکم چەند خۆڕاگرو بە پەرۆشی ئێمەوەبووە، دەیگوت: (پێمگوتووە خوشکێ حەز دەکەم مێردی بکەیتەوە، تۆ لەوەتی هەی هەر بێ مێرد بوویت، ئاخر خۆ قەت خۆشیت نەبینیوە، بڕوات بێ لێت وەرەس نیم، هەمیشە لە سەر سەری خۆمت دادەنێم، ئاگاشم لێتان دەبێ،

بەڵام شۆفارو پیاو خراپ و  تۆش بەو جوانی و جحێڵیەوە دابنیشی و چاوی غەددار و تەماعکار تیژە.) دایکم لە وڵامیدا: (کاکی خۆم، دوای سەمەد، هەموو خەڵک باب و برای منن.)

گوتم: من رازیم، هیچ پێشم شەرم و نەنگی نییە، تۆ ماڵ و مێردێکی دی بۆخۆت درووست بکەیتەوە، منداڵەکانیش جیاوازیان پێناکەم لەگەڵ منداڵەکانی خۆم، دەستیان بەسەریدا دێنم، دەیان پارێزم بەڵێنت پێدەدەم، دەور و بەرمان کەسی خراپی تێدایە، خەڵک لە هیچ شتێک ناپرینگێتەوە، گەر ئەوەشم بە قسە ناکەی، دەبێ شتێکیدیکەم بە قسە بکەی، جووتە پێڵاوێکی کۆنی سەمەدی لە بەر دەرگەکە دابنێ، نەبادا کەسی خراپ و بێ حەیا چاوت تێببرن و زەفەرت پێببەن، وەختێک دەزانن پێڵاوی پیاو لە ماڵەکە دا هەیە تەقیە دەکەن و دەسڵەمێنەوە و ناوێرن تخوونت بکەون. تەرمی دایکم، هەزاران چیرۆکی جێهێشتووە، چەندان چیرۆک خۆیان لە گەرووم هەڵداویشت، سەرە تاتکێیان لەگەڵ دەکردم.

دەمگوت: رۆژێک دەبێ بیان نووسمەوە بییانکەم بە رۆمان. نەمدەزانی چۆن ئەو چیرۆکانە بخەمە سەریەک و دڵی خۆمیان پێبدەمەوە. دایکم لەبەر چاوم وەک رووخانی کێوێک، زەمین لەرزە ئاسا، تەختی هەستەکانمی هەژاند.

بۆ هەتاهەتایە لە یادم ناچێتەوە، جارێکیان دڵی دایکم شکاند، تازە دەگەیشتمێ، مووم لە سمێڵان نەهاتبوون، گەرمە تەریقەت بووم، زۆر هۆگری رادیۆی پێشمەرگەکان بووم، هەرچۆنێک بێ برەک پارەم کۆکردەوە رادیۆیەکی بچووکی تووشیبام کڕی، زۆرم خۆش دەویست، شەوانە لە سەر

سینگی خۆم دادەنا تا خەوم لێدەکەوت، دەچووم بۆ بازاڕ لە سەر پەنجەرەکە جێمهێشتبوو، نیوەڕۆ درەنگ گەڕامەوە، گەیشتمەوە، دایکم ڕۆحی پێ نەمابوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بە پیرمەوە هات، گوتی: (چم لێدەکەی، خۆ ڕادیۆیەکەم لە دەست کەوتە خوارەوە شکا، دەمویست بۆت بسڕمەوە.) منیش زۆر جرپن و لە خۆڕازیبووم، نەڕاندم و گوتم: (بۆچی دەستکاری شتی من دەکەی؟ نازانی ئەو ڕادیۆیەم چەند خۆش دەوێ، هەمووتان لە لایەک و ڕادیۆیەکە لەلایەک.)

دایکم لە حەژمەتان نەیتوانی بە پێوە بوەستێ، ڕۆنیشت و دەستەکانی دەلەرزین و لێک لێک، بسکە سپییەکانی لەسەر دەم و چاوی لادەدا، بە ئەنگووچکی کراسە ڕەشەکەی فرمێسکەکانی دەسڕین. هیچم بە چاوان نەدی، پڕ بەگەرووم گریانم هات، ویستم بڵێندی بکەم هەڵیبستێنمەوە، دایکم نەجووڵا حەپەسا! خۆم بەسەر نەعلەدڕاوەکانی دادا، دایکم وەک کابووسێک گرتبی زەق ڕامابوو، ڕامکردە ژوورەوە جامە ئاوێکم هێنا، هەرچۆنێک بێ ئاوەکەی خواردەوە، گوتم: (دایە بەری پێیەکانت دەلێسمەوە لێمببوورە، گوتی: (ڕۆڵە لە داری دەدونیایە هەر ئێوە و تاقە برایەکەم شک دەبەم، هیچم لەبەر دڵ نییە، جووتێک گوارەی یادگاری سەمەدی ماومن لە هەموو تەنگانەیەک پاراستوومن دەیانفرۆشم بیاندە بە ڕادیۆیەک لە هی خۆت باشتر، تۆ دڵتەنگ مەبە.)

خەیاڵم لای مەرگی دایکم و سەرگوزشتەکانی بوو، گریانەکە نزیکتر دەبۆوە، ئاوڕم دایەوە مەلەک بوو، گوتی: «دایکم تۆ

خۆش، هاتووم هاوکاریم بکەی، بەڵکو کارێک بکەین بیبەمەوە ماڵەوە.»

منی بەو حاڵەوە بینی واقی وڕما، فرمێسک بە کۆ دەهاتنەخوار، قوڕگێکی نووساو، لاشەیەکی ساردوو سڕ، تووشی حاڵەتێکی سەیربوو، تەواو بێئومێدی ڕووی لە هەردووکمان کرد، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، کەوتمە ناو دووڕیانێکی ئاڵۆزەوە. یادگەی منداڵی لێک لێک، دەهاتنەوە ناو زەینم و مێشکم بە هەژان دەکەوت، گوێم لە گریانی خۆم بوو، ئەو هەموو نازەی لەسەر دایکم دەمکرد بێ مانا بوو، دەم و چەمم نەبوو بۆ باوەشی دایکم، بە سەد تکاو ڕەجا لێی جیا نەدەبوومەوە، لەسەر کورسی مەکتەب لە تەنیشت من دادەنیشت توند ئەنگووچکەکانم دەگرتن و نەمدەهێشت بستێک لە من دووربکەوێتەوە، بەڕێوبەری قوتابخانەکە ڕێزی دایکمی دەویست و هاوکاری دەکردین، لەناو پۆل داوام لە دایکم دەکرد بچمە باوەشی، دایکم دەیخافڵاندم، تا وایلێهات دایکم تکای لە بەڕێوبەری قوتابخانەکەکرد، لەکاتی پشووی وانەکان یارمەتیم بدەن بچمەوە لای دایکم بۆنی سینگ و ڕیحانە و مێخەکی بەرۆکی بکەم، ئەودیوی حەوشەی قوتابخانە ماڵی ئێمە بوو، زۆر جار بێ ئیزنی مامۆستا بەسەر حەوشەدا خۆم هەڵدەدا و تێر ماچم دەکرد و دەمویست وەک ساوایەک مەمکی دایکم بمژم و بەسەرحەوشەدا دایکم سەری دەخستمەوە دەهاتمەوە ناو حەوشەکە، حەوشەی قوتابخانەکە هێندە بڵیند نەبوو کۆسپەیەکیشی هەبوو دەتگوت بۆمن دروست کراوە، هەموو جارێ کە دایکم سەرگوزشتەی منی

دەگێڕایەوە ئارەرەزووم دەکرد بچمەوە ناو باوەشی و مەمکە چرچەکانی ماچ بکەم و تێرتێر بۆنی بسکەکانی بکەم وهەزار جاریدیکەش بەسەر حەوشەی قوتابخانەکەدا خۆم هەڵبدەم.

ئۆکسجینەکەیان لەسەر لابردوو چاوەکانی لە سەر یەک دانابوون، وەک ئەوەی لە گڕ خەونەکانی ڕاچووبێ، وامهەست نەدەکرد ماڵاویی یەکجاریم لێدەکا، گەلێک جار لە ماڵەوەش دایکم دەخەوت، دەچووم تەماشام دەکرد ئاخۆ ماوە، دەمێکی باش  بە دیاریەوە ڕادەوەستام تووشی دڵەکوتە دەبووم، تا چاوم لە هەناسەدانی نەبووبا دڵم ئاسوودە نەدەبوو، دایکم پرخە و دەنگی هەناسەی نەبوو زۆرجار دەخەوتیش چاوەکانی کراوە بوون، کەروێشکە خەوانە دەنووست. دەنگی پێی ئەیوب و هەست و بەژوور کەوتنی، ئومێدەکان کەوتنە ژێر هەڵوەرینی هەناسەکانی دایکم، بە مەرگی دایکم دونیا جۆرێکیدی بۆ ئێمە دێتەپێش، یادگاری سەمەدی چەرموو، خەجەی ئەسکەندەرو من و ئەیوب وچەند کەل و پەلێکی توحفە، لەگەڵ روانینێکی تیشک هاوێژ و پشتێندێک، پارچەیەکی ئەو پشتێندە لەگەڵ کفنەکەی دایکم دەبێ و پارچەیەکی دیکەی لە نەوچەوانی ژنانی ڕۆژهەڵات بەستراوە، زۆر جار سەرچۆپیەکەی ڕەشبەڵەکی پێ گەرم دەبێ و دواجار وەک و بەیداخی سەرکەوتن بڵێند دەبێ سرودو پەیامی برسییەکان بەردەوام بوون بە کۆرس دەڵێینەوە!

(کۆتایی)

2023/5/29

ئـەو ژیانـەی بـۆی دەگەڕێـم، لەنـاو دێڕەکانـی شـیعردا، لەنـاو ڕەنـگ و سیمای درەخـت و هەڵکۆڵینـی بەردەکانـدا، لـە دڵێکی شکاو، لـە ڕیگەیەکـی ونبوودا، دەمـەوێ چارەڕەشـی ئـەو ڕەنگانە بنووسـمەوە لـە بیابانـی دڵێکـی تینـوودا خەریکی مردنن.»

بەرگ : ئیبراهیم سالح